# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی



جزمی: ﴿ ٤ ، ٥ ﴾

بەرگی چوارەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی چوارەم و جزمی پێنجەم .
بەرگی چوارەم .
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیوتەرو ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**سوپاس بۆ پەروەردەکەری هەموو بونەوەران**

**درودی خوا لەسەر پێغەمەرو هاوڕێکانی و هەموو پەیڕەوانی.**

گرنگترین شتێ پێویستبێ لەسەر کاربەدەستان و پێشەوایانی کارامە و ئازاو دڵسۆز ئەمەیە ، هەموو کارێکی چاك بۆ سەربازەکانیان جێبەجێ بکەن و بەردەوامین لەسەر بەهێز کردنیان و بتەو کردنی سەبازەکانیان زۆر بەرێزەوە، هەوڵ بدەن ترس و بێ هورەیی لەوان دوور بخەنەوە ، چونکە سەرکەوتن بە تەنها بریتی نیە لە هێزو توانای چەك ، بەر لە هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە بۆلای خۆگرتن و ڕاوەستان و کارامەیی هێزی ویستی سەربازەکان ، ئەگەر کارامە نەبن ناتوانن ئەو چەکانە بخەنە کار. بێگومان دوژمنان ئەوەندە لە هورەو نیازی سەربازان ئەترسن بۆبەرگری لە خۆیان و نیشتمان بیروباوەڕیان ، بەو ئەندازەیە لە چەکی زۆر قورس ناترسن ، چەك و ئامێز سوودو بەخش نین ئەگەر بە نیازی پاکەوە نەخرێنە گەڕ بۆ بەرگری لە نیازی خراپی دوژمنان.

ئەوەتە بە چاوی سەر ئەبینرێ و بە گوێ ئەبیسترێ و ڕۆژنامە و ئێزگەی خوێن مژان و داگیرکەران چۆن و بە چ جۆرێ پڕو پاگەندە بڵاو ئەکەنەوە بۆ سوودی خۆیان ، بەچ فڕوفێڵێ ئەیان خەنە کار بۆ بەرگری لەبەکرێ گیراوەکانیان ، چۆن جەنگی دەروونی لەگەڵ دانیشتوان بەکار دێنن بۆ نەهێشتنی نیاز و مەبەستی بەرزی دانیشتوان و دوودڵی و گومان ئەخەنە دەرونیانەوە لەدژی بەرگری نیازی ڕەوا و بەرزی دانیشتوان بۆ سوودی

خراپی خۆیان ئەیان خەنە کار . کەواتە کارکردنی بۆ سەردەروون گەورەترین شتە بۆ داگیر کردنی گەلان ، خوا ئەفەرموێ :

وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ ۚ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾

﴿ ولاتهنوا ولا تحزنوا ﴾ وەئێوە لاواز و بێهێز مەبن و مەترسن بۆ جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنانی خۆتان بەبۆنەی هەندێ شتەوە پێتان گەیشتووە لەبرینداری و ئازار و ، خەفەتبار مەبن بۆ کوژراوەکانتان و برینداری و دەست نەکەوتنی تالاّن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن باوەڕدارن .

ئەو ئایەتانە هاتوونەتە خوارەوە بۆ هاندانی باوەڕداران و سەرخۆشی کردن لەوان کەلەڕۆژی ئوحودا کوژراو و برینداری زۆریان هەبوو ، لەکۆچ کەران پێنج کەس لەنێوان ئەواندا حەمزەی مامی پێغەمەر ، لەیاریدەدەران (٧٠) کەس کوژران .

کاتێ موسوڵمانان تووشی شکستبوون خالیدی کوڕی وەلید ویستی سەری شاخەکانیان لێ بگرێ ، لەو کاتەدا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەنازەوە پاڕایەوە لەخوا و ووتی : خوایە بێ باوەڕان سەرنەخەی ، خوایە خۆت ئاگاداری ئەگەر ئەم باوەڕدارانە بکوژرێن لەم شارەدا جگەی

ئەوان کەسی تر تۆ ناپەرستێ . کوتوپڕ هەندێ لەو تیر هاوێژانە مابوونەوە گەڕانەوە بۆ سەر لوتکەی کێوەکان بێ باوەڕەکانیان شکاند ، بۆیە خوای مەزن فەرمووی :

﴿ وأنتم الأعلون إن كنتم مؤمنين ﴾ وەهەر ئێوە سەرکەوتوون و بالآدەست تر ئەبن ، پاشەڕۆژی سەرکەوتن بۆ ئێوە لەم ڕۆژەدا ، جێگەی ئێوە بەهەشتە لەپاشەڕۆژدا ، بێ باوەڕان ئەشکێنن جێگەیان قوولایی دۆزەخ ئەبێ ئەگەر ئێوە باوەڕدار بن ، بەهۆی ئەوەوە خوا فەرمووی : بەڕاستی سەربازەکانی ئێمە زاڵ ئەبن بەسەر بێ باوەڕاندا .

ئەو ئایەتە ئاماژە ئەکا بۆ ئەمە کەئاینی ئیسلام سەرئەکەوێ بەسەر دوژمنانی خۆیا . کەواتە هەرکەسێ ئاین لەدڵیا چەسپا بێ و جێگەی خۆی گرتبێ ئەودڵە هەرگیز تەنگی ڕووی تێ ناکا و ناترسێ ، ئەزانێ لەڕێگەی ئایینی خۆیا و بۆ بەرزی فەرموودەی ڕاست لەناو ئەچێ و ئەکوژرێ ، بەلآم نەرم و نیانی لەموسڵمانانەوە لەبەر سوودی خۆیان زۆر شیرینە ، نەك بۆ ئەو شتانە پەیوەندیان بەئایین و باوەڕەوە هەبێ ، لەوانەدا ئەبێ توند و تیژ بن .

کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەجەنگی ئوحود گەڕایەوە بەخەفەت و دڵگرانی زۆرەوە ، ژنانی مێرد کوژراو و کوڕی باوك کوژراو ئەهاتن بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، بەوکارانە ئازاری پێ ئەگەیشت . پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەسەر زەنشتەوە فەرمووی : ئابەم شێوەیە لەگەڵ پێغەمەری خۆوتان هەڵئەسن ، بۆ ئەو مەبەستە خوا بەباوەڕدارانی فەرموو :

﴿ إن يمسسكم قرح قد مسّ القوم قرح مثله ﴾ ئەگەر بگا بەئێوە برین و ئازاری برین لەجەنگی ئوحوداو لەجەنگانی تریشدا ، دوایی بەڕاستی گەیشتووە بەبێ باوەڕان برین و ئازاری برین وێنەی ئازاری ئێوەکەچی لاوازی ڕوی نەکردە ئەوان و خۆیانیان ئامادەکردوە بۆ جەنگ لەدوای جەنگی بەدرو پەلاماری ئێوەیان دایەوە ، پێویستە ئێوەیش وەك ئەوان وابن و ئەبێ ئێوە بەهورە تربن ، چونکە هەوڵی ئێوە خاوەنی سوودە نەك جەنگی ئەوان .

﴿ وتلك الأيام نداولها بين الناس ﴾ وەهێزی ڕۆژانی جەنگ و جیهان ئێمە ئەو هێزانە ئەگۆڕین لەنێوان ئادەمیزادا ، ڕۆژێ دەستەلآت و ڕابواردن بۆ لایەنێکە و ڕۆژێ بۆلایەنێ

تره ، ڕۆژێ نەگبەتی و ئازار بۆلایه ، ڕۆژێ تر بۆ لایه تره ، ڕۆژێ سوود بۆ موسـولْمانانه و ڕۆژێ تر بۆ بێ باوەڕانه .

مەبەست لـەو گۆڕینەی خوای مەزن بۆ ئەوەنی‌یه جارێ یارمەتی باوەڕداران بدا ، جارێ تر یاریدەی بێ باوەڕان بدا ، چونکه یارمەتی دان کارێکی گرنگه هـەرگیز شایستەی بـێ باوەڕان نیه. بەڵکو ویستی خوای مەزن وایه جارێ ئازاری گران تووشی بێ باوەڕان ئـەکا ، ئەگەر هەموو کاتێ ئازاری بێ باوەڕان گران بکا و ئازار لـەسەر موسـولْمانان هـەڵبگرێ هەموو ئادەمیزاد بۆی دەرئەکوێ باوەڕهێنان بەئاین ڕاسته و ڕەوایه ، جگەی ئـەو پـووچ و نادروسته ، کەواته هەموو ئادەمیزاد بەخۆشی بێ یابەترشی ئەبێ بـاوەڕ بـهێنن ، ئـەو کاتـه داواکردنی خوای مەزن لـەئادەمیزاد بۆ فەرمانبەرداری بێ سـوودە وپاداشـت و سـوزایش بێ‌جێگه ، وەك لـەمەو بەر لـەئایەتی (١٣٨) ی ئەم سورەته باسی کرا .

لـەڕۆژانی ڕابووردودا هێزی گەلان و سەرکەوتنیان بەهۆی دارایی و پیاوانی زۆر ئازا و کارامەوەبووە ، هەر گەلێ بەو جۆره خۆیانیان بنواندایه سەرئەکەوتن ، بـەڵام ئێسـتا و ئـەم سەردەمەی ئێمه ئەو شـتانه باویـان نـەماوە. ئێسـتا زانیـاری و پیشەسـازی دەور ئـەبینێ ، نیشتمانی دانیشتوانی نەزان و نەخوێندەوار بێ هێز داگـیرکراو ئـەبێ باهـەموویان خـاوەنی سامانترینی دانیشتوانی سەر زەوی بن ، وەك زێڕی ڕەش زیوو خورما و دانەوێڵه و دەریا و زەریا ، بەڵام دانیشتوانی جێگەیه خوێنەوار و زانابن ، خاوەنی پیشەسازی بـن سـەرکەوتن بەدەست ئەهێنن ، هەرچەندە زەوی نیشتمانەکانیان چۆڵبن لـەهەمو کانگایه ئەوەیش بەهۆی زانیاری و خوێنەواری‌یەوەیه ، بەناچاری گەلانی نەزان و بـێ هـێز ئەبنـه بچوکـی گـەلانی خاوەن زانست و بەهێز بیانەوێ یا نەیانەوێ .

موسوڵمانانی پێشوو لـەسـەربازنه بـۆ سـوودی خۆیـان ئەسـوڕانەوە بـەگورجی بەیـەك ئەگەیشتن بەگوێرەی پێویستی ئەو کاته زانین و پیشەسازی و چەك سازیان بەەسـت ئـەهێنا بۆ سوودی دانیشتوان ، بەو بۆنەوە بوون بە پێشەوا و چاو لێکراوی هەموو گەلان . بەڵام لـەم سەردەمەدا پەرتەوازەن و لـەسەر هێڵی ڕاست پشت ئەکەنه یەكتری و هەرگیز تووشـی

یەکتری نابنەوە ، بەو بۆنەوە نەزانین و نەخوێنەواری و بێپیشەسازی بوەبە بەشیان و بوون بەژێردەستەی دوژمنانی خۆیان و خوایان ، بۆیە بێ باوەڕانی ئێستا جێگای موسڵمانانی پێشوویان گرتەوە و بوون بەزاناو خوێندەوار .

زانستی بێ وێنەی خوای مەزن لەمەدایە لەگومان و نەزانیندابن و نەزانن چ کەسێ لەباوەڕداران و لەبێ باوەڕان سەرئەکەون ، ئادەمیزاد بەکۆششی خۆیان ئەو گومان و نەزانینە نەهێڵن بەهۆی ووردبوونەوەی زۆر قووڵ لەبەڵگە ڕاستیەکانی ئایینی ئیسلام ، بۆ ئەوەپاداشتیان لەلای خوای مەزن گەورە و بەڕێز بێ ، بۆئەوە خوا زانستی خۆی ببەستێ بەو کەسانەوە باوەڕیان هێناوە و خاوەنی کۆششن لەمەو پاش و ئەفەرموێ :

﴿ ولیعلم الله الذین آمنوا ﴾ ئێمە هێزی ڕۆژانی جەنگ ئەگۆڕین لەنێوان ئادەمیزاد لەمەوبەر مەبەست و زانستێکی تایبەتیە داوای ئەو گۆڕینەی کردووە ، لەبەر ئەوەی خوا بزانێ و ئاگادار بکا کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە جیا ببنەوە لەبێباوەڕان ، مەبەست ئەوە نیە خوازانا نەبووە بەوکەسانە باوەڕیان هێناوە و ڕۆژانی هێز ئەگۆڕێ هەتا باوەڕداران بناسێ کەبە و جۆرە نییە ، چونکە خوا مەبەستی ئەمەیە خوا زانستی خۆی بۆ باوەڕداران ئاشکرا ئەکا هەتا ئادەمیزاد بیان ناسن ، زانراوەکانی خوا زۆرن و زانینی خوا یەکە و ناگۆڕێ هەربوە ئەوە ، بۆ نمونەیەکی لەئێمە ئەزانێ بەهاتنی بەیانی ، دوایی کاتێ بەیانی هات ئەزانێ بەیانی بوەبەئەمڕۆ ئەمڕۆیش ڕۆیشت ئەزانێ بووە بەڕابووردوو ، کەواتە گۆڕان و تازە پەیدابوونێکە لەزانراوەکاندا پەیدا ئەبێ ، خوای مەزن ، باوەڕدار و بێ باوەڕ ئەزانێ بەر لەوەی بۆ ئادەمیزاد دەرکەون ، کاتێ دەرکەوتن خوا ئەزانێ بەجیابوونەوەیان لای ئادەمیزاد .

﴿ ویتخذ منکم شهداء ﴾ وەبۆ ئەوە خوا وەربگرێ کۆمەڵێ لەشەهیدەکانی ئێوە و ڕێزیان لێ بگرێ بەبۆنەی ئارام و خۆڕاگرتنیانەوە لەسەر سەختی جەنگ و شتی تر . شەهید کەسێکی ئەوتۆیە خۆی بکا بەفیداکار بۆ بیروباوەڕی خۆی ، چونکە ئەزانێ ئەو ڕێگەیە بەختیاریە ، مانەوەیان لەگەڵ ستەمکاراندا شوورەیی و خراپییە ، شەهید

لەپاشەرۆژدا لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و دۆستانی خوادان و خوا شایەتیان بۆ ئەدا لەنێو هەموو گەلانی ئادەمیزادا .

ئەو کەسانەی لەجەنگی بێ باوەڕاندا بکوژرێن نوێژی مردوویان لەسەرناکرێ و ناشۆرێن ، بەو مەرجەی ئەو جەنگە کۆتایی پێ نەهاتبێ ، ئیتر بەهەر جۆرێ کوژرابێ ، بەڵام ئەو کەسانەی لەجەنگی یاخیەکان لەڕژێمی ئیسلامدا بکوژرێن ، یا لەپاش کۆتایی جەنگی بێ باوەڕاندا بکوژرێ بەهەر هۆیە بێ بەشەهید دانانرێن ، ئەبێ بشورێن و نوێژیان لەسەر بکرێ ، خوا بیکا بەبەشی شەهیدی .

﴿ والله لا يحب الظالمين ﴾ وەخوا ستەمکارانی خۆشا ناوێ ، هەڵیان نابژێرێ بۆ کوشتن لەڕێگەی خوادا ، هەورچەندە وائەبێ لەجەنگی باوەڕدارانا ئەکوژرێن ، یا سەر ئەکەون بۆ ئەوە ببێتە هۆی سەر لێشوان و ناسینیان لای ئادەمیزاد .

﴿ وليمحص الله الذين آمنوا ﴾ وەبۆئەوەی خوا پاکی بکاتەوە کەسانێکی ئەو تۆ باوەڕیان هێناو بەهۆی ئەو گۆڕانەی هێزی ڕۆژەکانی جەنگ ، دەریان بخا بۆ ئادەمیزاد و تاقیان بکاتەوە .

﴿ ويمحق الكافرين ﴾ وەبۆئەوەی خوا بێ باوەڕان لەناو ببا بەهۆی ئەو گۆڕانەوە ، مەبەست لەناو بردنی ئەو بێ باوەڕانە تاقمێکی تایبەتن کەجەنگیان لەگەڵ پێغەمەر کردوە لەجەنگی ئوحودا ، ئەو تاقمە هەمویان کوژران جگە لەکەمێکیان کەلەوەپاش باوەڕیان هێنا ، وەك خالیدی کوڕی وەلید .

هەموو کەس ئەزانێ کەبێ باوەڕان هەموویان لەجەنگی ئاینی ئیسلامدا کوژراون و زۆربەیان ماونەتەوە و بێ باوەڕیشن ئەو مانایە ڕاستە ئەگەر مەبەست لەناوچوون سزای جیهانبێ .

لەجەنگی ئوحودا بە درۆ و بڵاو کرایەوە کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کوژرا و بەو بۆنەیەوە موسوڵمانان بوون بەدوو بەشەوە : هەندێکیان ئەیان ووت : ئەگەر پێغەمەر بوایە نەئەکوژرا، هەندێ تریان ووتیان : ئێمە لەسەر فەرموودەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەڕۆین و

جەنگ ئەکەین هەتا ئەکوژرێن و ئەچین بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، بـۆ ڕوون کردنـەوەی ئەو مەبەستە خوا فەرمووی:

أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدْ كُنتُمْ تَمَنَّوْنَ ٱلْمَوْتَ مِن قَبْلِ أَن تَلْقَوْهُ فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾

﴿ أم حسبتم أن تدخلـوا الجنـة ﴾ بـەلـکو ئایـا ئێـوە گومانتـان ئـەبرد کـەئێوە ئەچنـە بەهەشـت ، وەك ئـەو کەسـانەی کـوژران و ئارامیـان گـرت لەسـەر کوشـتن و ئـازار و برینداری ؟ ، پێویستە گومانتان وانەبێ .

﴿ ولما يعلم الله الذين جاهدوا منكم ويعلم الصابرين ﴾ وەهێشتا خوا نـەبینی و نیشـانی نەدا بەئادەمیزاد کەسانێکی ئەوتۆ کۆششیان کرد و خۆیان فیداکاری کرد لەئێوە ، چـوون بۆ نێو بەهەشت بەو جۆرە نەبێ دەستی هیچ کەسێ ناکەوێ ، کەخوا ببینێ و نیشانی بدا بە بەئادەمیزاد کەسانێ ئارامیان گرتووە و بێ فەرمانی پێغەمـەریان نـەکرد و جێگـەی خۆیـان چۆڵ نەکرد ، یانێ ئێوە ناچنە بەهەشت هەتا بەو جۆرە نەبن .

ئەو ئایەتە بەلـگەی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەمە کە ئـاینی ئیسـلام پـەیوەندی بتـەوی هەیە بە کردەوەی چاك لەژیانی جیهاندا ، مەرجی یەکەم بۆ نزیك بوونەوە لەخوا و ڕزگـار بوون بەهۆی ڕەزایەتی خواوە و بەشـداری لەپاداشـتا هـەر بەکۆشـش و مـاندوو بوونـە ، پەیوەندی بەڕاسـت گۆیـی و نیـازی پـاك و ئـارام گرتـن و خۆڕاگرتنـەوە هەیـە ، بـەلام

دروستکردنی مزگەوت و تەکیە و خانەقا و ڕۆژوگرتن و نوێژ کردن و خوێندنی قورئـان ، ئەوانە هەموویان سوودیان نی‌یە مەگەر ببنە هۆکاریٚ ئادەمیزاد ڕاکێشن بۆ سوودی گشـتی یا ڕێگە بگرن لەزیان و ئازاری ئەوان ، بەگوێرەی یاسای قورئان خزمەتی دانیشـتوانی پـیٚ بکرێن .

دروشم و ئالاّ و بەیداخی ئاینی وەك نوێژەکان و جێگـەکانی پەرسـتن هەرچـەندە بـەبیٚ گومان ڕێزدار و پیرۆزن ، بەڵکو ئەوانە پێویستی ئـاینین و ئـەبیٚ بکرێـن ، دوایـی هـەموو دەوڵەت و تاقمیٚ کەبیروباوەڕێکی تەنها کۆیـان ئەکاتـەوە نابـیٚ هـەبن مەگـەر هـەیان بـیٚ دروشم و ئالاّیە خۆیانی پیٚ دەرئەخەن و تاقم و پەیڕەوانی خۆیانیان پیٚ کۆئەکەنەوە . بـەلاّم ئەو دروشمانە نابنە جێگەی بڕوا ، لەجگەی ئـەو دروشمانـە شـتیٚ تـری کاریگـەر هـەبیٚ ، مەبەست لەنوێژ بەتەنها کوڕنوش بردن و سوژدە بردن نی‌یە، بەڵکو ئـەوەی گرنگبـیٚ ئـەو شتەیە نوێژ کەر بەگوێرەی فەرمودەی خوا لەشی خۆی بەکار بهێنیٚ لەفەرماندان بەچاکە و ڕێگە گرتن لەخراپە و کاری بـێز لیٚ کـراوە، کۆبونـەوە لەمزگـەوتا پێویسـتە بـۆ ئـەوەبیٚ دانیشتوان سەر جەم پاڵ بدەن بە بەیەکەوە و بەنیازی پاکەوە بۆ سوودی هەموان ، نەك بـۆ سوودی تایبەتی لایە و ئاژاوە و دووبـەرەکی نانـەوە . بەڕاسـتی لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا دروشم و ئالاّی ئاینی بەکار دێنن بۆ لادانی دانیشتوان لەڕێگەی ڕاسـت ، زۆر لـەپارت و کۆمەلاّن هەن ناوی ئاین و نیشتمان پەروەری و ڕۆشنبیریان بەخۆیانـەوە نـاوە سـەرمایەیان لەڕژێمی بێگانەوە بۆ دیٚ و مزگەوت و تەکیە و خانەقای پیٚ دروست ئەکـەن و ووێنـەیان ئەگرن و ئەیان نێرنەوە بۆ لای ئەو ڕژێمە .

کۆمەڵیٚ لەهاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئاواتیـان ئەخواسـت و ئـەیان ووت : خۆزگایـە ئێمەش وەك هاوڕێکانمان لەجەنگی بەدردا لەڕێگەی خوادا خۆمانمان بدایە بە کوشت هـەتا بەو پلە بەرزە شاد ببوینایە ، کەچی کاتیٚ جـەنگی ئوحـود ڕوی دا ترسـان و ڕایـان کـرد پێغەمەریان بەجیٚ هێشت ، ئەوئاواتەی خواستبویان پاڵیان پێوەنا ، بۆیـە خـوای مـەزن ڕوو ئەکاتە ئەوان و ئەفەرمویٚ :

﴿ ولقد کنتمم تمنون المـوت مـن قبـل أن تلقـوه ﴾ وەبەڕاسـتی ئێـوە ئـاواتی مردنتـان ئەخواست زۆر بەخۆشیەوە هەتا پلەی بەڕێزی شەهادەت وەرگرن لەپێش ئەوە ئێوە بگـەن بەهۆی مردن بەتایبەتی لەم جەنگەی ئوحودا .

﴿ فقد رأیتموه وأنتم تنظرون ﴾ دوایی بەڕاسـتی ئێـوە بینیتـان جـەنگی ئوحـود و بـێ باوەڕان و ، لەکاتێکا ئێوە هێز و شیری بێ باوەڕانتان چاو پێ کەوت شکان و پێغەمـەرتان بەجێ هێشت ، لەکاتێکا براکانتان بەمردوویی ئەبینی .

بۆ هەموو ئادەمیزادێ ژینگە و کارێکی تایبـەتی خۆیـان هەیـە ، ئـەو ژینگـە و کارانـە دەستەڵات پەیدا ئەکەن بەسەر ڕەوشت و بیرو باوەڕیانا بەزۆری ، دوایـی بـۆ وێنـە پیـاوی لاوازو بـێ دەسـتەڵات سـتەمکردن لەهـەموو هـێزێ بـەخراپتر دائـەنێ ، هـەر کەسـێ لەژینگەیەکا بژی بت پەرستن هیچ خراپەیە لەبت پەرستیدا نـابینن ، مەگـەر ئـادەمیزادێکی زۆر ژیری وەك موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا کەبەپاکی ڕەوشتی خۆی بت پەرستی لەیەکـەم کاتەوە بەخراپ ئەزانی .

بۆ نمونە زۆر هەژار و لاواز هەن ئەوپـەڕی ڕقـی خۆیـان دەرئـەبڕن بەرانبـەر بـەکار و کردەوەی ساماندااران و خاوەن هێزان ، باسی ستەم و ئازارو ئەشکەنجەدانیان ئەکەن .

کاتێ ئەو مرۆڤە هەژار و لاواز و بت پەرست و بێ ئاینانە بەجۆرێ تر گـۆڕان و بـوون بە ساماندار و خاوەن هێز و خوا پەرست خووڕەوشتیان ئەگۆڕێ بەجۆرێ تر ، ئەو شتانەی لەوەو بەر نـەفرەتیان لێ ئـەکردن ئێسـتا لایـان زۆر بـەڕێز و پـیرۆزن . بـەچاوی خۆمـان زۆرکەسمان دیوە دژی ساماندار و کاربەدەستان بـوون ، دوایـی هـەر ئـەو کەسـانە بـوون بەساماندارو خاوەنی پلەو پایەی ستەم لێ کراوی و هەژاری خۆیانیان لەبیر ئەچێ و لـەمان خراپتر ئەبن ، هەروەها چەندین مرۆڤی بت پەرست و بێ ئاین کـەباوەڕیان هێنـا ئەوپـەڕی بێزاری خۆیان دەرئەبڕن بۆ بیر و باوەڕە کۆنەکانیان.

خوای مەزن بەو ئایەتەی پێشوو بەچەندین ئایەتی تری دوایی ئەو نەریت و ژینگانە بیری ئادەمیزاد ئەخاتەوە ، بۆئەوەی بزانن ئادەمیزاد لـەگۆڕان و گەشـە کردنـدان بەبـەردەوامی

بەلاّم مرۆڤی ژیر و کارامەی زۆر بەویژدان لەخۆی بـایی نابـێ و گرنگـی بـەهاتوو چـۆ و گۆڕانی نەریت و ژینگە نادا ، هەژاری و لاوازی و سامانداری و پلەو پایە کاری تێ ناکا، وایان دائەنێ ئەو شتانە دێن و ئەڕۆن و نامێنن ، هەروەها ئەو کەسانە خـاوەنی بیروبـاوەڕی ڕاستن و لە هەموو شتێ بەڕاستی و باوەڕەوە تێ گەیشـتوون نـاگۆڕێن لەخۆشـیدا بـن یـا لەتالّیدا ، هەموو چاکەیە بۆ خۆیان و بۆ جگەی خۆیان بەڕەوا ئەنێن ، هیچ شتێکی خراپـی تازە پەیدابوو سەریان لێ تێك نادا ، مرۆڤی چاك و خراپیان بۆ ڕوون بوەتەوە ، بیروباوەڕی چاك و خراپ لایان ڕوونە . ئەگێڕنـەوە کاتـێ عـەبدولاّی کـوڕی ئـەبو قەمئـە بـەردێکی هاویشت بۆ پێغەمەر و ڕوومەتی پیرۆزی پێغەمەر بریندار کردو ددانێکی پێغەمەری شکاند ، پاسەوان و بەیداخ هەلّگری پێغەمەریشـی کوشـت ، وایشـی زانـی پێغەمـەریش کـوژراوە جـاڕی دا بـەنێو خـەلّکا و ووتـی : موحەمـەد کـوژراوە ، بـەو بۆنـەوە هـەندێکی زۆر لەهاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕووخان و هەلّهاتن لەگەرمەی جەنگدا و پێغەمـەریان بـەجێ هێشت ، هەندێ تریان ووتیان . کە پێغەمەر کوژرابـێ ئێمـە خـەریکی چ شـتێکین ، بۆیـە خوای مەزن بەسەر زەنشتەوە فەرمووی :

وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ

ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا۟ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا۟ وَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِىٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾

﴿ وما محمد إلاّ رسولٌ قَدْ خلت من قبله الرسل ﴾ وەموحەمەد هیچ شتێ نی‌یە مەگەر ئادەمیزادێکە نێرراوە بۆ ئەوە پەیامی پەروەردگاری خوا بگەیەنێ بەبەندەکانی ، هەرکاتێ رایگەیاند کارەکەی کۆتایی پێ دێ ، پەیامی خوا پەیوەندی بە مانەوەی موحەمەدەوە نی‌یە بەڵکو ئەو پەیامە بەردەوامە بەمانەوەی خوای مەزنەوەو خوا هەرئەمێنێ ، بەراستی بەر لەموحەمەد چەندین پێغەمەری تر رابووردوون و مردوون و ئامۆژگاری‌یەکانیان ماونەتەوە، موحەمەدیش بمرێ پەیامەکەی هەر ئەمێنێ پێویستە لەسەر ئێوە دەست بگرن بەئاینی موحەمەد دوای مردنی .

﴿ أفئن ماتَ أوْ قُتِلْ أنقَلَبْتُمْ على أعقابِكُم ﴾ دوایی ئەگەر موحەمەد مرد لەجێگەی خۆیا یا کوژرا ئایا ئێوە ئەگەڕێنەوە بۆ لای کاری پێشوتان ، ئێوە ئەتانەوێ بگەڕێنەوە بۆ

لای بێ باوەڕان و هەڵگەڕێنەوە لەئاینی ئیسلام ، ئێوە نابێ ئەو کارە بکەن موحەمەد نەمێنێ، خوا و ئاینی موحەمەد ئەمێنێ .

﴿ وَمَنْ يَنقَلِبُ على عَقَبَيهِ فَلَنْ يَضر الله شيئاً ﴾ وەهەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆلای بیرو باوەڕی پێشویی و واز لەئاینی ئیسلام بهێنێ ، دوایی وەرگەڕانی ئەو کەسانە زیان لەخودا نادەن هیچ شتێ .

﴿ وَسَيَجزي الله الشاكرين ﴾ وەخوا لەمەو دوا بەم نزیکە پاداشتی ئەو کەسانە ئەداتەوە سوپاسی خوا ئەکەن و پەشیمان ئەبنەوە و ئەگەڕێنەوە بۆ لای ئاینی ئیسلام .

﴿ وَماكانَ لِنفسٍ أنْ تَموتَ إلاّ بِإذنِ الله كِتاباً مؤجلاً ﴾ وەنیە هیچ کەسێ کە بمرێ مەگەر بەدەستوری خوا ، ئەو مردنە نوسراوە بەنوسراوێکی خاوەن کاتی دیاری کراو ، ئەو کەسە نەلەبەر ئەو کاتە و نەلەپاش ئەو کاتە نامرێ و ناژێ ، کەواتە ڕاکردن و خۆشاردنەوە و ترسان ئەو کاتە درێژ ناکەنەوە ، ئازایی و پەلامار دانی دوژمن کورتی ناکاتەوە ... چەندین پرسیار هەن زۆر مرۆڤی بێ باوەڕ و باوەڕ دانەمەزراو پرسیاری بۆ ئەکەن و بەرپای ئەکەن :

پرسیار / ئەو شتەی ئێمە ئەیبینین ئەمەیە کەبەڕاستی بۆ مردن هەیە چەندین هۆی تایبەتی، وەك کوشتن و خنکان و ڕشانەوە و چەندین شتی تر ، ئەوانە دژی ئەوەن کەکاتی مردن دیاری کراوە بەهۆی زانینی خوای مەزنەوە ؟

وەڵام / لەوانەدا هیچ هۆیە تر نی‌یە بۆ مردن جگەی ئەو کاتە دیاری کراوە لای خوا ، چونکە ڕشانەوە بلاو ئەبێتەوە لەجێگەیەکدا ، لەگەڵ ئەوەدا لاوێکی بەهێز ئەمرێ و پیرێکی پەك کەوتە نامرێ ، زۆر لێدان هەیە پیاوێ ئەکوژێ کەچی هەر ئەو لێدانە پیاوێ تر ناکوژێ ، ئەگەر ئەو هۆیانە بۆ هەموو کات بونایە ئەبوایە کاری بکردایە سەر هەموو کەسێ بەبێ جیاوازی ، کەواتە خوا دیاری کردووە لەو کاتەدا بمرن .

پرسیار / بەگوێرەی ناوەرۆکی ئەو ئایەتە ئەبێ پیاو کوژ بەرپرسیار نەبێ لەبەردەم خوادا بەکوشتنی پیاوێ تر ؟

وەڵام / بەڕاستی کوژراوەکە مردووە بەهۆی کاتی دیاری کراو بۆ مردنەکەی ، پیاو کوژیش شایستەی سزادانە چونکە پەلاماری شتێکی داوە خوا قەدەغەی کردووە ، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەیتوانی کەخۆی لێ دوور بخاتەوە و وازی لەو پیاوە بهێنایە بەهۆی شتی ترەوە بمردایە . کەواتە کوشتن و کاتی دیاری کراو لەیەك کاتا کۆبونەتەوە لەجێگەیەکی تەنهادا کەلەشی پیاوە کوژراوەکەیە .

لەمەو بەر باسکرا کە تیر هاوێژەکان بێ فەرمانی پێغەمەریان کرد ، جێگەی خۆیانیان چۆڵ کرد ، دەستیان کرد بە کۆبونەوەی تالآن ، بەو بۆنەوە بت پەرستان پەلاماریان دان هەندێکیان کوژران و ئەوانی تریان ڕایان کرد ، دوایی خوا بەسەر زەنشتەوە بەوان ئەفەرموێ :

﴿ وَمَنْ يَرِدْ ثواب الدنيا نُؤتِهِ مِنها وَمَنْ يُرِدْ ثوابَ الآخرةِ نؤتِهِ مِنْهاوَسَنَجزي الشاكرين ﴾ وەهەرکەسێ بەجەنگ کردن مەبەستی پاداشتی جیهانبێ ئێمە ئەو پاداشتەی ئەدەینێ و لەجیهاندا و لەپاشەڕۆژدا بەشی تری بۆ نییە و ، هەرکەسێ مەبەستی پاداشتی پاشەڕۆژبێ ئێمە ئەو پاداشتەی ئەدەینێ بەهەر جۆرێ شایانی بێ ، ئێمە پاداشتی باوەڕدارانی سوپاس کەر ئەدەینەوە کەهیچ شتێ لای نەداون بۆ جەنگ کردن و مەبەستیان هەر خوا بووە .

ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە هەرچەندە دەربارەی جەنگ هاتوەتە خوارەوە بەلآم هەموو فەرمانێکی خوای مەزن ئەگرێتەوە ، بەگوێرەی مەبەستی خۆیان لەپاداشتی جیهان و پاداشتی دوارۆژ . هەرکەسێ جەنگ بکا بۆ بەرزی ئاینی ئیسلام پاداشتی خۆی وەرئەگرێ لەتالآن و شایانی پاداشتی لای خوای مەزنیشە ، هەرکەسێ جەنگ بکا بۆ مەبەستی پاداشتی جیهان و پاداشتی پاشەڕۆژ خوای مەزن هەردوو پاداشتەکەی ئەداتێ ، بەپێچەوانەی نوێژ و ڕۆژوو زەکات ، ئەوانە ئەبێ بەتەنها هەر مەبەستی خوابێ ، ئەگەر مەبەستی جگەی خوابێ ئەوانە پووچ ئەکاتەوە و لای خوا پاداشتیان بۆ نابێ .

ئەو کەسانەی دوای مانای ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمەر بکەون ئەبێ بزانن نیازی دڵ کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر بڕیاردان بۆ ڕوون کردنەوەی گفتوگۆ و

کردەوەی پیاو چاکان و پیاو خراپـــان . جێگـەی سەرسـوڕمان نی‌یـە کـەدڵ و دەروونـی ئادەمیزاد بنچینەی هەموو شتێکن، بە بزوتنەوەی دڵ ژیانی ئادەمیزاد دەست پێ دەکات، بە وەستانی دڵ کۆتایی بە مانەوە ژیانیا دێـــی، هـەر دڵیشـە جێگـەی بـاوەڕی بـاوەڕداران و ترسانیان لـە خوا، هەردڵە جێگەی ئاوات و چاوچنۆکی و خۆشەویستی و کینەو ئـــازایی و ترسنۆکی و یەك ڕوویی و دووڕویی و قینیات و بێ باوەڕی و ستەم کردن و هـەموو شـتی تر. کەواتە کردەوەی ئادەمیزاد ئەگۆڕرین بە گۆڕانی نیازی دڵیان، بـەو بۆنـەوە ئـادەمیزاد ئەتوانن ڕێگە بدۆزنەوە بۆ خۆیان بە گوێرەی نیازو نیشانەی دیاری کراویی خۆیان، هەر لـە سەرەتای ژیانیانەوە هەتا کۆتایی تەمەنیان، بە دەرکەوتنی کارو فرمانیان چاکبـێ یـا خـراپ ئەتوانرێ بڕیار بدرێ لـەسەر شاراوەی نیازی دڵیان بە هۆی ئەو کـارو فرمانەیانـەوە بـەڵام نیازی دڵ بەبێ کردەوە بایەخی پێ نادرێ، ئەبێ ئەو نیازە کـردەوەی لەگـەڵبێ هـەتا ئـەو کەسە شایانی پاداشت یا تۆڵەبێ.

با ئەمەیش بزانــرێ نیـازی کردنـی گونـاە هەرچـەندە خـۆی لـە خۆیانـەوە قەدەغەیـە خاوەنەکەی شایستەی سزایە. بەڵام خوای مەزن بە میـــهرەبانی خـۆی ئـەو سـزایە لـەسـەر خاوەن نیازەکە لائەبا، بە مەرجێ گوناهەکە نەکا، نیازی چاکە لای یاسای ئیسلام بە چاکـە بۆ خاوەنەکەی ئەنوسرێ، نیازی خراپەی ڕووت بە گوناە دانانرێ.

خوای مەزن بۆ کۆتایی هـاتن بەسـەر زەنشـت و تـەمێدا دانـی جـەنگاوەرانی ئوحـود ئەفەرموێ بە هەڵهاتوەکان: پێغەمبەرانی پێشوو پەیڕەوەکانیان چاکترین هۆن ئێوە چاویان لێ بکەن، چونکە ئەوان ڕێگەو شوێنی خۆیانیان چۆڵ نەئـەکرد خـاوەن ئـارام بـوون لـەسـەر جەنگ هەڵنەئەهاتن، چۆن ئێوەی موسڵمان شایانی ئەوەن هەڵبێن و بڕوخێن، بۆیـە خـوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ ﴾ وە زۆر لـە پێغەمبـەران جـەنگیان کـردووە لەگەڵیان کۆمەڵێکی زۆر زاناو لـە خواترس و خۆپارێز، زۆریان لێـی کـوژراوە. ژمـارەی سوپای ئەو پێغەمبەرا چەندە بوبن مەبەستەکە ناگۆڕێ.

﴿ فَما وَهَنُوا لِما أصابَهُمْ في سَبيلِ اللهِ وَما ضَعُفوا وَمَا استَكافُوا ﴾ دوایــی ئـەو زانایانـە لاوازی ڕووی تێ نەکردوون لەبەر ئەو شتەی توشی ئەوان بووە لە ڕێگەی خوا لە گوشتن و ئازارو برینداری زۆرجاریش پێغەمبەرەکانیان لەگــەڵیانا کــوژران و، ئـەو زانایانـە لاواز نەئەبون بۆ جەنگ کردن و نەئەترسان و، سەریان شـۆڕنەکرد بـە دەربڕینـی بـۆ دوژمنـانی خۆیان.

﴿ واللهُ يُحِبُ الصّابِرينَ ﴾ وە خوا خـۆ ڕاگـران و خـاوەن ئارامـەکانی خـۆش ئـەوێ، یارمەتیان ئەداو ڕێزداران لای خوا.

﴿ وَما كانَ قَوْلُهُمْ إلا أنْ قالُوا رَبَّنا أغْفِرِ لَنا ذُنُوبَنا وإسرافَنا وَثَبِتْ فِـي أمْرِنـا ﴾ وە ئـەو زانا لـە خوا ترسانە هیچ گفتوگۆیێکیان نەبوو دوای کوشــتنیان مەگــەر ئـەیان ووت: ئـەی پەروەردەکەری ئێمە تۆ خۆشبە بۆ ئێمە لـە گوناهەکانمان و لـە لادانمان لـە سنوری بــەندایەتی خۆمان و، تۆ توند بکە پێکانی ئێمە لـە جێگەی خۆیانا لـە جەنگدا و خۆمان ڕاگرین.

﴿ وأنْصُرنا عَلَى الْقَومِ الْكافِرِ ينَ ﴾ وەتۆ یارمەتی ئێمە بدەو زاڵمان بکە بەســەر تـاقمی بێ باوەڕاندا، ترس و بیم بخەرە دڵیان، هەتا گوریز بدەن لـە جەنگدا.

﴿ فأتاهُمُ اللهُ ثَوابَ الدُنيا ﴾ دووایی خوا بەخشیبوی بەو زانایانە پاداشتی جیهان لەسەر کەوتن و تالآن و زاڵبون بەسەر دوژمنان و لێ بوردنی خواو باسکردنیان بە چاکە.

﴿ وَحُسْنَ ثَوابِ الأخِـرَةِ واللهُ يُحِـبُ الْمُحْسِنِنْ ﴾ وە پێـی دابـوون شـیرینی پاداشـتی پاشەڕۆژ لـە بەهەشت و خۆشی و ژیانی بەردەوامی و، خوا چاکەکەرانی خۆش ئـەوێن کـە بریتـین لـەو زانـا لــە خــوا ترســانەو هــەموو کەســانێ وەك ئـەوان وابـن و بـێ فـەرمانی پێغەمبەرەکانیان نەکەن.

هاوڕێکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ شکان و ڕایان کردو وازیان لـە پێغەمبەر هێناو وایان زانــی کوژراوە، بەو بۆنەوە دوو ڕوەکان ووتیان: بگەڕێنەوە بۆلای ئاینی خۆتان ئەگەر موحەمەد فروستادەی خوا بوایە نەئەگوژرا، خوای گەورە بۆتەمێ کردنیان فەرموی:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَـٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّـٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا ۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٥١﴾

﴿ يا لأيُّها الّذِيْنَ أمنُوا إن تُطِعُوا الذّينَ كَفَرُوا يَرُدُوكُمْ عَلى أعْقابِكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداریی کەسانێکی ئەوتۆ بکەن، باوەڕیان نەهێناوە وەك بت پەرستانی عەرەب و، دوروەکان ئەوان ئێوە ئەگێڕنەوە بۆلای ئاینەکەی پێشوەکەی خۆتان کە بێ باوەڕی و بت پەرستیە، ئەتان گێڕنەوە پاشەو پاش.

﴿ فَتَنْقَلِبُوا خاسِرِينَ ﴾ دوایی ئێوە ئەگەڕێنەوە بۆلای زیانۆمەندان لە هەردوو جیهاندا، زیاندار ئەبن بەسەر خواری بۆ بێ باوەڕان و بە چونە ناوی دۆزەخ.

هەموو ئادەمیزادێ ڕاست بکا یا درۆ بکا ئاوات ئەخوازێ هەموو ئادەمیزاد لەسەر ئاین و بیروبڕوای ئەوبێ، جیاوازی لە نێوانیانا ئەمەیە: پەیڕەوی کردنی ناڕاست و پوچ بازان زیان بەخشە، پەیڕەوی کردنی ڕاست وێژان قازانج و سود بەخشە، بۆیە خوا باوەڕداران لە بێ باوەڕان ئەترسێنێ ئەفەرموێ:

﴿ بَلِ اللهُ مَوْلاكُمْ وَهُوَ خَيْرُ الناصِرِين ﴾ بەڵكو خوا خاوەن دۆست و یاریدەر ئێوەیەو، خوا چاکترینی یاریدەرانە، مرۆڤی باوەڕدار نابێ بیر لە پەیڕەوی و دۆستایێتی بێ باوەڕان بکاتەوە، گوێی لە فێڵ و خراپەکاری ئەوان نەگرێ، هەرکەسی خوا یاریدەری بێت پێویستی بە یارمەتی و دۆستایێتی کەسی تر نییە... بێ باوەڕان کە لە جەنگی ئوحودا گەڕانەوە بۆ مەکە ووتیان: کارێکی خراپمان کرد کە موسڵمانانمان بنەبڕ نەکردن خۆ کەمێکیان مابوو. کەواتە با بگەڕێینەوە بنەبڕیان بکەن، کاتێ ویستیان بچنەوە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانان خوا ترسی خستە دڵیان و گەڕانەوە، بەو بۆنەوە خوا فەرموی:

﴿ سَنُلقِي فِي قُلُوبِ الَّذِين كَفَرُوا الرُّعْبَ بِما أشْرَكُوا باللهِ ما لَمْ يَنْزِلْ بِهِ سُلْطاناً ﴾ ئێمە ئەخەینە دڵی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا ترس و بیم بە هۆی شتێ ئەوان هاوبەشیان داناوە بۆ خوا بە شتێ خوا نەیناردوەتە خوارەوە بەڵگەیە کە ئەو شتە گرنگی پێ بدرێ. کەواتە ئێوەی موسڵمان نابێ بترسن لە بت پەرستان لەبەر ئەوەی ئێوەیان شکاندوە لە جەنگی ئوحودا، ئەوان کە هاوبەش دائەنێن بۆخوا لاسایی پێشوانی خۆیان ئەکەنەو بەبێ نامەیە خوا ناردبێتە خوارەوە.

﴿ ومَأواهُمْ النارُ وَبِئْسَ مَثْوى الظالِمِينْ ﴾ وە جێگەی بێ باوەڕان ئاگری دۆزەخە، وە ئاگری دۆزەخ شوێن و ئارامگای ستەمکارانە.

لەمەوبەر زانیمان کە موسڵمانان هەندێ لە عەرەبە بت پەرستەکانیان لە جەنگی ئوحودا کوشت، بەردەوامیشبوون لەسەر کوشتنیان هەتا تیر هاوێژەکان شوێنەکانی خۆیانیان چۆڵ کرد کە پێغەمبەر بۆیانی دیاری کردبو. لەو کاتەدا خالدی کوڕی وەلید لە پشتەوە پەلاماری باوەڕدارانی دا عبدولڵای کوڕی جوبەیرو هاوڕێکانی کوژران، بت پەرستان هورەیان بەرزبویەوە، باوەڕداران شکان و (٧٠) کەسیان لێ کوژرا، لەو کاتەدا مرۆڤێ جاڕی دا وا موحەممەد کوژراوە. پاش ئەو جارە خوای مەزن ئازایی و هورەی خستەوە دڵی موسڵمانان و گەڕانەوە، پەلاماری بت پەرستانیان دایەوەو شکاندنیان، بەو بۆنەوە خوای مەزن بەڵێنی بۆ باوەڕداران ڕوون کردەوە کە ئێوە سەر ئەکەون. فەرمووی:

وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ



﴿ وَلَقَدْ صدقكُمْ الله وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بأذْنِ الله ﴾ وە خوا ڕاستی کرد لە بەڵێنی خۆیدا بۆ ئێوە کە ئێوە سەر ئەکەون کاتێ ئێوە جەنگتان ئەکرد لەگەڵ بێ باوەڕان و ئەتان ویست بیان کوژن و بنەبڕیان بکەن بە دەستوری خواو بە گوێرەی زانستی خۆی، ئێوە بەردەوامبوون لەسەر کوشتنیان.

﴿ حَتى إذا فَشِلْتُمْ وتنازَعْتُمْ في الأمْرِ ﴾ هەتا ئێوە ترسان لەبێ باوەڕان و ناکۆکیتان لێی پەیدا بوو لە نێو خۆتانا لە بارەی جەنگ کردنتانەوە، هەندێکتان ووتان ئێمە جەنگ ئەکەین و هەندێکتان ووتان ئێمە جەنگ ناکەین کاتێ بێژرا پێغەمەر کوژراوەو تیر هاوێژەکان شوێنی خۆیانیان چۆڵ کرد.

﴿ وَعَصَيْتُمْ مِنْ بَعْدِ ما أراكُمْ ما تُحِبُّونَ ﴾ وە ئێوە بێ فەرمانی پێغەمبەری خۆتانتان کرد بەجێ هێشتنی ئەو جێگەیە پێغەمبەر بۆی دیاری کردبوون لە پاش ئەوەی خوا نیشانی دا بە ئێوە شتێ پێتان خۆشبوو لەسەر کەوتن و تالاّن و شکانی دوژمن.

﴿ مِنْكُمْ مَنْ يُريدُ الدُّنْيا وَمِنْكُمْ مِنْ يُريدُ الأخِرَة ﴾ هەندێ لە ئێوە کەسێ بوو کاروباری جیهانتان ئەویست کە ئەوانە تیر هاوێژەکانبوون جێگەی خۆیانیان بەجێ هێشت بە تەمای کۆکردنەوەی تالاّن و، هەندێ لە ئێوە کەسێ بو پاداشتی دووا ڕۆژی ئەویست وەك ئەو کەسانەی لە جێگەی خۆیان مانەوە لە گەڵ گەورەکەیان عەبدوڵای کوڕی جوبەیر هەتا بە پلەی شەهادەت گەیشتن.

﴿ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ﴾ لە پاشا خوا یارمەتی خۆی لە ئێوە گرتەوەو بێ باوەڕان زاڵبوون بەسەر ئێوەدا بۆ ئەوە ئێوە تاقی بکاتەوە ئارام گرتنتان لەسەر ئازارو خۆڕاگرتنتان لە نێو دانیشتوانداو هەریەکەتان بە گوێرەی کردەوەی خۆتان پاداشت وەربگرن. ئەگینا خوا مەزن بەر لە هەموو شتێ نیازی هەموو کەس ئەزانێ.

﴿ وَلَقَدْ عَفا عَنْكُمْ واللهُ فَضْلٍ عَلى الْمُؤمِنينَ ﴾ وە بە ڕاستی خوا لەو بێ فەرمانی ئێوە کە جێگەی خۆتانتان چۆڵ کرد لێتان بوورد پاش پەشیمان بوونەوەتان وە خوا خاوەنی گەورەیی و بەزەییە بەسەر باوەڕدارانەوە لە گوناهەکانیان خۆش ئەبێ دوای پەشیمان بوونەوەیان.

خوای مەزن یادی ئەو کەسانە ئەخاتەوە لە جەنگی ئوحودا شکان چۆن ترسان لە بێ باوەڕان و هەڵهاتن و ئاوڕیان لەکەس نەدایەوە، وولاّمی جاڕی پێغەمبەریان نەدایەوە کاتێ بە تەنها لە جێگەی خۆیا مایەوە کە ئەیفەرمو: من فروستادەی خوامو نەکوژراوم بگەڕێنەوە مەترسن، بەو بۆنەیەوە خوا مەزن ڕوو ئەکاتە هەڵهاتوەکان و ئەفەرموێ:

إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ
وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ
غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ
وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٥٣﴾
ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً
مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ
ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ
قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ
يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ
فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ
وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ
وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ

يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (١٥٥)

﴿ إذ تُصْعِدون وَلا تَلْوُون ﴾ خوا لە ئێوە خۆشبوو کاتێ ئێوە زۆر بە تیژی ڕاتان کرد بە زەویدا لە ترسی بێ باوەڕان و، ئاوڕتان نەئەدایەوە بۆلایەکترو کەستان بۆ هیچ کەسێ نەئەوەستان.

﴿ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ في أخراكُمْ ﴾ وە فروستادەی خوا لە دوای تاقمێکتانەوە وەستابوو بانگی ئێوەی ئەکرد. ئێوە بێن بۆلای من پێغەمەرم و نەکوژراوم، هەرکەسێ زوتر بگەڕێتووە ئەچێتە بەهەشت.

﴿ فأثابَكُمْ غَما بِغَمٍ ﴾ دوای ئەو کارە نارەوایە ئێوە کردتان هەڵهاتن و خوا پاداشتی ئێوەی دایەوە بە خەفەتێکی گەورە کە توشتان بوو بە هۆی شکانتان بەهۆی ئەو خەفەتەوە توشی پێغەمەربووبووە بە ڕاستی خەفەتی زۆر توشی هەڵهاتوەکان بوو: لەوانە کوشتنی براکانیان سەرکەوتنی بت پەرستان و پەشیمان بوونەوەیان لەو گوناهەی کردبویان. ئەو خەفەتانەتان توشبوو.

﴿ لِكَيْلا تَحزَنوا عَلى ما فاتَكُمْ وَلا ماأصابَكُمْ والله خَبيرٌ بِما تَعْمَلُونَ ﴾ لەبەر ئەوەی ئێوە خەفەت نەخۆن لەسەر شتێ لە کیسی ئێوە چووە لەسەر کەوتن و تالآن و، خەفەت نەخۆن بۆ شتێ توشتان بوو لە کوشتن و برینداری، هەتا ئێوە ڕام بین لەسەر خۆڕاگرتن و ئارام گرتن و، خوا ئاگادارە بە شتێ ئێوە بیکەن لە چاکەو لە خراپە و پاداشتتان ئەداتەوە لەسەریان.

( ئەو کەسانەی لە جەنگی ئوحودا لە خزمەت پێغەمبەردابوون دوو تاقمبوون):

١- ئەو کەسانە بوون باوەڕ داری ڕاستی بوون و بڕوایان وابوو ئیسلام سەر ئەکەوێ بەسەر هەموو ئایینەکاندا، چونکە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەواڵی پێدابوون. بەڵام شکانی جارێ یا

زۆرتر نابێتە هۆی بنەبڕبوونی ئیسلام و نەمانی موسڵمانان، لە بارەی ئەو تاقمەوە خوا ڕویان تێ ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ ثُمَ أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ بَعْدِ الْغَمِ أَمَنَةً نُعاساً يغشى طائِفَةً مِنْكُمْ ﴾ لە پاشا خوا ڕەوانەی کرد بەسەر ئێوەدا لە دووای ئەو خەفەتەی توشتان بو ئاسایش و خۆشیێ کە بریتی بوو لەوەنەوزێ تاقمێ لە ئێوەی داگرت و توشتان بوو خەفەتەکەتان نەما. بێگومان خەوتن لە کاتی خەفەتی گەورە دا چتاکترین شتێکە بۆ خەفەتباران.

ئەو تاقمە بریتی بوون لەو کەسانە چاویان بە باوەڕکرابووەوە، وەك ئەبو بەکر. عومەر. عەلی. تەلحە. سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لە کۆچ کەران. حاریسی کوڕی سەمە. سوهەیلی کوڕی حەنیف لە یاریدەران.

٢- ئەو کەسانە بوون لە جەنگی ئوحودا ڕایان کرد و نەگەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەك دوو ڕوەکان کە خوا باسیان ئەکا بەم کارە خراپانە:

أ- ﴿ وَطائِفَةٌ قَدْ أهمتهم أَنْفُسَهُمْ ﴾ وە تاقمێ تریان بە ڕاستی خۆیان خۆیان خستبووە نێو خەفەتەوە ئەو تاقمە وەنەوزنەی گرتن چونکە ترس و خەفەت دای گرتبوون، ئەوانەیش بریتی بوون لە عەبدولای کوڕی ئوبەی. مەتعەب کوڕی قوشەیر و تاقمەکانیان. ئەو ئایەتە ئاماژە ئەکا کە باوەڕی تەواو داوای کاری چاك ئەکا بۆ ئادەمیزاد. ئەو کەسەی هەر سودی خۆی مەبەستێتی و ئەو کەسە باوەڕی ناتەواوە.

ب- ﴿ يَظُنُونَ باللهِ غَيْرَ ظَنِ الْجاهِلِيةِ ﴾ ئەو تاقمە گومان ئەبەنە خوا جگە لە ڕاستی بە وێنەی گومان بردنی کاتی بەر لە هاتنی ئیسلام، گومانیان وابوخوا یارمەتی موحەمەد و موسڵمانان نادا. بڵاویان کردەوە بەدرۆ کە موحەمەد کوژراوە کاری موسڵمانان تەواو بوو نەما، نەیان ئەزانی جەنگ و سەرکەوتن هەر جارێ بۆ لایێکە.

جـ- ﴿ يَقُولُونَ هَلْ لَنا مِنَ الأَمْرِ شيءً ﴾ ئەو تاقمە ئەڵێن: ئایا بۆ ئێمە ئەبێ لەو شتەی خوا فەرمانی پێداوە لە یارمەتی و سەرکەوتن بەشتێ. یانێ ئەو شتانە بۆ ئێمە نابن.

خوای مەزن فەرمانی دا بە پێغەمەری ڕێزدار: وولاّمی ئەو تاقمە بداتەوە کە هیچ فەرمانێ نەبە دەستی ئێوەیەو نەبە دەستی جگەی ئێوە، بە ڕاستی هەموو فەرمانێ بە دەستی خوایە، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ إنَ الأمْرَ كُلَهُ لله ﴾ تۆ بلێ بە ڕاستی هەموو کارو فەرمانێ هەر بۆخوایەو بە دەستی خوایە لە یارمەتی و لەسەر کەوتن، ئێمە هەر بیستن و فەرمانبەرداریمان بەدەستە.

﴿ يُخْفُونَ في أنْفُسِهِمْ مالا يُبْدونَ لَكَ ﴾ ئەیشارنەوە لە دەرونی خۆیانا شتێ ئاشکرای ناکەن بۆتۆ لە دوڕوی. بەدەم ئەڵێن: ئێمە داوای سەرکەوتن ئەکەین، لە دەرونیانا دووڕویی و بێ باوەڕیە.

﴿ يَقولُونَ لَوْ كانَ لَنا مَنَ الأمْرِ شئٌ ما قُتِلْنا ها هُنا ﴾ ئەڵێن لە دەرونی خۆیانا: ئەگەر بۆ ئێمە ببوایە شتێ لەوانە موحەمەد بەڵێنی دابوو بە ئێمە کە سەرکەوتن بۆ خوایەو بۆ ئێمەیە، نەئەکوژراین و نەئەشکاین لەم جەنگەداو ئازارمان توش نەئەبوو.

﴿ قُلْ لَوْ كُنْتُمْ في بُيُوتِكُمْ لَبرَزَ الذينَ كُتِبَ عَلَيْهُمْ القَتْلُ إلى مصنا جِعْهم ﴾ تۆ بلێ بەو دوو ڕووانە: ئەگەر لەنێو خانووی خۆتانا بونایەو نەهاتنایەتە دەرەوەیش بە ڕاستی ئەچونە دەرەوە کەسانێکی ئەوتۆ نوسرابوو لەسەریان کوشتن و خوا بڕیاری دا بۆ بکوژوتن بۆلای جێگەی کوشتنیان و لەناو چونیان، مانەوە یان لە مەدینە سودی بۆیان ئەبوو، چونکە پێش تر خوا بڕیاری دابوو بکوژرێن... خوای مەزن ئەو کارانە ئەکا لەسەرکەوتن و لە شکاندن لە جەنگدا لەبەر چەندین هۆیکی زۆر.

﴿ وَلِيَبْتَلي اللهُ ما في صُدورِكُمْ ﴾ وە بۆئەوەی خوا تاقی بکاتەوە شتێ لە دڵی ئێوەدایەو شاراوەکانی دەربخا لە نیازی پاك و لە دووڕوی بۆ ئادەمیزاد کەواتە ئازاری ڕۆژی ئوحود سەنگی تاقیکردنەوەیە کە باوەڕدارو دووڕوان لەیەك جویێ بکاتەوە.

﴿ وَلُميحص ما في قُلوبِكُمْ واللهُ عَلِيمٌ بذاتِ الصُدُور ﴾ وە بۆ ئەوەی خوا ئاشکرای بکا شتێ لە دڵی ئێوەدایە لە گومان و لە دووڕویی و پاکتان بکاتەوە لە دڵەڕاوکێ و، خوا ئەزانێ بەو شتانە لە دڵانا هەیەو پەنهان دراوە.

ئەگەر ئادەمیزاد بە درێژای تەمەنی بە ئاسایش و بە خۆشی بژین و توشی ئازار و ئێش و ڕوداوی خراپ نەبن، بێگومان ئاشکرایە ئەوەیش لە ئەقڵەوە دوورە. بە ڕاستی ئازار دەروونی ئادەمیزاد پاك ئەکاتەوە. ئارام گرتنە لەسەر ناخۆشی ئادەمیزاد بگەیەنێ بۆلای هەموو ئاواتی خۆی. بە ڕاستی تاقیکردنەوە بەڵگەی داوە بە ئێمە کە جەنگاوەران و ڕامیار پیشەو بازرگان و جووتیارو هونەرمەندو کرێکار ئەوانە هەموویان ناگەن بە ئاواتی خۆیان بە جگەی خۆ ڕاگرتن و ئارام گرتن لەسەر ناخۆشی و ئازارو ماندوبون.

ئەگەر زۆر بە قوڵی بۆی داچین بۆمان ڕوون ئەبێتەوە هۆکانی ژێر کەوتن لاوازی و ترس بێ ئارامیە. هەموو کەس لە ژیانی خۆیا توشی زۆر ئازارو گیرگرفت بووە، بڕوای بە تینی پەیدا کردووە ئارام گرتن زۆر شت بۆ مرۆڤ ئەڕەخسێنێ، بۆیان دەرکەوتووە ژیری و زیرەکی سودبەخش نین بەبێ ئارام گرتن و خۆڕاگرتن.

خوای مەزن ڕوئەکاتە ئەو کەسانەی بێ فەرمانی پێغەمەر ئەکەن، بە تایبەتی تیر هاوێژەکان جێگەی خۆیانیان چۆڵ کردو وایان زانی کە بێ باوەڕان توشی شکانی یەکجاری بوون و ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لە ئێوە پشتیان کردە جەنگ و شکان و ڕایان کردو وازیان لە پێغەمەر هێنا لەو ڕۆژەدا ئەو دوو کۆمەڵە بەیەك گەیشتن و بەرانبەری یەك وەستان لە باوەڕداران و بێ باوەڕان لە جەنگی ئوحودا. باوەڕداران پەرتە وازەبون بە پەرێشانی.

﴿ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا ﴾ بە ڕاستی شەیتان ئەو کەسانەی خستە نێو هەڵەو لاوازی بە هۆی شتێ کردبویان لە بێ فەرمانی پێغەمەرو چۆڵ کردنی ئەو جێگەیە بۆیانی دیاری کردبو.

﴿ وَلَقَدْ عَفا الله عَنهُمْ إن الله غَفُورٌ حَلِيمُ ﴾ وە بە ڕاستی خوا لەوان خۆشبوە گوناهەکانیانی لابرد لەسەریان، بە هۆی پەشیمان بونەوەیان. بە ڕاستی خوا لێی بوردنی زۆرە بۆ گوناهباران، لەسەر خۆیەو کوتوپڕ سزای تاوان باران نادا.

بۆ زانین ئەو ئایەتە تیر هاوێژان و جگەی ئەوانیش ئەگرێتەوە کە هەڵهاتن لە باوەڕداران. ئەو کەسانە ناگرێتەوە بەردەوامن لەسەر دووڕووی، چونکە لەو دووڕوانە خۆشنابێ و، دوڕوی زۆر گەوترە لە بت پەرستی ئاشکرایی.

پاش ئەو شتانەی باسکران خوای مەزن قەدەغە ئەکا لە باوەڕداران چاو لە گفتوگۆو کردەوەی دوو رووان نەکەن و نەیان کەن بە پێشەوای خۆیان و ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْۗ وَٱللَّهُ يُحْيِۦ وَيُمِيتُۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾

﴿ یا أیها الذینَ أمنوا لا تَکونُوا کَـالذینَ کَفَـروا ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێناوەو مانەوەی جیهان لـە خـواۆ ئەناسـن: ئێـوە وەك کەسـانێکی ئـەوتۆ مـەبن باوەڕیـان نەهێناوە، وێنەی دووڕووان بە تایبەتی عبدولاّی کوڕی ئوبەی و تاقمەکەی.

﴿ وَقالوا لأخْوانِهِمْ إذا ضرَبوا في الأرْضِ ﴾ وە ئـەیان ووت بـە براکـانی خۆیـان، کـە مردبون لـە کاتێ گەڕابوون بە زەویـدا بـۆ بازرگـانی و پێویسـتی ژیانیـان و ئـەمردن لـەو کاروانەدا.

﴿ أوْکانُوا غُزّیً لَو کانوا عِنْدَنا ما ماتُوا وَما قُتِلُوا ﴾ یا جەنگاوەر بونایـەو بچونایـە بـۆ جەنگ و بکوژرانایە لەو جەنگەدا: ئەگەر ئێوە لای ئێمە بونایە و نەچونایـە بـۆ کـاروان و جەنگ ئەوانەن ئەمردن و نەئەکوژران... مەبەست لـە براکانیان برای پشتی نیـە بـە تەنـها. بەڵکو برای ئایینی و و بیروباوەڕو برای پیشەیی و جگەی ئەوانیش ئەگرێتەوە.

بێ باوەڕان و دوو ڕوەکان لایان وابوو کاروان و جەنگ ئەوانی مراندوەو کوشتوونی. نەك خوا مراندونی و کوشـتونی لـە کـاتی دیـاری کـراو بۆیـان، بۆیـە خـوای مـەزن بـە موسڵمانان ئەفەرموێ ئێوە وەك ئەو بـێ باوەڕانـە مـەبن، پێویسـتە ئێـوە وابزانـن مـردن و کوشتن لەهەر جێگەیێ بە ویستی خوایەو کاتی بۆ دیاری کردوە... ئێـوەی بـاوەڕدار وەك بێ باوەڕان مەبن لـە گفتوگۆو کرداریان.

﴿ لِیَجْعَل الله ذلِكَ حسْرَةً في قُلُوبِهِمْ ﴾ هەتا خـوا بگـێڕی ئـەو لـەیـەك نەچونـەتان بـە خەفەت لـە دڵی بێ باوەڕاندا و لـە دەرونیانا ئەگەر وەك ئەوان وابن ئـەوان کـەیف خـۆش ئەکا.

﴿ والله یُحْیي وَیُمیتُ والله بِما تَعْلَمونَ بَصیرٌ ﴾ وەخوا بە زیندوویی ئەهێڵێتەوە کـاروان کەران و جەنگاوەران و، ئەمرێنێ دانیشتوان و جەنگ نەکەران، جەنگ و کاروان دەوری نیەو هەموو شتێ بە دەستی خوایەوە خـوا ئـەبینێ شـتێ ئێـوە بیکـەن و ئـەیزانی پاداشـتی کردەوەی خۆتانتان ئەداتەوە لە چاك و خراپیان.

﴿ وَلَئِنْ قُتِلْتُمْ في سَبیلِ الله أوْ مُتُمْ لِمَغْفِرَةٌ من الله وَرَحْمَةٌ خَیرٌ مِما یَجْمَعُونَ ﴾ وە ئەگـەر ئێوە بکوژێن لـە ڕێگەی جەنگ کردن بۆ خوا یا ئێوە بمرن لـە خانەی خۆتانا بە ڕاستی لێـی

خۆشبونی خواو بەزەیی و میهرەبانی خوا چاکترە لەو شتەی ئێوە کۆی بکەنەوە لە سامان و پلەو پایەو خواردەمەنی و کۆشك.

هەموو کەسێ بەرگری لە ڕاستی بکا یا بەرگری لە خۆی بە چەکێ یا بە پێنوس یا بە زمان و لەو ڕێگەدا بکوژرێ ئەو کەسە لە ڕێگەی خوادا کوژراوە. هەموو کەسێ خۆی ماندو بکاو خەبات بکا لەبەرگوزەرانی خۆی و خێزانی یا بۆ فێربوونی زانست و زانیاری یا بۆ هەر ڕێگەیەبێ سوود ببەخشێ بە ئادەمیزاد بە ڕاستی لە ڕێگەی خوادا ئەمرێ، هەموو کەسانێ بەو جۆرانە بن شایانی لێ بوردنن لەلای خواو شایستەی پلەی بەرزن لە هەردوو جیهاندا.

﴿ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى اللهِ تُحْشَرُونَ ﴾ وە ئەگەر ئێوە بمرن یا بکوژرێن بە ڕاستی ئێوە هەربۆ لای خوا ئەگێڕرێنەوە. ئەوەیە پاشە ڕۆژی ئادەمیزاد، ئیتر یەکسانە ئایا گیان بە کوشتن دەرچێ لە لەشدا یا بەشتێ تر ئادەمیزاد پاداشت وەرئەگری بە وشتەی کردویتی، ئەگەر چاکبێ چاکەی ئەدرێتێ، ئەگەر خرا بێ خوا خراپە بە پاداشتی ئەوە مرۆڤێ ژێر ئەو کەسەیە خۆی ئامادە بکا ئەمڕۆ بۆ پاشەڕۆژ، خۆی گێل نەکا بە گفتوگۆ: ئەگەر وابوایە. یا ئەگەر وابێ ، خوای مەزن لە ئایەتەکانی پێشوودا ڕوی کردە هاوڕێکانی پێغەمەر (د.خ) لەمەوپاش ڕوو ئەکاتە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. لە باسەکانی ڕابوردودا بۆمان دەرکەوت کە هاوڕێکانی پێغەمەر لە جەنگی ئوحودا هەندێکیان بێ فەرمانی پێغەمەریان کرد، بەو بۆنەوە گوناهباربون و شکان و پێغەمەریان بە بریندارى بەجێهێشت. لەو کاتە ناسکەدا کە جەنگ هێشتا کۆتایی پێ نەهاتبوو تاقمێکی زۆرکەم لە خزمەتیا مابوونەوەو خۆیانیان ڕاگرت و هەڵنەهاتن، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بانگی هەڵهاتوانی کردو فەرموی: وەرنەوە بۆلای من و فروستادەی خوام ماوم و نەکوژراوم.

پاش کۆتایی جەنگ موسڵمانان گەڕانەوە بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کەچی پێغەمەر سەرزەنشتی نەکردن لەگەڵ ئەوەشدا شایانی زۆر شتبوون، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چاوپۆشی لێ کردن و سەرباری ئەوەیش بە گەرمی خۆش و تاوازەی لەگەڵ کردن، بە نەرمی لەگەڵیانا

کەوتە گفتوگۆ، ئەو نەرمیەی پێغەمەر لەگەڵ ئەوان بوو بە هۆی یارمەتی و خۆڕاگرتنیان لە پاشە ڕۆژدا، کە ڕەوشتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە بەندەیەکی خوایە وابێ، بێگومان خوای مەزن میهرەبانی و بەزەیی زۆر ترو بێ ئەندازەیە لەگەڵ بەندەکانی خۆیا.

خوای مەزن گۆشەیە لە میهرەبانی و بەزەیی پێغەمەر لەگەڵ پەیڕەوانی باس ئەکاو ڕوئەکاتە پێغەمەر ئەفەرموێ:

فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ ۗ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾

﴿فَبِما رَحْمَةٍ مِنَ اللهِ لِنْتَ لَهُمْ﴾ نەرمی تۆو ئاسانی ڕەوشتی تۆ بۆ هاوڕێ هەڵهاتوەکانت و توڕە نەبونت لەوان بە هۆی یاریدانی خوایە بۆتۆ. زۆر جێگەی سەر سوڕمان و شانازیە بۆتۆە.

﴿ وَلَوْ كُنْتَ فَظاغَلِيظَ الْقَلْبِ لا نَفْضَوُا مِنْ حَوْلِكَ ﴾ وە ئەگەر تۆ ڕودر ژووشك بوتیایە و دڵ ڕەق و ڕەوشت خراپ و کەم ئارام بویتایە بە ڕاستی هاوڕێکانت لە دەوری تۆ نەئەمان و پەرتەوازە ئەبوون و کاری تۆ تەواو نەئەبوو پەیامی تۆ بلاّوەی نەئەسەند.

بە ڕاستی لە ناردنی پێغەمەر ڕانموبی خەڵکە بۆلای ڕاستی، ئەوان گوێی لە کەسێ ئەگرن دڵیان مەیلی بۆلای بێ دەرونیان ئارام بگرێ، دەرونیش مەیلی بۆلای یەکێ ئەبێ دڵێکی نەرم و خاوەن بەزەیی هەبێ، بە وێنە دڵی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ بگرە بۆ هەموو بونەوەران فەرمانی داوە بە بەزەیی لەگەڵیان.

﴿ فَأعْفُ عَنْهُمْ وَأَسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ ﴾ دوای تۆ ببورە لە هەڵەی هاوڕێکانت لە ڕۆژی ئوحودا، داوای لێ بوردن بکە بۆ ئەوان لەخوا کەلای تۆیان چۆڵ کرد بە برینداری، وە تۆ ڕاوێژ و پرسیان پێ بکە لەو کارانەدا ئەتەوێ بیان کەی. بە تایبەتی کاری جەنگ کردن هەتا دڵیان خۆش بێ. ئەو فەرماندانە بە ڕاوپرس پێویست نیە. بەڵکو چاکە ڕاوێژ بکرێ.

بەهەر جۆرێ بێ بیروباوەڕو یاسای ئایین بە ووشە لەلای خوایەوە، هیچ کەسێ بیروڕای تێدا نیە هەتا پێغەمەریش، چونکە ئەو ڕاگەیەنەرە یاسا دانەر نیە ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ مِنَ الأَمِرِ شيءً إنما أَنْتَ مُنْذِرٌ ﴾ بۆتۆ نیە هیچ شتێ لە کاروکردەوەی ئادەمیزاد بە ڕاستی تۆ ترسێنەری ئەوانی و بەس.

﴿ فَأذا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلى اللهِ لإن اللهَ يَحِبُ الْمُتَوَكِّلِيْنْ ﴾ دوایی کاتێ تۆ ویستت و بیرت بەسترا لەسەر کردنی شتێ بە هۆی ڕاوێژو پرسەوە یا بەبێ پرس و ڕاوێژ بڕۆو بیکە و دووایی تۆ پشت بەستبە بە خوا، وە تۆ ئامادە بکە چەك و تفاق داوای یارمەتی لە خوا بکە بۆسەر کەوتن. بە ڕاستی خوا ئەو کەسانە پشت بە خوا ببەستن خۆشی ئەوێن.

﴿ إن يَنْصُرْكُمْ اللهُ فَلا غالِبَ لَكُمْ ﴾ ئەگەر خوا یارمەتی ئێوە بدا، وەك یارمەتی ئێوەی دا لە جەنگی بەدرا، دوایی هیچ کەسێ زاڵ نابێ بەسەر ئێوەدا ، چونکە خوا یاریدەرتانە بە مەرجێ خۆ ڕاگربن. بەڵام پاش یارمەتی خوا پێویستە ئێوە ئاماە بکەن ئەوەی تواناتان هەیە لە چەك و تفاق ﴿ وَأَعِدّوا لَهُمْ ما أَسْتَطَعْتُمْ ﴾.

﴿ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذا الَّذي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ وَعَلى اللهِ فَلْيَتَوَكَلْ الْمُؤْمِنِيْنَ ﴾ وەئەگەر خوا ئێوە ڕسوا بکاو یارمەتیتان نەدا لەو کاتانەدا تووشی جەنگ ئەبن، دوایی چ

کەسێکە یارمەتی ئێوە بدا لە دوای یارمەتی خواو، هەر ئـەبێ لەسـەر خـوا پشـت بەسـتین باوەڕداران، پوختەی مانای ئەو ئایەتانە بەم جۆرەیە: بە ڕاستی ئامـادەکردنی چـەك و تفـاق بەبێ نیازو پیشتوانی خوا سوود بەخشنابێ، هەروەك نیازی پاکیش بەبێ چەك بێ سوودە بە گوێرەی تاقی کردنەوەی ڕوداوەکان. بەڵام هەرکەسێ خاوەنی هـەردوو لایانبـێ هـەرگیز ژێرناکەوێ، چونکە خوا لـە گەڵیانـە خـوای مـەزن لـەو دوو ئایەتـەدا باسـی پێغەمـەری ئیسلامی فەرموو کە ئەو میهرەبانی و یارمەتیەی پێ بەخشیوە. کەواتە وا چاکە بـۆ ئێمـە و بگرە پێویستە و شایانی ئەو پێغەمەریە ئێمە باسی ژیانی بکەین لـە مـاوەی تەمـەنیا و بزانـین ڕەوشتی ئاشکراو نهێنی ئەو پێغەمەرە چۆن بووە.

١- عەبدوڵا کوڕی عبدولموتەلیبی باوکی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چو بۆ بازرگـانی لـە شـام و لەو کاتەدا ئامینەی دایکی پێغەمەر، پێغەمەری لە سکدا بوو، باوکی لەوسەرەوە گەڕایـەوە چوو بۆ مەدینە بۆ دیدەنی خالۆانی پێغەمەر، لەوێ نـەخۆش کـەوت بـەبێ سامان کۆچـی دوایی کرد، جگە لە پێنچ هوشترو چـەند سـەرێ مـەڕو کارەکـەرێ بـە نـاوی بورکـەی حەبەشی هیچ شتێ تری بۆ پێغەمەر بەجێ نەهێشت، پاش لە دایکبوونی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بـە ڕێکەوتی (١٢) ڕەبیعی یەکەم لە ساڵی (٥٧٠) زایینی.

٢- پاش لە دایکبوونی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ بـۆ چـەند ڕۆژێ سـویبەی کارەکـەری ئـازاد کراوی ئەبو لەهەب شیری دایە، لە پاشا حولیمەی سەعدیە بردی بۆلای خـۆی بـۆ لادێ بو بە دایەنی و شیری دایە هەتا لە شـیر بڕایـەوە. پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ (٦٣) سـاڵ ژیـاوە، لـە تەمەنی (٤٠) ساڵیدا کرا بە پێغەمەر (٥٣) ساڵ لە مەکە بووە، دووایـی کۆچـی دوایـی کردووە بۆ مەدینە (١٠) ساڵ لە مەدینە ماوەتەوە، لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، لە مەدینە لەشی پیرۆزی نێژراوە. لە تەمەنی (٦) ساڵیدا دایکی پێغەمـەر کۆچـی دوایی کردووە، دوایی عبدولموتەلیبی باپیری بـە خێـوی کـرد، لـە تەمـەنی (٨) سـاڵیدا باپیریشی کۆچی دوایی کرد، لە پاشا ئەبو تالیبی مامی بەخێوی کرد، بە یەکـەوە مانـەوە هەتا پێغەمەر تەمەنی بو بە (٤٣) ساڵ لـەو کاتەدا ئەبوتالیبیش کۆچی دوایی کرد.

٣- شێوەی دەرەوەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بالاّی نە درێژو نەکورت و میانە بالاّ بووە. سەری پیرۆزی گەورەو، ڕومەت و دەم و چاوخڕ. تەوێڵی پان و ڕێك و پێك، برۆکانی نزیك پەیوەستبوون، چاوی دەمارێ لە نێوانیابووە کاتێ ڕقی هەڵسایە بەرز ئەبووەوە، هەردوو چاوانی ڕەش، پێڵوی چاوی سوور. کەوانە لوت. پوك شیرین و جوان. دەم گەورەو شیاو. ڕیش گەورە. موی سەری شەپۆلاوی و خاوەن جوڵە. مل بەرز. سنگ پان. قۆڵەکانی درێژ، هەردوو قاچی باریك ڕەنگی سپی و مەیلەو سور. دەمار توندو تۆڵ. لەشی خوارو خیچی تێدا نەبوو. کاتێ تووڕە ببوایە ڕەنگی سوور هەڵئەگەڕا. لە کاتی خەفەتا دەستی ئەهێنا بە ڕیشیا. لە کاتی گفتوگۆدا ئاماژەی بە هەموو ناو لەپی ئەکرد. لە کاتی سەر سوڕماندا دەستی وەرئەگێڕا و نێو لەپی ئەخستەوە بەرەو خۆی، درێژەی بدایە بە گفتوگۆ ناو لەپی ڕاستی ئەدا لە پەنجە گەورەی چەپی. هەرکاتێ شتێکی خراپی ببینایە ڕووی وەرئەگێڕاو کاتێ بپیژمیایە دەمی خۆی دائەپۆشی پێ ئەکەنی و دگانی پێشەوەی دەرئەکەوت. زەردەخەنەی زۆر بووە. هیچ خواردەمەنێکی نەگێڕاوەتەوە. خۆی بۆ خواردەمەنی مانوو نەئەکرد. بۆ خواردەمەنی خۆڕاگر بووە بەجۆرێ بەردی ئەنایە سەر سکی لە برسانا. کاتی وا بوو مانگێ ئەڕۆیشت و نان لە خانەیدا دەست نەئەکەوت و ئارامی ئەگرت. وایشبووە ناردوێتی بۆلای جولەکەکان شتێکی بدەنێ بە قەرزو نەیان ئەدایە بە بیانوی ئەوە موحەمەد خاوەنی دارایی نیە بۆبژاردنی. هەرگیز خاوەنی دوو دەست بەرگ و پۆشاك نەبووە. تەنها یەك حەسیری هەبوە بە ڕۆژ دای ئەخست و بەشەو لەسەری ئەخەوت. کاتی وابووە ئەو خەسیرە شوێنی لە لەشیا دیاری ئەکرد. خاوەنی یەك پشتی بووە بەگەڵای خورما پڕی کردبوو. پێلاو کراسی خۆی بینە کردووە دوربوێتەوە. سواری گوێ درێژ بووە. لەگەڵ ئەوانە هەموودا خاوەنی کۆکراوەی دارایی نیو دورگەی عەرەب بووە. هەر سامانێك و دارایی بۆ بهاتایە هەمووی ئەبەخشی، هەرگیز لە هەژاری نەترساوە.

٤- پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەرچەندە خاوەنی سامان و دارایی نەبووە وە کۆی نەکردونەتەوە، بە هەژاری ڕازی نەبووە وە خۆی نەیویستووە، هەرگیز هەژاری لا بەرێز نەبووە. بگرە زۆر

جاران پەنای گرتووە لە هەژاری. بەلام لەبەر ئەوەی لەنێو کۆمەلگەیەکی هەژاردا ئەژیا چاکترین پەیرەوی دانا بۆ هەموو کاتێ کە کاربەدەستان لایەنی هەژاران بگرن، یەکسانبن لەگەلیانا لە خواردن و خواردنەوەو بەرگ دانیشتن، هیچ ستەم و تاوانێ لەوە گەورەتر نیە کار بەدەستان تێر بن و لەنێو ژێر دەستەکانیدا برسێکی تەنها هەبێ.

٥- پلەی بانگەوازی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ یەکەم جار لە خزم و هۆزی نزیکی خۆیەوە دەستی پێ کردووەو ترساندونی لە سزای خوا. پاش خزمەکانی هەموو هۆزی نەتەوەی عەرەب، دوایی نەتەوەکانی تری جگەی عەرەب، چونکە خوا فەرمانی پێ داوە بۆسەر هەموو ئادەمیزاد نێرراوی و میهرەبانیت بۆ هەمویانە. بانگەوازیت بەردەوامە بۆ هەموو جیهان هەتا هەتایە بەلام پێغەمەرانی تر هەریەکەیان بۆ گەلێك و تاقمێکی تایبەتی نێردراون. ئەوە بوو بە گوێرەی فەرمانی خوا نوسراوی بۆ زۆربەی پاشاو سەرۆکەکانی جگەی عەرەبیش نارد. بە تایبەتی کیسرای پاشای فارسەکان و قەیسەری پاشای رۆم بۆ وەرگرتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، هەتا بەو بۆنەوە توشی سزای خوا نەبن و رزگاریان ببێ لە هەلگرتنی گوناهی گەلەکانیان.

٦- گەورەترین وێنەی نهێنی بۆ گەورەیی و رێزداری پێغەمەری ئایینی ئیسلام ئەمەیە : ئەو کەسەی لای وابێ موحەمەد دروست کەرو رۆزەدەری ئادەمیزادە بەبێ باوەڕ و خوا نەناس دائەنرێ . ئەوە لەلایەکەوە ، لەلایە ترەوە ، ئەبێ وابزانرێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە هەموو ئادەمیزادیش وێنەی ئەو نین لەهەمو روێکەوە ، گەورە ترین کەس لەئادەمیزاد ئەمەیە بریار بۆ گەورەیی و رێزی موحەمەد بدا بەزمان و بەدڵ بەئاشکرا و بەشێوازە گشتیەکانیەوە وەنابێ پێغەمەر وەك یەکێ لەپیاوە گەورەکان و زانا سود بەخشەکانی سەر زەوی دانرێ ، پێویستە هەموو زانایان بەناونیشان و ئەدرەس پێغەمەر بەگەورەترین کەسی سەرزەوی دابنێن بەزمان و بەدڵ و بریاری بۆ بدەن .

٧- نیشانەی گەورەیی و رێزی پیێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەمەیە : خەفەتی بۆ ناخۆشی و ئازاری هەموو ئادەمیزاد خواردووە ، زۆری لەهیچ کەسێ نەکردووە لەخزمەکانی و لەبێگانە

خەفەتی بۆ بخۆن و خۆیان تووشی ئازار بکەن ، لەگەڵ بێوەژنـان و هـەژاران بەخۆشیەوە ئەچوو بەرێگەوە و هەر پێویستی‌یەکیان ببوا یە بەپێی توانـا بۆیـانی جـێ بـەجێ ئـەکرد . پاسەوان و قاپیەوانی نەبووە ، پرسگەی نەبووە و رێگە لەکەس نەگیراوە بچێتـە خزمـەتی . دوژمنان و دۆستانی خۆی بـەبێ جیـاوازی چـاودێری کـردوون ، هەریەکـەیان بـەجۆری شیاوی خۆیان .

ئەو کارە گەورانە لەناخی دەروونی پێغەمەرەوە هەڵقوڵاوە و ناوەڕۆکی یاسـای ئـاینی ئیسلامن ، نەك خزمایەتی و شوێنەوار و لاسایی پاڵیان نابێ بەپێغەمـەرەوە ﴿ﷺ﴾ . بـەزەیی و میهرەبانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ تەنها بۆ خزم و پەیرەوانی نەبووە ، بەڵکو هـەموو ئـادەمیزادی گرتۆتەوە لەدۆست و دوژمن و خزم و بێگانە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ وێنەی ئاوو و هەوایـە بـۆ ئاسایشی بونەوەران ، بۆ نمونەی دوژمنانی خـۆی ڕومـەت و چـاوی پێغەمـەریان برینـدار کردو و ددانێکی پێغەمەریان شکاند ، لەجیاتی ئـەوەی نـزای خراپـەیان لێ بکـا ، لـەخوا پاڕایەوە ڕانموییان بکا ، چونکە ئەوان نەزان و نەخوێنەوارن بۆیە ئەو کارانە ئەکەن .

بێگومان کەسێ خوا دروستی کردبێ بۆ ئەمە کەهەموو ڕەوشتی بەرز و داد پەروەری و ئاسایش و بەزەیی بچەسپێنێ بۆ سوودی ئادەمیزاد ئـەبێ خـاوەنی ئـەو کـارە شیاوانەبێ ، جارێ مرۆڤێ بەپێغەمەری ووت : ئەی لەهەمووومان گەورەتر کوڕی لەهەمووومان گەورەتر، ئەی کەسێ کەلەهەمووومان چاکتری و کوڕی لەهـەمووومان چاکـتر ، لـەوەڵامدا پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ فـەرمووی : شـەیتان شـپرزەتان نـەکا و سـەرتان لێ تێـك نـەدا وا بزانـن کـەمن موحەمەدی کوڕی عەبدوڵام فروستادەی خوام ، سوێندم بەخوا پێم ناخۆشە بەجگەی پلەی خۆم بەرزم بکەنەوە و بـانگم بکـەن . هاوڕێکـانی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ لەبـەری هەڵنەئەسـان ئەیانزانی زۆری لا گرانە هەڵسان لەبەری ، هەرکاتێ هاوڕێکانی پێغەمەر لـەدواوە بهاتنایـە دەستی ئەگرتن و ئەی خسـتنە لای شـانی خـۆی و بەیەکـەوە ئەڕۆیشـتن . بێگومـان ئـەو کەسەی پێویست کرابێ لەسەری هەموو ئادەمیزاد بانگ بکات بۆ لای خوا پەرستی ئـەبێ شێوە و کاری بەو جۆرە بێ .

ئەو شتانەی نووسران و ڕابوردن لەشێوە و ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زۆر کەمە بۆ شایانی پلەی پێغەمەر ، بەڵام مشتێ نمونەی خەروارێکە ، هەر کەسێ خۆی هەڵکێشێ و بلێ : من پەیڕەوی ئەو پێغەمەرەم و پێغەمەر پێشەوامە ئەبێ چاو لەو بکا ، ئەو کەسەی بەدەم ڕەوشتی پێغەمەرەوە نەچێ ، بەخاوەن فێڵ و درۆزن ئەژمێرێ ئیتر خۆیان هەستی پێ بکەن یان هەستی پێ نەکەن باجگەی خۆیان بەپیاو چاکیان دابنێن و لای خوا هەموو شتێ ڕوونە .

ئەگێڕنەوە کاتێ تیر هاوێژەکان جێگەی خۆیانیان چۆڵ کرد لەجەنگی ئوحودا ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی من پێم ڕاگەیاندن جێگەی خۆیان چۆڵ نەکەن بەبێ فەرمانی من، تیر هاوێژەکان وەڵامی پێغەمەریان دایەوەو وتیان : ئێمە ترساین کەپێغەمەر بفەرموێ هەر کەسێ شتی گرت لە بێباوەڕان بۆ خۆیەتی و بەش ناکرێ لەنێو جەنگاوەراندا بەگشتی ، وێنەی جەنگی بەدر، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئایا گومانتان وایە کەمن دەسکەوتی تاڵان لەئێوە ئەشارمەوە ؟ بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوای مەزن ئەم ئایەتانەی خوارەوەی نارده خوارەوە و فەرمووی :

وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَن بَاءَ بِسَخَطٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾

لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو چوار ئایەتانە ، زانایان زۆر شتیان باس کـردووە ، ئەوەی جێگەی باوەڕی زۆریانە ، ئەو هۆیەیە بەر لەنووسینی ئایەتەکان باسی کرا .

﴿ وَما كانَ لِنبيٍّ أن يغلَ ﴾ وەشایستە نی‌یە بۆ پێغەمەر نادروستـی بکـا لەگـەڵ ئۆمـەتی خۆی و تالآنی بشارێتەوە لەوان ، کاری بەو جۆرە و پێغەمەرایەتی کۆ نابینەوە بەیەکـەوە ، ئەوکەسانەی بەشداری جەنگبن بەیەکسانی تەماشا ئـەکرێن لەهـەموو ڕوێکـەوە ، پێغەمـەر لەهەموو گوناهێ پارێزراوە ، گونجاوی ئەو نی‌یە هەرگیز نادروستی بکا .

﴿ وَمَنْ يغلل يَـأتِ بِمـاغلّ يَـومَ القيامَـةِ ﴾ وەهـەر کەسـێ نادروسـتی بکـا لـەڕۆژی هەڵسانەوە لەگۆڕەکان دێت بەشتێکەوە نادروستی تێدا کـردووە بەسـەر پشـتیەوە هـەڵی گرتووە .

﴿ ثُمَّ توفى كُلّ نَفسٍ ما كَسَبَتْ وَهُمْ لا يُظلَمُون ﴾ لەپاشـا ئـەدرێ بەهـەموو کەسـێ پاداشتێ کردوێتی لەچاك و لەخراپ و ، ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ لەکاتی وەرگرتنی ئەو پاداشتانە نەبەکەم و نەبەزۆری .

﴿ أفَمَنْ إتَبَعَ رضوان اللهِ كَمَنْ باءَ بِسخطٍ مِنَ اللهِ وَمَـأواهُ جَـهَنَمَ وَبِئسَ المَصيرُ ﴾ ئایـا دوایی کەسێ دوای ڕەزا بوونی خوا کەوتبێ بەپەرستن و از هێنان لەکاری نادروست وەك کەسێ وایە گەڕابێتەوە بەخەشم و نارەزایی خوا و شایستەی سزا بێ و جێگەی دۆزەخبێ ، بێگومان وەك یەك نین و ، خراپ جێگەی گەڕانەوەیە دۆزەخ بۆ ئـەو کەسـەو چارەنوسـی ئەوە .

﴿ لَهُمْ دَرَجاتٌ عِندَ اللهِ وَاللهُ بصيرٌ بَما يَعمَلُون ﴾ ئەو کەسانە پەیڕەوەی ڕەزایەتی خوایان کردووە و ئەو کەسانەیش بەخەشم و نارەزایی خوا گەڕاونەتەوە خاوەنی چەندین پلەی جیاوازن لای خوا ، یەکەمیان پاداشتی گەورە یان ئەدرێتێ ، دووهەمیان سزای ئازارداریان ئەدرێ ، هەروەها ئەوانەی دوای ڕەزامەندی خوا کەوتوون ، پلەکانیان جیاوازن ، هەیانە پلەیان زۆر بەرزە ، هەیانە پلەیان مام ناوەندی‌یە ، هەیانە نزمە ، یاخی بوانیش پلەیان جیاوازە لەنێو یەکتردا بۆ سزادانیان و ، خوا ئەزانێ بەشتێ ئێوە بیکەن و بەگوێرەی پلەکانیان پاداشت و تۆڵە وەرئەگرن .

ئەو کەسانەی مێژووی بەسەرهاتی مووسولمانانی خوێندبێتەوە بۆی دەرئەکەوێ بەڕاستی یاسای ئیسلام و فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کاری گرنگی خۆیانیان کردووە ، جێگەی خۆیانیان لەدڵ و دەروونی موسولمانانا دیاری کردووە ، کۆمەڵ و نەتەوەیکیان پێك هێناوە و بێ وێنەن لەسەر زەویدا ، نوێنەر و نمونەن بۆ وەرگرتنی ڕەوشتی هەرەبەرز و چەسپاندنی لەنێو کۆمەڵدا . بەڕاستی سەربازێکی سادە لەنێو لەشکری ئیسلامدا تالانێکی یەکجار بەنرخ و خاوەن بایەخی دەست ئەکەوێ و نایشارێتەوە و ئەی هێنێ بۆ سەرکردەکەیان و ئەیخاتە نێو خەزێنەی گشتی موسولمانان و بیر لەوەناکاتەوە پەنهانی بدا .. بۆ نمونە کاتێ موسولمانان مەدائینی پایتەختی ئاگر پەرستەکانیان گرت ، بە سەرۆکایەتی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس ، سەعد سەربازێ لەموسولمانانی بەناوی عومەری کوڕی موقرینی دانا بوو بۆ وەرگرتنی کەل و پەل و تالانی بێ باوەڕان ، یەکێ لەسەربازەکانی موسولمانان هات بۆ لای عومەر و دووو پەیکەری دایە دەستی عومەر هەتا بیخاتە نێو خەزینەی گشتی موسولمانان ، یەکێك لەو پەیکەرانە ئەسپێك بوو لەزێڕ نەخشێنرا بوو بەزمروت و یاقوت ، پەیکەری دووەهەمیان هوشترێ بوو لەزیو ڕازێنرابووەوە بەیا قوت و لەغاوەکەی زێڕی ڕازانراوە بوو بەگەوهەر ، ئەو دوو پەیکەرانە کیسرای پاشای ئێران لەسەر تاجەکەی دای ئەنان . ئەو کاتە عومەر ئەو دوو پەیکەرەی وەرگرت زۆر سەرسام

بوو ووتی: وێنەی ئەمانە نەبینراوە ، هەموو ئەو شتانەی وەرگیراون کێشی ئەمانە نین بگـرە کەمتریشن لەبەهادا . بەوسەربازەی ووت تۆ چ کەسـێکی ؟ لـەوەڵامدا ووتـی : هـەواڵی خۆمت نادەمێ و من نەبۆ تۆم کردووە و نەبۆ هیچ کەسێ ، بەڵام من هەر سوپاسـی خـوا ئەکەم و بەپاداشتی خوا دڵخۆشم و نامـەوێ کـەس باسـم بکـا . پشـتی کـردە عومـەر و ڕۆیشت ، عومەر مرۆڤێکـی خسـتە دوای و پرسـیاری کـرد لـەهاوڕێکانی ئـەو پیـاوە چ کەسێکە ؟ ووتیان عامیری کوڕی قەیسە . کەواتە کە ئیسلام چووە نێو نـاخی دڵـەوە ئـەو دڵە بەدەیان شتی سەر سوڕێنەری لێ پەیدا ئەبێ . موسوڵمانان لەمەوبەر بەم شێوەیە بوون ، بۆیە توانیویانە لەماوەیەکی کەمدا دوو کیشوەری زۆر گەورەی ئەو کاتـەی وەك ئـێران و ڕۆم بێننە ژێر ئاڵای پاکی ئیسلام و گەلەکانیان لەستەمی کاربەدەستانی ئەو کاتە ڕزگاریان کردن ، بێگومان گیا لەسەربنجی خۆی ئەڕوێ و درەختی چاك میوەی چـاك ئەڕەخسـێنێ پاش باسکردنی ئـەو کەسـانەی لەئایەتـەکانی پێشـوودا باسـکران ، خـوای مـەزن باسـی گەورەترین بەخششی خۆی ئەکا بەسەر هەموو ئـادەمیزادا بەگشـتی و بەسـەر بـاوەڕداران بەتایبەتی و ئەفەرموێ :

﴿ لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴾ بەڕاستی خوا چاکەی ڕژاند بەسەر باوەڕدارانا بەتایبەتی و بەسەر بونەوەراندا بەگشتی بۆ ڕانموویی کردنیـان . لەبەرئـەوەی بـاوەڕداران زۆرتـر سـود وەرئەگرن ناویان براوە .

﴿ إِذْ بَعَثَ فِيهِم رسو لاً ﴾ کاتێ خوا ڕەوانەی کـرد لەڕەگـەز و پشـتی خۆیـان هـەتا بەباشتر لەزمانی بگەن بەئاسانی و جێگەی باوەڕیانە ، چونکە ڕاست گۆیی و دەست پـاکی ئەو لایان ڕوون و ئاشکرایە و چاکی ئەناسن .

﴿ يَتْلُوا عَلَيهِمْ آياتِهِ وَيُزَكيـهم ﴾ ئەخوێنێتـەوە بەسـەریانا ئایەتـەکانی خـودا ، پاکیـان ئەکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی سر وشـتیان بـەناوی یاسـای بـەرزی ئیسـلام ، بەبەخشـینی زەکات دەرونیان پاك ئەکاتەوە و بەرەخساندنی کاری چاك بۆیان چاکتر پاکیان ئەکاتەوە .

﴿ وَيُعَلِمُهَمْ الكِتاب وَالحِكمةَ وَإنْ كانوُا مِنْ قَبلُ لَفي ضَلالٍ مُبينٍ ﴾ وەفێری ئەوانی ئەکا نامەی خوا کە سەرچاوەی یاسا و دەستوری ئیسلامە بەتەواوی و ، فێری فەرمودەی خۆی و کاری ڕەوا و ناڕەوایان ئەکا و بەڕاستی ئەوان لەپێش هاتنی ئیسلام لەنێو نەزانین و سەرگەردانیدا بوون ، کاری چاکیان نەئەزانی و کاری خراپیان بەخراپ نەئەزانی .

ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەمانەی خوارەوەمان فێر ئەکا :

١) بەڕاستی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دیاریەکی زۆر گەورەی خوایە بۆ باوەڕداران و هەموو بوونەوەران . بەو بۆنەوە لەزانینەوە ئەیانبا بۆ لای زانست و زانیاری ، لەچەوسانەوەوە بۆ لای سەربەستی لەگوناه کردنەوە بۆلای پەرستنی خوا ، بەتایبەتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دیاریەکی زۆر گەورەیە بۆ نەتەوەی عەرەب ، هەندێ جار بەبێ ئاگایی لەفەرمودەی پێغەمەر خۆیان بەوەوە هەڵئەکێشن لەنێو ڕەگەزەکانی تردا . بەڵێ عەرەبەکانی پێشوو مافی خۆیان بووە ، چونکە بەموێ لەیاسای ئیسلام لایان نەئەدا ، بەڵام ئەمانەی ئەم سەردەمە پشتیان کردوەتە دەستوری بەرزی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەتایبەتی کاربەدەستانیان ، بەداخەوە هەموو عەرەبەکانی ئەم سەردەمە یاسای دەستکردی خۆیانیان ناوەتە جێگەی یاسای قورئان ، ئەو کارە خراپەی خۆیان بە پێش کەوتن و شارستانیەت دائەنێن ، جگە لەڕوالەت لەناوەرۆکی یاسای قورئان دوورن . بەڵام لەکاتی تەنگانەدا بۆ پروپاگەندە پەلاماری ئیسلام ئەدەن و ئەیکەن بەچەك بۆ خۆیان .

٢) پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فێری ئەوان ئەکا ئەو نیشانانە بەڵگەن لەسەر یەکێتی خوا و توانای زۆری خوا ، بێگومان باوەڕداران پاك ئەکاتەوە لەچڵکی بت پەرستی و هاوبەش دانان بۆ خوا و لاسایی کردنەوەی ستەمکاران و دووریان ئەخاتەوە لەنەریتی خراپ و ناشیرین . پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ قورئانیان فێر ئەکا و ئەیکا بەهۆی کۆ کردنەوەیان لەسەر بیرو باوەڕو پاراستنی زمانیان و هانیان ئەدا بۆ زانین و زانست و ڕەوشتی بەرز . عەرەبە باوەڕدارەکان لەسەردەمی پێشوودا بەهەموو توانایانەوە

هەوڵیان ئەدا بۆ بەختیاری دانیشتوانی سەر زەوی بەناوی ئاینی ئیسلامەوە بەبێ جیاوازی هیچ ڕەگەزێ ، عەرەبایەتی و ڕەگەزپەرستیان بەلاوە زۆر خراپ بوو بەدژیا ئەڕۆیشتن ، بەڵام ئەمانەی ئەم سەردەمە لاسایی جوولەکەکان ئەکەنەوە لایان وایە گەلی هەڵبژاردەی خوان هەرشتێ بکەن و باوەڕیان بەیاسای ئیسلامیش نەبێ خوا سزایان نادا ، لەهەمان کاتدا خۆیانیان کوێر و کەڕ کردووە لە ئاستی لادان لەیاسای ئیسلام ، ئەگەر یەکێ ناوی ئاین بباو بلێ : بەیاسا و دەستوری ئیسلام کار بکرێ ئەو کەسە سەر نگون ئەکرێ و جارێ تر هیچ کەسێ نای بینێ. ئەمانە من نووسیم ناتوانم بڵێم هەموو عەرەب وان ، بەڵام کار بەدەستانیان لەوانەیش زیاتر لە خوا پێدان چاکترین مانای ئەو ئایەتە ئەو شتەیە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب بەنەجاشی پاشای حەبەشەی فەرموو بەئاگاداری نوێنەرەکانی بت پەرستانی دوژمنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ . کەنەجاشی بەوانی ووت : ئێوە چین و ئاینتان چۆنە ؟ جەعفەر فەرموی : ئێمە ئەی پاشا گەلێکی نەزان و نەفام بو ین . بتمان ئەپەرسیت . مرداربومان ئەخوارد ، داوێن پیسی نەریتمان بوو ، دراوسێیەتیمان لەبیر چوبۆوە .بەهێزەکانمان هەژارەکانمانی ئەخوارد ، ئێمە بەو جۆرە بووین هەتا خوا لەخۆمان فرۆستادەیەکی بۆ ناردین ، ئێمە بنەچەڵەکی ئەو پێغەمەرەو ڕاست گۆیی و دەست و داوێن پاکی ئەومان ئەزانی . بانگی ئێمەی کرد بۆلای پەرستنی خوایەکی تەنها ، فەرمانی پێداین لە گفتوگۆدا ڕاست بێژبن ، ئەو شتەی لامان دائەنرێ بیدەینەوە ، ئامەشۆی خزمان بکەین و لەگەڵ دراوسیدا چاکبین ، واز لەکاری نارەواو خوێن ڕێژی بهێنین و ، ئێمەی گێڕاوەتەوە لەکاری خراپ و بێز لێ کراوە و درۆکردن و لەدارایی هەتیوان خواردن و بوختان کردن بۆ بێ تاوانان . فەرمانی پێداوین خوا بپەرستین و هاوبەشی بۆ دانەنێن ، فەرمانی پێداوین بەکردنی نوێژ و زەکات دان و ڕۆژوو گرتن . بەکورتی ئەگەر خوا موحەمەدی نەکردایە بەپێغەمەر ، عەرەب نەخاوەنی مرۆڤایەتی ئەبوون و نەدەوڵەت و

نەشارستانی و نەمێژوویەکی وایـان ئـەبوو باسـی بکـرێ لـەڕوناکی ئـەو بابەتـەوە باسکران ئەتوانین تەتەڵـەی هـەموو هەرێمـەکانی موسـوڵمان بەگشـتی و عـەرەب بەتایبـەتی بکـەین، هـەتا بۆمـان ڕوون ببیتـەوە کەزۆربـەی کاربەدەسـتانی ئـەمڕۆ پەیبوەندیان بەپێغەمەرەوە نیە کەمێکیان نەبێ .

لەم سەردەمەدا ڕێکەوتی ساڵی ( ١٤٢١ ) ی کۆچـی بەرانبـەر بەسـاڵی ( ٢٠٠٠ ) ی زاینی موسوڵمانان لەهەموو ڕووی سەر زەویدا (٦٤) دەوڵەتی موسوڵمان هەن (٢١)یـان عەرەبن ، ژمارەی هەموو موسوڵمانان لەملیارێ زۆرترن ، زۆربەیان خاوەنی زێڕی ڕەشـن و سامانی تری زۆرن کەئەبنە هۆی ژیانی دانیشتوانی ئەمڕۆی سەر زەوی ، بەڵام هەریەکـە لەوانە سەر بەڕژێمێکی بێ باوەڕن ، پیت و فـەڕی خۆیانیـان ئـەدەنێ بـۆ کڕینـی چـەك ، ئەوانیش وەڵامیان ئەدەنەوە چەکیان بدەنێ بەو مەرجەی بەکاری بهێنن لەدژی ئەو ڕژێمانە خۆیان بۆیانی دیاری ئەکەن و بەکاری نەهێنن بۆ هەندێ ڕژێم خۆیان بۆیان دیاری ئەکەن .

ڕژێمە بەناو موسوڵمانەکانیش ئەو چەکانە لـەبرای خۆیانـا تـاقی ئەکەنـەوە . ئێسـتاش تورکیای عیلمانی بووە بەهاوسوێندی ڕژێمی زاوێنـی بـۆ ئـەوە چاکـتر موسـوڵمانەکان و کوردەکان بکوژێ .

خوای مەزن دووبارە باسی جەنگ و خۆماندو کردن ئەکا بۆ بەرزی ئاین و ئەفەرموێ:

أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ

أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾

﴿ أوَ لَمّا أصابَتْكُمْ مُصيبةٌ قَدْ اصبتُم مَثليها قُلْتُمْ أنى هذا ﴾ ئایـا ئێـوە كردتـان شـتێ كردبوتان لەهەڵهاتنتان و بەجێ هێشتنی پێغەمەر بەبرینداری و ئەبوایە نەتان كردایە ؟ كاتێ تووشی ئێوە بوو ئازار و تاڵاو لەجەنگی ئوحودا بەڕاستی ئێوە دەسـتان كـەوت لەجـەنگی بەدردا بەدوو ئەوەندەی ئەو ئازارەی ئوحود ئێوە ووتـان لەوكاتـەدا تووشـی ئـەو تـاڵاوە بوون لەجەنگی ئوحودا : چۆن تووشی ئێمە بـوو ئـەو ئـازارە خـۆ ئێمـە جـەنگ ئەكـەین لەڕێگەی ئاینی خوادا ؟ ئەبوایە تووشی ئێمە نەبوایە ئەو بەڵایە .

﴿ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أنْفُسِكُمْ ﴾ تۆ بڵێ : ئەو ئازارەی تووشتان بـوو لـەلایەن خۆتانـەوە پەیدا بوو ، چونكە بەئارەزوی خۆتان لــە مەدینـە هاتنـە دەرەوە و هەڵـهاتن و پێغەمـەرتان بەجێ هێشت و بێ فەرمانی ئەوتان كرد .

بۆ ڕوون كردنەوەی چاكتر بۆ مانای ئـەو ئایەتـە : بەڕاسـتی ڕووداوی بـەدر لەسـاڵی دووهـەمی كۆچیـدا ڕووی دا ، جـەنگی ئوحـود لەسـاڵی سـێهەمی كۆچـی دا بــوو ، موسوڵمانان لەجەنگی بـەدردا سـەركەوتن ، ئـەوە بـوو (٧٠) كەسیان لـەبت پەرسـتان

کوشت و (٧٠) کەسیان بەدیلی گرتن . دووبارە موسوڵمانان لەیەکەم پەلاماردا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، دوایی تووشی ئازار و شکان بوون بەهۆی بێ فەرمانی پێغەمەر و هەڵهاتنی تیر هاوێژان ، بەو بۆنەوە موسوڵمانان (٧٠) کەسیان لێ کوژرا . ئەگەر ئێمە بەراوردی سەرکەوتنی موسوڵمانان بکەین لەگەڵ سەرکەوتنی بت پەرستان لەجەنگی ئوحودا هێشتا سەرکەوتن هەر بۆ موسوڵمانانە ، چونکە (٧٠) کوژراوی ئەمان بە (٧٠) کوژراوی ئەوان ، ماوەتەوە (٧٠) دیل بۆ قازانجی موسوڵمانان تەواو ئەبێ .

پرسیار / چۆن بت پەرستان سەرکەوتن لەڕۆژی ئوحودا کەچی دوژمنی خوا بوون ؟ بۆ دوو ڕوان سەرکەوتنی موسوڵمانانیان لەڕۆژی بەدردا لەبیری خۆیانیان بردەوە لەگەڵ ئەوەیشدا سەرکەوتنی موسوڵمانان دوو چەندانەی ڕۆژی ئوحود بوو ؟

وەلام / ئەو ئازار و شکاندنە هۆکەی لەموسوڵمانانەوە بوو ، وەك لەمەو بەر باسمان کرد بەدرێژی و هەڵهاتن بەمەبەستی کۆکردنەوەی تالانی .

﴿ إنَّ اللهَ عَلى كُلِّ شيءٍ قَديرٌ ﴾ بەڕاستی خوا توانانی بەسەر هەموو شتێکا هەیە ، یارمەتی کەسێ ئەدا پەیڕەوی خوا بکا، واز لەیارمەتی کەسێ ئەهێنێ پەیڕەوی خوا و پێغەمەر نەکا .

﴿ وَما أصابَكُم يَومَ ألتَقى الجَمعانُ فَبِإذنِ اللهِ ﴾ وەشتێ تووشی ئێوەی باوەڕدار بوو لەو ڕۆژەدا ئەو دوو کۆمەڵە هەڵتەقان بەیەکا لەڕۆژی ئوحودا ، دوایی بەدەستوورو زانستی خوا بوو ، ئادەمیزاد پێویستە فەرمانبەرداری فەرمان و دەستوری خوا بێ ، سەرکەوتن بەئامادەباشی خۆیان ئەبێ لەجەنگدا ، شکانیشیان هەڵسانە لەدژی بڕیاری سەرکردایەتی .

﴿ وَلِيَعْلَمَ المُؤمِنينَ وَلِيَعلَمَ الذينَ نافَقوُا ﴾ وەئەو ئازارە تووشی موسوڵمانان بوو بۆ ئەوە بو خوا دەری بخا بۆ باوەڕداران و بۆ کەسانێکی ئەوتۆ دووڕوویان کردبوو ، بزانن سەرکەوتنی موسوڵمانان بەخۆڕاگرتنە لەسەر ئەو شتەی تووشیان ئەبێ ، دووڕوانیش

بەبۆنەی بێ ئارامیانەوە تووشی خراپە ئەبن ، ئەو ئازارە تووشی موسوڵمانان بـوو سـوودی زۆری تێـدا بـوو ، گرنگـترین سـوودیان ئەمەیـە : دووڕووەکـان لـەبـەر ڕوداوی ئوحـود نەئەناسران لای دانیشتوان ، بەهۆی ئەو ڕووداوەوە دەرکەوتن لای ئادەمیزاد .

﴿ وَقيلَ لَهُمْ تَعالوا قاتِلوا في سَبيلِ اللهِ أو أدفِعوا ﴾ وەبێژرا بەدوو ڕووەکان : ئێوە وەرن بۆ جەنگ کردن لـەگەڵ بت پەرستان لـەڕێگەی ئاینی خوادا ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ، یا ئێوە بەرگری بکەن لـەخۆتان و لـەخێزان و داراییتان ئەگەر ئێوە نیشتمان پەروەرن.

خوای مەزن ڕوونی نەکردوەتەوە چ کەسێ ئەوەی بەدوو ڕووەکان ووت ، نـاوی دوو ڕووەکانیشی نەبردوە ، بەڵام زۆربەی زانایان ئەڵێن : عەبدوڵای کوڕی ئوبـەی سـەرۆکی دوو ڕووەکان لـەگەڵ پێغەمەر چوەدەرەوە بـە (٣٠٠) جـەنگاوەرەوە ، لـەنیوەی ڕێگـەدا خۆی و دەستەکەی گەڕانەوە ، وازیان لەجەنگ هێنا بەو مەبەستە دوو دڵـی پـەیدا بکـەن لـەنێو جەنگاوەرە موسوڵمانەکاندا و لایەنی پێغەمەر بـێ هـێز ببـێ ، لـەدواییدا عـەبدوڵای کوڕی جابیر یاریدەری پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بـەدوو ڕووەکـانی ووت : بـۆ ئەگەڕێنـەوە ئەگـەر خاوەن ئاین نین جەنگ بکەن بۆ پاراستنی خۆتان و خێزانتان و سامانتان ، وەئەگەر خـاوەن ئاینیشن جەنگ بکەن بۆ ئاینەکەتان ناوەڕۆکی ئـەو ئایەتـە ئاراستەی هـەر کەسـێ کرابـێ دووڕووەکان خۆیانیان تێ هەڵکێش کرد و وەڵامی عەبدوڵای کـوڕی جابیریـان دایـەوە . وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ قالوا لَو نَعْلَمُ قِتالاً لأتبعناكُمْ ﴾ دوو ڕووەکـان ووتیـان : ئەگـەر ئێمـە دەسـتووری جەنگمان بزانیایە بەڕاستی دوای ئێوە ئەکەوتین ، ئەو دوو ڕوانە بۆ ئەو کارە خراپەیان دوو بیانویان هەبوو :

(١)وایان دانابوو موسوڵمانان توانای جەنگیان لـەگەڵ بـت پەرسـتان نی‌یـە ، چونکـە ئەوان چەك و جەنگاوەری زۆرن و ، موسوڵمانان کەمن و بێ هێز و بێ چـەکن ، بەجگەی لـەناوچون هیچ شتێکی تریان بەبەش نابێ .

(۲)ئەیان ووت : ئەم کارەی موسوڵمانان جگــە لــەخۆ پیشـاندان گومـانی تـری بـۆ نابرێ، لە پاشا موحەمەد لەگەڵ خزمەکانی ئاشتەوایی ئــەکا و ئەگەڕێتـەوە ، دوو ڕووەکان ووتیان : هەر چۆنێبێ ئەگــەر جـەنگ دەسـتی پێکـرد لـەنێوانیانا ئێمـە ئەگەڕێینەوە بۆ جەنگ و یارمەتی موحەمەد ئەدەین .

﴿ هُمْ لِلكُفرِ يَومَئِذٍ أقرَبُ لِلإيمان ﴾ ئەو دووڕووانە لەو ڕۆژەدا نزیکتر بــوون لــەخۆیان بۆلای بێباوەڕی لەباوەڕهێنان ، نزیکتر بوون بۆ یارمەتی دانی بت پەرستان ، چونکە ڕێـك ئەکەوت لەگەڵ سوودی هاوبەشیان ، خۆیانیان دەرخست و ئابڕویان چوو ، ئەیان ویست دوو ڕوویی خۆیان بشارنەوە ، بەڵام بۆیان نەچوە سەر .

﴿ يقولـون بِأَفواهِهِمْ ما لَيسَ فِي قُلوبِهِمْ وَاللّهُ أعْلَمُ بِما تَكْتُمُونَ ﴾ بەدەم و زمانی خۆیـان شتێ ئەڵێن لەدڵیانا ئـەو شـتە نیـیە ، ئـەیان ووت ئەگــەر جـەنگمان بزانیایـە دوای ئێـوە ئەکەوتین و خوا زاناترە بەشتێ ئەوان دای ئەپۆشن لەبێ باوەڕی بەخوا و بەپێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

بێ بـاوەڕان لەســەر کـاری خراپـی خۆیـان ئـەڕۆن و هـەموو هەڵوێسـتەکانی خۆیـان دەرئەخـەن ، لەهـەوڵی ئـەوەدان پـۆلی موسـوڵمانان تـەفروتونا بکـەن و دەرونیـان بخەنـە گومانەوە ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ الذينَ قالوُا لإِخوانِهِم وَقَعَدوا لَو أطاعونا ما قُتِلوا ﴾ ئەو کەسانەی ئەوتۆ لەدڵیانا ئەو شتەیان پەنهان ئەدا و ووتیان بـەبراکانیان لــەبیرو بـاوەڕدا و بەخزمـەکانیان: لــەو کاتـەدا دانیشتبوون و جەنگیان نەئەکرد : ئەگەر ئێوەی برای ئێمە پەیڕەوی ئێمەتان بکردایــە لــەو دانیشتنانە نەئەکوژران هەروەك ئێمە نەکوژراین و ڕزگارمان بوو .

﴿ قُلْ فادْرأوا عَنْ أنْفُسِكُمْ المَوتَ إنْ كُنْتُمْ صادِقِينَ ﴾ موحەمەد تۆ بڵێ : کەواتە ئێــوە بەرگری لە خۆتان بکەن لەمردن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ئەڵێن خۆ لادان ڕێگە لــەمردن ئەگرێ . زۆر بەبێ گومان بزانن ڕزگاری لـەمردن نابـێ کەسـێ بیـەوێ ڕابکـا لەدەسـتی مردن، خاوەنی تەفسیری کەشاف ئەفەرموێ : هەر لـــەو ڕۆژەدا دوو ڕووەکـان گەڕانـەوە (۷۰) کەسیان لێ مرد .

دوورڕووەکان ئەیان ووت : پەیڕەوانی موحەمەد بەخۆڕایی خۆیان ئەدەن بە کوشت و هیچ سودێ بەوان ناگا ، ئێمە هیچ بیروباوەڕێکمان نەزانیوە کەپلەی بەرز بدا بەکوژراوانی جەنگ بەوێنەی ئەو پلەیەی ئیسلام بۆ ئەوانی داناوە ! خوای مەزن بەڕوونی و بەبێ پەردە گفتوگۆی ئەو دوورڕوانە پاڵ پێوە ئەنێ و پوچی ئەکاتەوە ، ڕونی ئەکاتەوە بۆ هەموو کەسانی خاوەن ئەقڵ و ئەفەرموێ :

وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾

﴿ وَلا تَحسَبَنَّ الذينَ قُتِلوا في سَبيلِ اللهِ أمواتاً ﴾ وەتۆ گومان مەبەرە ئەو کەسانەی ئەوتۆ کوژراون لەڕێگەی بەرزی ئاینی خوا مردوون وێنەی کەسانی تر کەئەمرن ، ئیتر ئەو کەسانە کوژرابن لەجەنگی ئوحودا یابەر لە ڕۆژی ئوحود یا لەدوای ئەویش بکوژرێن . بە مەرجێ لەجەنگی بەرزی ئاینا بکوژرێن .

﴿ بَلْ أحياءً عِندَ رَبّـهم يُرزَقـونْ ﴾ بەڵکو ئەو کوژراوانە زیندون لەگۆڕەکانیانا و نارزێن، پێویستە بزانرێ پێغەمەران و شەهیدان و بانگ دەرانی نوێژ و ئەوکەسانەی

قورئانیان لەبەرە هەمویان زیندون و خاك نایان خواو نارزێن ، شەهیدانی ڕێگەی خوا خواردەمەنیان ئەدرێتێ لەلایەن پەروەردەکەری خۆیانەوە لەبەهەشتەوە .

لەو ئایەتەوە ئەوەی دەرئەکەوێ شەهید لەم ڕۆژەی جیهاندا و بەر لەهاتنە دەرەوەیان لەگۆڕەکانیانا زیندوون بەڕاستی ، پێویستە لەسەرمان بڕوامان بەوە هەبێ ، بەگوێرەی دەرکەوتوی مانای ئەو ئایەتەو فەرمودەی پێغەمەرو ئەقڵیش دژی ناوەستێ چونگە بەڵگەیە بەدەستەوە نی‌یە لاماندا لەو مانا دەرکەوتوەی ئایەتەکە ، ژیان و مردن و هەموو شتێ بەدەستی خوایە ئەیان بەخشێ بەهەر شتێ بیەوێ .

لێرەدا بەباشی ئەزانم لەبارەی زیندوێتی پێغەمەران و شەهیدانەوە ئەمانەی خوارەوە ڕوون بکەینەوە :-

١- زیندو یەبتان بەرزەجنە ، یانێ زیندوێکی وایە لەنێوان جیهان و ڕۆژی دواییدایە ، زیندوو بونەوەکەیشیان وێنەی زیندوێتی جیهانە و خەونی‌یە ، بەوێنەی بونەوەرانی تر . بەڵکو خوای مەزن لەشیان ئەپارێزێ لەڕزین .

٢- لەشی پیرۆزی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ نەك نارزێ ، لەهەندێ کاتا خودا گیان ئەکاتەوە بەلەشیا بەجۆرێکی نهێنی ، فەرمودەی پێغەمەر لەو بارەوە زۆرن ، کەخودا گیان ئەکاتەوە بەریانا بۆ وەڵامدانەوەی سڵاو لەسەری ، هەر کەسێ لەدوورەوە سڵاویان لێ بکا بەهۆی فریشتەیەکەوە پێی ئەگا ، زیندوێتی پێغەمەر دوای مردنی ، بەوێنەی زیندوێتی کاتی جیهانی‌یە ، ئەگەر وابوایە ، کاتێ دوای مردنی هاوڕێکانی ئاژاوەیان لێ پەیدا بوو جێگە نشینی پێغەمەر و جێگەی ناشتنی لەگۆڕدا و ، بۆ میراتی فاتیمەی کچی بۆ زەوی فەدەك و ، ئاژاوەی نێوان عەلی و عائیشە و مەعاویە ، وەڵامەکەی بۆیان ڕوون ئەکردەوە ، کەواتە زیندوێتی پێغەمەر و شەهید بەڕاستی نازانرێ ، بەڵام ئێمە ئەبێ بڕوامان وابێ پێغەمەر لەهەموو کەس بەڕێز ترە لەهەردوو جیهاندا ، هەرچەندە پیاو چاکان زۆریان ئەڵێن ، پێغەمەر ئەبینین بەبێداری . بەڵام ئەو بینینە بەگیانە بەتەنها ، نەك بەلەش و بەگیان ، چونکە ئەگەر

بەلەشبوایە ، ئەبوایە کەسێ تریش لای ئەوان بوایە بیانبیبایە و ، وائەبێ لەیەك کاتا بەدەیان پیاو چاك پێغەمەر ئەبینن و ، خۆ لەشی پێغەمەریش یەك لەشە ، هەموو شتێ هەر خودا ئەیزانێ .

ئەوانەی سەرەوە لەنامەی (أسنى المطالب) ( في أحاديث مختلفة المراتب) نووسراوە .

ئایا شەهید چ کەسێکە و ئەشۆررێ و نوێژی لەسەر ئەکرێ یان نە ؟ لەمانای ئایەتی (١٤١) ی ئەم سورەتەدا بەو جۆرەی پێویست بێ ڕوون کراوەتەوە .

ئەو کەسانەی لەڕێگەی بەرزی ئیسلامدا ئەکوژرێن خاوەنی سێ شادمانین :

١- ﴿ فَرِحِينَ بِمَا آتاهُمُ اللهُ مِنْ فَضلِهِ ﴾ شادمان و کەیف خۆشن بەشتێ خوا بەوانی بەخشیوە لەڕێز و گەورەیی خۆیی و پاداشتی زۆری . یانێ ئەوەی خوا ئەیبەخشێ بەوان هەر لەبەر گەورەیی و بەخشندەیی خوایە نەك لەبەر چاکی ئەوان ، شەهیدان کەیف خۆشن و بەڕابوردنیان بەهۆی ئەو چاکانەوە ، کەیف خۆشن لەبەر ئەوە کە ئەو چاکانە بەلگەن لەسەر ئەوەی کە خوا خۆشی ئەوێن ، ئەو خوایەی کەئەوان خۆیانیان بۆ کردووە بەفیداکار ، خاوەن دیاری دۆستی دیاری بۆ براوی خۆش ئەوێ .

٢- شادمانن لەبەرئەو برایانەیان ئەیان ناسن و نەکوژراون و نەهاتوون بۆ لای ئەوان وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَيَستَبشِرونَ بِالذينَ لَمْ يَلحَقوا بَهم مِنْ خَلفِهِم ﴾ وەئەو کەسانەی لەڕێگەی خوادا کوژراون شادمان و کەیف خۆشن بەهۆی برا باوەڕدارەکانی ئەوتۆی خۆیان بەجێیان هێشتوون بەزیندویی لەجیهاندا ، لەسەر پەیڕەوپرۆگرامی خۆیان لە دوای ئەمان ، بەو شتەیش بەمان دراوە لەڕێزی خوا بەوانیش ئەدرێ ، ئەو برایانەیان نەکوژراون وەدوایی بەمان ئەگەن پاش ماوەیە ، ئەڵێن : براکانمان وەك ئێمە کوژران ئەو خۆشیەی دراوە بەئێمە ئەدرێ بەوانیش کەواتە ئەو شەهیدانە پەیوەندییان بەزیندووەکانەوە نەبڕیوە .

﴿ أنَ لا خَوفٌ عَلَيهِمْ وَلاهُمْ يَحزَنون ﴾ ئەو کەسانەی جێگەی شادمانین ترسیان لەسەر نیە لەپاشەڕۆژدا و ، خەفەتبار نین لەسەر کۆتایی تەمەنیان ، ئەو ئایەتە بەلگەی ئاشکرایە

لەسەر ئەوەی شەهید بەر لەپاشەڕۆژ زیندوون ، چونکە کـە خۆشـیان بـە پاشـەڕۆژی بـرا زیندوەکانیان ئێستا ئەبێ نەك دوارۆژ .

٣- شادمانن بەو خۆشی‌یە ئەدرێ بەهەموو باوەڕداران ، ئیتر بیان ناسن یان نەیان ناسن کەلەجەنگدا کوژرابن یا لەماڵی خۆیانا ، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ يَستَبشِرونَ بِنِعمَةٍ مَنَ اللهِ وَفَضل ﴾ ئەو شەهیدانەی ڕێگەی خـوا شـادمانن و کـەیف خۆشن بەو پاداشت و چاکەیەی خوا کە دەســتی خۆیـان و هـەموو بـاوەڕداران ئەکـەوێ لەسەر کردەوەکانیــان و ، شـادمانن بـەڕێزگرتنیان لای خـوا و بـەدوو پـات کردنـەوەی پاداشتەکانیان .

﴿ وإنَ اللهَ لا يُضيع أجـر المؤمنـين ﴾ وەبەڕاسـتی خـوا لـەناو نابـا پاداشـتی کـرداری باوەڕداران و زۆر تریشی ئەکا .

پرسیار / لەبەر چ شتێ خوا ڕستەی ﴿ يستبشرون ﴾ ی دووپات کردوەتــەوە لەگـەڵ ووشەی ﴿ فضل ﴾ ؟

وەلام / بەڕاستی بۆ شەهید هەیە سێ شادمانی : شادمانی یەکەمیان بەهۆی ئـەو شـتەی بەخۆیان ئەگا ، ئاماژەی بۆ ئەکا بەفەرمودەی ﴿ فرحين بما آتاهم الله من فضله ﴾ شــادمانی دووهەمیان لەبەر براکانیانە ئەیان ناسن و هێشتا بەمان نەگەیشتوون ، ئاماژەی بۆ ئــەکا بـە ﴿ يستبشرون بالذين لم يلحقوا بهم ﴾ ، شادمانی سـێهەمیان بـۆ هـەموو بـاوەڕداران بیـان ناسن یا نەیان ناسن ئاماژەی بۆ ئەکرێ بە ﴿ يستبشرون بنعمة من الله وفضله ﴾ .

پرسیار / جیاوازی لەنێوان ووشەی ﴿ فضل ﴾ وە ووشەی ﴿ نعمة ﴾ چ شتێکە ؟

وەلام / مەبەست لـە ﴿ نعمـة ﴾ بریتی‌یـە لەپاداشـتێ شایسـتەی کـارگوزارێ بـێ بـۆ کرێکەی ، مەبەست لە ﴿ فضل ﴾ بریتیە لەوەی خوا ئەیبەخشێ هەر لەبەر گەورەیی خۆی نەك لەبەر شایانی کار گوزار .

ئەگێڕنەوە ئەبو سوفیان و هاوڕێکانی وەك لەمەو بــەر بـۆ مەبەسـتێ باسـی کـرا کاتـێ گەڕانەوە لەجەنگی ئوحود گەیشتنە (ڕەوحا) پەشـیمان بوونـەوە و ویسـتیان بگەڕێنـەوە و

پەلاماری موسولمانان بدەنەوە ، ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمەر (ﷺ) خۆی ئامادەکرد بۆیان و فەرموی : جگە لەوانەی پێشوو لەگەڵم بوون کەسی ترم لەگەڵ نەیە . پێغەمەر (ﷺ) لەگەڵ ئەو کۆمەڵە چوونە دەرەوە بۆ بەرگری کردن لەبت پەرستان کەگەیشتنە (حەمرائولئەسەد) کەهەشت میل لەمەدینەوە دوورە خۆی و هاوەڵەکانی خۆیانیان ڕاگرت بۆ ئەو مەبەستە هەرچەندە ماندوو برینداریش بوون بۆ ئەوەی پاداشتیان لەکیس نەچێ ئارامیان گرت ، بێ باوەڕە بت پەرستەکان کە ئەو هەواڵەیان بیست خوا ترسی خستە دڵیان ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾

﴿ الذينَ أستَجابوا للهِ وَالرَّسولِ مِنْ بَعْدِ ما أصابَهُمُ القَرْحُ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ وەڵامی خوا و نێراوی خوایان دایەوە کاتێ فەرمان دەرکرا بچنە دەرەوە لەمەدینە لە دوای ئەوەی تووشی ئەوان بوبو برینداریلەجەنگی ئوحودا .

﴿ لِلذينَ أحسَنوا مِنهُمْ وَاتَّقوا أجرٌ عَظيمٌ ﴾ بۆ کەسانێکی ئـەو تـۆ هەیـە بـۆ چاکـەیان کردوە لـەو کەسانە پەیڕەوەی پێغەمەریان کرد و وەڵامیاندایـەوە بـۆلای جـەنگ کـردن و خۆیانیان پاراست لـەگوناهو بێ فەرمانی خوا و پێغەمەر پاداشتێکی گەورە ، وەك بەهەشـت . ناو بردنی ئەو پاداشتە ئەوە ئەگەیەنێ یەکجار گەورەیە ، جگە لـەخوا کەس نایزانێ .

﴿ الذينَ قالَ لَهُمُ الناسُ إنَّ النـاسَ قَـدْ جَمَعـوا لَكُـمْ ﴾ کەسـانێکی ئـەوتۆن ووەڵامـی پێغەمەریان دایەوە لـەبێ فەرمانی خۆیان پاراست بەوانیان ووت هەندێ ئادەمیزاد: بەڕاسـتی پیاوانی مەکە لـەتاقمەکانی ئەبو سـوفیان پێـك هـاتوونو کۆبونەتـەوە بگەڕێنـەوە و جـەنگ بکەنەوە لـەگەڵتان و بنەبڕتان بکەن .

ئەو کەسانە ئەو هەواڵەیان بەموسوڵمانان ووت ، هەندێ لـەزانایان ئەڵێن : بریتی بـوون لـەدوو ڕووەکان ، هەندێ تر لایان وایە بریتی بـوون لـە کـاروانی هـۆزی عـەبدو قـەیس کەتووشیان بوو بەتووشی موسوڵمانانەوە ، هەرکام لـەوانە بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ ، ئەوەی شایانبێ تاقمێ بەو کارە هەڵسابوون .

﴿ فأخشَوهُمْ فَزادَهُمْ إيماناً ﴾ دوایی ئێوە لـەبت پەرستان بترسن و خۆتانیان لێ بپارێزن ، چونکە ئەوان ژمارەیان زۆرە و ئێوە تواناى جەنگتان نەماوە ، دوایی گفتوگۆی بێ باوەڕان موسوڵمانانی زۆر کرد بۆ باوەڕهێنان و هورەیان بـەرزتر بویـەوە و گۆێیـان لـەو هەواڵـە نەگرت و ئازاییی خۆیانیان باشتر دەرخست .

﴿ وَقالوا حَسْبُنا اللهُ وَنِعمَ الوَكيل ﴾ وە ووتیان : ئێمە خوامان بەسە و یارمـەتیمان ئـەدا و ، خوا چاك کار پێ سپێراوە و هەڵسوڕێنەری ئێشی ئێمە و هەموو بوونەوەرانە .

بەکورتی باوەڕداران بەو بریندارى و خوێناوىیەوە زۆر بەپەرۆش و خۆشیەوە ووەڵامـی پێغەمەریان دایەوە و بۆ دژی بت پەرسـتان و لـەشـکرەکەیان و لـەوان نەترسـان کەئـەیان ووت : مەچنە دەرەوە لـەگەڵ موحەمەد ، بەڵکو بەگفتوگۆی ئـەوان غیرەتیـان پـتر ئـەبوو باوەڕیان زۆر تر ئەبوو لـەسەر پەیڕەوی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، بەجۆرێ مرۆڤـێ لـەهۆزی بـەنی

عەبدولئەشهەل ئەلێ: من و براکەم هەردەەکمان لەگەڵ پێغەمەردابووین کاتێ جارچی پێغەمەر جاری بۆ دەرچوون بلاو کردەوە ، لەگەڵ پێغەمەر چووینە دەرەوە ، هەردوکمان بریندار بووین و برینی براکەم سەخت تر بوو هەرکاتێ دوا بکەوتایە ئەم کرد بەکۆڵەوە ، بەو شێوەیە فەرمودەی خوا تێکەڵاوی خوێنیان بوبو لەکوشتن و دیل کردن و ئازار نەئەترسان .

﴿ فأنقلبوا بنعمة من الله وفضلٍ لم يَمسَسهم سُوءٌ ﴾ دوایی موسوڵمانان گەڕانەوە بەساغی بەهۆی چاکە و گەورەیی خواوە تووشی ئەوان نەبوو هیچ خراپە و ئازارێ لەبرینداری و کوشتن .

﴿ وأتبعوا رضوان الله والله ذو فَضلٍ عَظيمٍ ﴾ وەپەیڕەوی ڕەزامەندی خوایان کرد بەهۆی ئازایی و دەرچونیان بۆ ڕێگە گرتن لەدوژمنانی خوا و ، خوا خاوەنی چاکەی زۆر گەورەیە کەترسی خستە دڵی بت پەرستان و گەڕانەوە و موسوڵمانانی سەرخست .

﴿ إنما ذلِكم الشيطانُ يُخوِّف أولياءَهُ ﴾ بەڕاستی ئەو پڕو پاگەندەیە بلاو کرایەوە بۆ ترساندنی ئێوە کەئەیان ووت : مەچنە دەروە ئەو شەئیتانە بوو ئەترسێنێ دۆستەکانی خۆی و کاریان تێ ئەکا نەچنە دەرەوە ، بەڵام ئێوەی باوەڕدار دۆستی خوان و ترساندنی ئەو کارناکاتە سەر ئێوە .

ئەوەبوو عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بەچەندین کەسەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە لەترسانا .

﴿ فَلا تَخافوُهُمْ وَخافونِ إنْ كُنتُمْ مُؤمِنين ﴾ دوایی ئێوە مەترسن لەدۆستانی شەیتان و ئەو کەسانەی پڕوپاگەندە بلاو ئەکەنەوە بۆ ترساندنتی ئێوە و ، ئێوە لەمن بترسن و بێ فەرمانی من مەکەن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ، چونکە باوەڕداری داوای ترسان ئەکا لەخوا، کۆمەڵێ لەبێ باوەڕان موسوڵمان بوون لەپاشا لەئاین وەرگەڕان لەترسی قورەیشەکان ، بەوبۆنەوە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ تووشی خەفەت بوو ، خوای مەزن بۆی ڕوون کردەوە ، وەرگەڕانی ئەوان زیان بەتۆ ناگەیەنێ و فەرموی :

وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾

زانایان لەهۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە بیریان جیاوازە ، هەندێکیان لایان وایە دەربارەی دووڕوەکان و جولەکەکان هاتۆتە خوارەوە . هەندێکیان ئەڵێن لەبارەی قورەیشییەکان هاتوەتەخوارەوە ، لەوانەیشە هاتبێتە خوارەوە دەربارەی هەموو بێ باوەڕان، هەرچۆنێ بێ مەبەستەکە ناگۆڕێ .

﴿ وَلا يَحزُنْكَ الّذين يُسارعونَ في الكُفر ﴾ وەتۆ خەفەتبار نەکەن کەسانێکی ئەوتۆ پەلە ئەکەن بۆ نێو بێباوەڕی و خاوەنەکانیان ، وێنەی عەبدولای کوڕی ئوبەیی و تاقمەکەی کەئەیانەوێ ڕوناکی ئایین بکوژێننەوە ، لەگەڵ ئەوانەیش خەفەتبارت ئەکەن و لەئایین وەرئەگەڕێن یا باوەڕیان لاوازە .

﴿ إِنّهُمْ لَنْ يَضروا اللهَ شيئاً ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانە هەرگیز زیان ناگەیەنن بەئاین و دۆستانی خوا هیچ شتێ بەهۆی بێ باوەڕی خۆیان و کار و فرمانیان لەناوئەچێ و

شکۆیان نامێنێ ، بەڵام ئەو ئایینە تۆ ئەی پەرستی شان و شکۆی پەرە ئەسێنێ و وانەکانی بەرز ئەبێتەوە ، هەروایشبوو زۆری پێ نەچوو ئاینی ئیسلام گەشەی سەند و ڕیشەی داکوتا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوادا ، ناویان لەناودا نەما ئەو کەسانەی پەلەیان کرد بۆلای بێ باوەڕی و دوژمنایەتی خوا .

﴿ يَرِيدُ اللهُ ألاّ يَجْعَلَ لَهُمْ حظّا في الآخِرة وَلَهُمْ عَذابٌ عَظيمٌ ﴾ خوا ئەیەوێ نەگێڕێ بۆ ئەو کەسانە و نەیانداتێ بەشێ لەپاداشتی ڕۆژی دوایی و ، بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایەکی زۆر گەورە لەپاشەڕۆژدا ، چونکە درێژە ئەدەن بەبێ باوەڕی و پەشیمان نابنەوە هەتا ئەمرن.

پرسیار / دەرکەوتوی مانای ئەو ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا خودا خراپەی ئەوێ بۆ ئادەمیزاد ، لەبەر ئەوەی سزای دۆزەخ خراپە ؟

وەڵام / بەڵێ خوا سزای ئەوانی ئەوێ ، بەڵام دوای ئەوەی ئەو کەسانە شایستەی سزابن ، چونکە خوا فەرمانی داوە بەباوەڕهێنان ، خۆیانی ئازاد کردووە ، ئەوانیش بێ باوەڕیان بۆ خۆیان هەلبژاردووە بەخۆشی خۆیان ، بۆیە خوا سزایان ئەدا .

﴿ إنَّ الذينَ أشتَروا الكُفرَ بالإيمانِ لَنْ يَضروا اللهَ شيئاً وَلَهُمْ عَذابٌ أليمٌ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بێ باوەڕی ئەکڕن بەباوەڕهێنان بەخوایشتی خۆیان و پەشیمان نابنەوە هەرگیز زیان بەئاینی خوا ناگەیەنن هیچ شتێ بەهۆی ئەو ئاڵ و گۆڕینەوە و ، بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایەکی ئا زاردەر .

پرسیار / خوای مەزن دووجار لەو دوو ئایەتانەدا ناوی ﴿ لن يَضروا اللهَ ﴾ بردووە ، هۆکەی شتێکە ؟

وەڵام / مەبەست لەئایەتی یەکەم بێ باوەڕانی قوڕەیش و ئەو کەسانەیان لەشکریان کردووە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمەر و ئەو دوو ڕووانەیش یاریدەی ئەوانیانداوە لەدژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ . مەبەست لە ئایەتی دووهەم هەموو ئەو کەسانەیە باوەڕیان

نەهێناوە بەخوا بەر لە قورەیشیەکان و ئەوانەیش لەمەو پاش باوەڕنەهێنن بەخوا جەنگ کەربن یان نە ؟

لەدوایی باسی ئەو کەسانە خوای مەزن ڕوونی ئەکاتەوە تەمەن درێژی بێباوەڕان سوود نابەخشێ بەوان ، بەمەرجێ سەر بکێشێ بۆ لای بێباوەڕی خاوەنەکەی هەتا کۆتایی تەمەنیان بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَلا يَحسَبَنَّ الذين كَفَروا أنّما غلي لهم خيرٌ لأنفسهم ﴾ وەگومان نەبەن کەسانێکی ئەو تۆ باوەڕیان نەهێناوە لەجولەکە و گاور و بت پەرستان و دووڕووان کە بەڕاستی مۆڵەتدانی ئێمە بۆ ئەوان چاکتربێ بۆ خۆیان کەبەو تەمەنە درێژەی خۆیان پڕوپاگەندە بکەن بۆ ئایینیخوا.

﴿ إنّما غلي لهم ليزدادوا إثماً وَلَهُمْ عَذابٌ مُهين ﴾ بەڕاستی ئێمە مۆڵەتی ئەوان ئەدەین بۆ ئەوەی ئەوان گوناە زۆرتر بکەن بەسەربەستی خۆیان و بەردەوامبن لەسەر ئایینی پوچ ، بۆئەوکەسانە هەیە سزایەکی ئابڕوبەریان و بێ نرخیان ئەکا .

بەڕاستی تەمەنی ئادەمیزاد وەك سامانەکەی وایە ، ئەگەر بەجۆرێکی چاك دەستکاری بکا و دای بنێ بۆ خۆی و خێزان و بێ نەوایانی بەندەی خوا ئەبێتە هۆی چاکە و پاداشتی زۆر ، هەموو کاتێ سامانی زۆر بوو بەخشی لەپەرستنی خوادا بەو بۆنەوە پاداشتی دووپات ئەبێتەوە ، ئەگەر سامانی خۆیان بەخراپی دەست کاری بکەن و لەگوناهدا دای بنێن ئەبێ بەهۆی خراپەی زۆر بۆیان ، هەموو کاتێ سامانیان گەشە بکا خراپەی زۆرتر ئەبێ ، هەروایش تەمەنی ئادەمیزاد ئەوپەڕی مرۆڤ ئەگەیەنێ بەبەختیاری ئەگەر کاری زۆری پێ بکا بۆ چاکە ، ئەبێتە هۆی خراپە بۆی ئەگەر بەکاری نەهێنێ لەچاکەدا .

لەم جێگەیەدا ئەم پرسیارانە و وەڵامەکانیان خۆیان نیشان ئەدەن :

پرسیار / ئەگەر هەندێ لەبێ باوەڕان کردەوەی چاکی زۆریان لەڕێگەی چاکەدا ئەیان بەخشی ، هەتا تەمەنیان درێژتر بوایە بەزانست و کۆششی پاکی خۆیان سوودی زۆرتر بۆ

ئادەمیزاد هەبو، ئەوەیش دژی فەرمودەی خوایە بۆیە تەمەنیان درێژ ئەکەین هەتا خراپەی زۆر بکەن؟

وەلآم / دارِژاندنی ئەو ئایەتە مەبەستەکەی خۆی دیاری کردووە لەگوناهدا کەبەتایبەتی بریتین لە بێ باوەڕی بەتەنها ، لەو بارەوە هەتا تەمەنیان درێژبێ بێ باوەڕیان زۆرتر ئەبێ نەك لەهەموو ڕوێکەوە ، چونکە وائەبێ لەهەندێ کاریاندا چاکەکەربن .

پرسیار / ئایا پاداشتی بێ باوەڕان ئەدرێتەوە کاتێ بەباشی سوود بگەیەنن بەئادەمیزاد ، یا ئەو کارە و نەکردنی یەکسانن؟

وەلآم / ئادەمیزاد بەشێوەیەکی گشتی لەم چوار بەشانەی خوارەوە بەدەر نین :

١- ئادەمیزاد هەیانە خاوەنی باوەڕ بەخوان و کردەوەی چاکیان هەیە ، ئەو کەسانە بە گوێرەی فەرمودەی خوا موژدە پێدراون بەبەهەشت ، وەك لەئایەتی ﴿ ٣٠ ﴾ لەسورەتی ﴿ فعتلت ﴾ خوا ڕوونی کردوەتەوە .

٢- هەیانە خاوەنی باوەڕ نین و کردەوەی چاکیش ناکەن ، ئەو کەسانە بەگوێرەی فەرمودەی خوا شەیتان دەستەلاتی پەیدا کردووە بەسەریانا و خوا و ئایینی لەبیردونەتەوە و بوون بەدۆستی شەیتان هەتا ئەمرن ، ئاشکرایە ئەو کەسانە تووشی سزای بێ کۆتایی ئەبن بەبەلگەی ئایەتی ﴿ ١٩ ﴾ ی سورەتی ﴿ المجادلة ﴾ .

٣- هەیانە خاوەنی باوەڕن ، بەلآم لەتەمەنیانا کردەوەی چاکیان نەکردووە ، خۆیان بە تاوانبار ئەزانن ، ئەو کەسانە هەوالەی میهرەبانی خوا ئەکرێن ، بەگوێرەی ویستی خۆی کاریان لەگەلّ ئەکا ، ئەگەر پەشیمان ببنەوە خوا پەشیمان بوونەوەیان لێ وەرئەگرێ بەلگەی بۆ ئەو دوو مەبەستە ئایەتی ﴿ ١٠٣ ﴾ ی سورەتی ﴿ التوبە ﴾ و ئایەتی ﴿ ٤٨ ﴾ ی سورەتی ﴿ النساء ﴾ ە .

٤- ئادەمیزاد هەیانە بێ باوەڕن بەخوا ، بەلآم کردەوەی زۆری چاکیان هەیە بۆ سوودی گشتی ، برسیانی ئادەمیزاد تێر ئەکەن ، شەقام و خەستەخانە و خوێندنگا و

هەتیوخانە دروست ئەکەن ، هەر ڕێگەیە چاکبێ ئـەوان ئـەی گرنـە بـەر ، لـەسـەر بـێ باوەڕی خۆیان بەردەوام ئەبن هەتا مردن ، ئەو کەسـانە کـردەوەی چـاك و نـەکردنیان یەکسانە بەچاکەکانیان پڕ بەزەوی زێڕ بێ و بیبەخشن ، سزای خاوەن ئازاریان ئـەدرێ بەگوێرەی ئایەتی ﴿ ٩١ ﴾ ی سورەتی ﴿ ئالی عیمران﴾ .

بەڵام لـە ئەوەی خوای مەزن خاوەنی داد پەروەرییە چاکەی بێ باوەڕانیش لەخزمـەتی خوادا بێپاداشت ناڕوا ، وائەبێ لـەجیهاندا وەری ئگرێ بە پلەی بەرز و تووشی نەخۆشـی و ئازاریان ناکا ، وایش ئەبێ لـەپاشە ڕۆژدا سزای دۆزەخیان سووکترئەبێ‌لەبێ باوەڕانی تر بەو جۆرەی پێویـستبێ ئێمـە لـەو مەبەسـتە ناگـەین ، واچاکـە هەواڵـەی زانـین و داد پەروەری خوای بکەین .

خـوای مـەزنن نبەویستـی خـۆی بـاوەڕداران و دووڕووەکـان لـەیـەك جیـا ئەکاتـەوە کەبەبیانویەکی نـاڕەوا خۆیانیـان لـەڕیزی موسـوڵمانان دەرکـرد ، ئـەوەبو کـەباوەڕداران لەجەنگی ئوحودا تووشی ئازار بوون بـەهۆی بـێ فـەرمانی پێغەمـەرەوە ﴿ﷺ﴾، بـۆ ئـەوە لەڕێگەدا پاك و پیسی لەیەك جیا بکاتەوە ، بۆ ئەوەیش قورەیشی‌یەکان ووتیان : موحەمـەد ئەڵێ : هەرکەسێ دژی من بێ ئەچێتە د ۆزەخەوە و خوا لـەو کەسە بەخەشمە ، هەرکەسـێ لەگەڵ من بێ ئەچێتە بەهەشت و خوا خۆشی ئەوێ ، ئەگەر وایە بـۆ موحەمـەد هـەواڵمان ناداتێ هەتا بزانین چ کەسێ باوەڕدار و چ کەسێ بێ باوەڕە خوای مەزن فەرموی :

﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ 

﴿ ماكانَ اللهُ ليذرَ المؤمنينَ عَلى ما أنتُمْ عَلَيهِ حَتى يُمَيِّزَ الخَبيثَ مِنَ الطَّيِّب ﴾ خوا واز لەباوەڕداران ناهێنێ لەسەر شتێ ئێوەی باوەڕدار و بێ باوەڕ لەسەرینی لەتێکەڵاوی باوەڕداره پاكەكان و دووڕووەكان هەتا جیا ئەكاتەوە پیس لەپاك بەسر وش لەلایەن خۆیەوە بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەبۆنەی پەیدابوونی جەنگ ، هەر كەسێ دووڕوو بێ واز لەجەنگ ئەهێنێ ، دوژمنەكانی پێغەمەر دوو تاقمن:- یانێ بەبێ تاقیكردنەوە یەكەم جار نافەرموێ ئەو كەسەیا كەو ئەوەیا پیسە.

١- بت پەرستان :- ئەو كەسانەن بەئاشكراو بەنهێنی بێ باوەڕن ، لەیەكەم كاتەوە بڕیاری جەنگیان داوە ، كۆتایی بەدوژمنایەتی خۆیان هێنا بەكۆكردنەوەی چەند كۆمەڵ لەدژی ئیسلام ، ئامادەیان كرد بۆ جەنگ ئەوەی لەتوانایان هەبوو ، دوایی ئەوانە ناسراون و جیا ئەبنەوە لەموسوڵمانان .

٢- دووڕووەكان :- ئەو كەسانەن دوژمنی پێغەمەر و هاوڕێكانی پێغەمەرن لەپەنهانیدا و لەدڵەوە ، بەڵام خۆشەویستی خۆیان و دۆستایەتی ئاشكرا ئەكەن بۆیان ، هەموو كارە گرنگەكانیان تێك دانی ڕیزی موسوڵمانانە ، جارێ بە بەڵاو كردنەوەی پڕوپاگەندەی درۆ جارێ تر فریوی موسوڵمانان ئەدەن بەبێ فەرمانی خوا و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، جارێ تر بەترساندنیان لەبت پەرستان ، لەهەندێ جەنگدا دێنە نێو موسوڵمانان و لەنیوەی ڕێگەدا وازیان لێ ئەهێنن ، پێغەمەر و هاوڕێ پاكەكانی تووشی ئازار ئەبون لەبت پەرستانەوە ، بت پەرستان جەنگیان ئەكرد بەئاشكرا و ، دووڕووەكان لەنهێنیدا فێڵیان ساختە ئەهێنا ، ئەو كارانە ڕەوشتی دووڕووانە لەهەموو كات وجێگەیەكا بۆئەو كەسانەی داوای چاكە بكەن ، ئایەتی ﴿ ١٧٣ ﴾ ﴿ ١٧٩ ﴾ ی ئەم سورەتە و ئایەتی ﴿ ١١٢ ﴾ ی سورەتی ﴿ ئەلئەنعام ﴾ باسی ئەوانەی كردووە .. پێویست كرابوو لەسەر پێغەمەر هەركەسێ بەدەم شایەتمان بهێنێ وەك موسوڵمان تەماشای بكرێ ، خوێنی خۆیان و دارایيان پارێزراو ئەبێ ،

ئەکران بە هاوبەشی تالآن لەجەنگدا ، لەبەرئەوەی هێشتا ئیسلام تازە پەیدابوبو ، ئەگەر بکوژرانایە یادەوەریان بکردنایە مرۆڤانی ساویلکە ئەیان ووت : موحەمەد باوەڕدار و بێ باوەڕ بەلایەوە یەکسانە .

بی باوەڕان و بت پەرستان و دووڕووان بیانویان بۆ خۆش ئەبو بۆ بلاو کردنەوە پڕوپاگەندە لەدژی موسولمانان و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. بەو بۆنەوە پێغەمەر سەرگەردان بوو بە چ جۆرێ لەگەڵ ئەو دوو ڕووانە هەڵسێ و دڵیشی زۆر تەنگ بوو ، ئەگەر وەریانگرێ موسولمانان تووشی گومان ئەکەن ئەگەر وازیان لێ دێنێ یاریدەرانی موسولمانان کەم بنەوە وئاینی ئیسلام پەرەناسێنێ بۆیە خوای مەزن فەرمووی : خوا واز لەباوەڕداران ناهێنێ و باوەڕداران و دووڕووەکان لەیەك جیا ئەکاتەوە ، چرای ڕوناکی ئیسلام چاك و خراپ ئەناسێنێ بەدانیشتوان ئەو ئایەتە بە دووڕووان ڕائەگەیەنێ بەشایەتمان و نوێژ بەتەنها تاقی ناکرێنەوە ، چونکە ئەوانە زۆر گران نین و تووشی ئا زار نابن ، بەلکو بەوە باشتر تاقی ئەکرێنەوە جەنگ بکەن و خۆیان بکەن بە فیداکاری ئیسلام .

﴿ وَما كانَ اللّهُ ليطلعكم عَلى الغَيبِ ﴾ وەخوا ئاگاداری هیچ کەسێ ناکا بۆ زانینی شتێ ونبێ و لەدڵدا بێ . بلێ ئەو کەسە پاکە و ئەوەیان پیسە ، بەلکو ئێوە لەسەتانە بیان ناسن لەکاتی تەنگانە و سەختیدا ، بەوکارەی لەجەنگی ئوحودا ڕووی دا ، کاتێ پێغەمەر هاوڕێ بریندارەکانی بانگ کرد بچنە دەرەوە بۆ جاری دووهەم بۆ بەرگری لەدوژمنان چونە دەرەوە و کوتوپڕ ، خوا هەواڵ نادا بەشتێ لەدڵدایە و لەباوەڕ و لەدووڕوویی ، فەرمان ئەدا بەفیدا کاری و دانانی دارایی لەڕێگەی خوادا .

خوای مەزن هەندێ جار هەندێ لەپێغەمەران ئاگادار ئەکا لەسەر دووڕوویی مرۆڤێ و باوەڕداری مرۆڤێ تر ، هەرئەوەیش مەبەستە لەمانای فەرمودەی کەئەفەرموێ :

﴿ وَلَكِنَ اللّهَ يَجتَبِي مِنْ رُسَلِهِ مَنْ يَشاءُ ﴾ وەبەلام خوا هەڵئەبژێرێ لەنێردراوەکانی خۆی کەسێ ئارەزوی هەبێ هەواڵی ئە داتێ بەپەیام و ئاگاداری ئەکا لەسەر هەندێ

کاری نهێنی خۆی لەبێ باوەڕی هەندێ کەس و باوەڕدارایی هەندێ تر ، ئەوەیش بەتایبەتیهەر بۆ پێغەمەرانەو شایانی کەسی تر نییە .

﴿ فآمِنوا بِاللهِ وَرُسُلِهِ ﴾ دوای ئێوە باوەڕ بهێنن بەخوا کە هەر ئەو شاراوەکان ئەزانێ بەگشتی لەباوەڕ و لەدووڕوویی و بێ باوەڕی ، باوەڕبەنێردراوەکانی خوا بهێنن کەئەوانە هەڵبژێردراوی خوان و شاراوەکان نازانن ، مەگەر خوا بەپەیام ئاگاداریان بکگا لەسەر هەندێ لەشاراوەکان .

﴿ فإنْ تُؤمِنوا أو تتبعوا فَلَكُمْ أجرٌ عَظيمٌ ﴾ وەئەگەر ئێوە باوەڕ بهێنن بەو جۆرەی باسکرا ، خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی خوا و پێغەمەر ، دوایی بۆ ئێوە هەیە پاداشتێکی زۆر گەورە .

پاش ئەوەی خوای مەزن لەمەو بەر هانی ئادەمیزادی دا کە خۆیان بکەن بەفیداکار لەڕێگەی ئاییندا ، بۆ لەمەو دوایش هانیان ئەدا کەدارایی خۆیان ببەخشن هەر لەو ڕێگەیەدا و ئەفەرموێ :

وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ

ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾

﴿ وَلا يَحْسَبَنَّ الذينَ يَبْخَلونَ بِما آتاهُم مِنْ فَضلِهِ هُوَ خَيراً لَهُمْ ﴾ وەگومان نەبەن کەسانێکی ئەوتۆ ڕژدو دەست و شکن بەشتێ خوا بەخشیوێتی بەوان لەدارایی و گەورەیی خۆی چاك بێ بۆ ئەو کەسانە ، پێویست کراوە بیبەخشن بەهەژاران و نانیاندەنێ .

﴿ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَيُطوقونَ ما بَخِلوا بِهِ يَومَ القيامة ﴾ بەڵکو ئەو داراییە خراپە بۆ ئەوان لەمەو پاش ئەگەڕێ بەگەردانەی ملیان شتێ ئەوان ڕژدیان پێ کردووە و نەیان گەیاندوە بەجێگەی خۆی و زەکاتەکەیان نەداوە و دایان نەناوە لەجێگەی سود بەخشدا لەڕۆژی هەڵسانەوەیان لەگۆڕەکانیان ، گەردانەی ملیانە و ڕسوایان ئەکا .

﴿ وَلله ميراثُ السمواتِ والأرض ﴾ وەبۆ خوایە کەلەپوری دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەوی و گەنجینەی ئەوان ، دوای مردنیان لەدارایی و جگەی دارایی ، ئادەمیزاد وەك چۆن خاوەنی هیچ شتێ نەبوون یەکەم جار کەجیهان کۆتایی پێ هات هیچ کەسیان خاوەنی هیچ شتێ نین . ئیتر بۆ ئەبێ ڕژدی بکەن لەو شتەدا خوا بەخشیویە بەوان ، ڕوون و ئاشکرایە ئەوەی هەیانە هەر بۆ خوایە و ئارەزوی هەبێ لێیان ئەسێنێتەوە .

﴿ والله خبيرٌ بِما تَعمَلون ﴾ وەخوا بەو شتانەی ئێوە ئەیکەن ئاگادارە و ئەزانێ ، چۆنی دائەنێن ، ئەزانێ ئێوە ڕژدن یان ڕژد نین ، پاداشتی کاری خۆتان وەرئەگرن بەچاك یا بەخراپ .

لەنێو ڕووناکی ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەمانەی خوارەوەمان بۆ دەرئەکەوێ :

١) زۆر ترین ئایەتەکانی قورئان بۆمان ئەدرکێنن کەهەموو سامان و دارایی هەموو بونەوەرانیش و ئەوانەیش بەدەستی ئادەمیزادەوەن خاوەنی ڕاستەقینەیان نین ،

بەڵکو هەمویان هی خوان ، ئادەمیزاد کـار پـێ سـپێراوی خـوان بـۆ بـەکارهێنانی خۆیان و سامانیان بەگوێرەی ئەو یاسایە بۆیان دیـاری کـراوە و نابـێ لـەدەسـتوور دەرچن ، هەروەك ئەو کەسەی لـەم ڕۆژەدا کارێکی پێ ئەسـپێرێ لـەلایـەن کەسـێ ترەوە ، پێویستە چۆنی بۆ دیاری کراوە جێبەجێی بکا و لێی لانەدا .

٢) ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ وامان پیشان ئـەدەن ئـادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێ نین لـەسامان و دارایی ، خاوەنەکانیان هەر خوان ، وەئەبی بزانین خاوەنێتی سامان لـەم ڕۆژەدا سێ جۆرن :

أ- خـاوەنێتی تاکانـەیی بەرەڵایـەتی بـی سـنوور و بـی ژمـارە کـەبیرو بۆچوونـی سەرمایەدارەکانە ، دەست بەسەر دەرامەتی وولاتـان ئـەگرن و جگـەی خۆیـان کرێکارن .

ب- خاوەنێتی بەستراوەی دیاری کراو بۆ سامانیان کەبیرو باوەڕی سۆشیالیستەکانە.

ج- خاوەنێتی کۆمەڵایەتی کەکس خاوەنی هیچ شـتێ نیـە و هـەموو شـتێ سـامانی دەوڵـەتە و هەر ئەو خاوەنیانە .

ئەو سێ جۆرە خاوەن دارایییە ئیسلام بڕیـاری بوونیـان نـادا و هـەموویان پووچـن ، بەڵکو خوای مەزن خاوەنی ڕاستقینەیە بۆ هـەموو شـتێ بەتەنـها ، بڕیـاری داوە ئـادەمیزاد کارپێ سپێردراون بۆ بەکارهێنانی ئەو سامان و دارایییەی لایانـە بـۆ سـوودی خۆیـان و خێزانیان و هەژاران بەجۆرێکی دیاری کراو بۆیان ، بەو مەرجەی ئەو سامانە بەڕێگەیـەکی ڕەوا پەیدای بکا نەك بـەجۆرێکی نـاڕەوا ، بـەفێڵ و فـرو دزی و بـەرتیل پـەیدای نـەکا ، بازرگـانی مـەی و قومـار کـردن بـەکار نـەهێنن بـۆ پـەیدا کردنـی دارایـی ، کەواتـە کۆکردنەوەی سامان و بەکارهێنان و بەخشینی سنورێکی دیارکراویان بۆ دانراوە .

پرسیار / هەندێ لـەئایەتەکانی قورئان بەڵـگەن لـەسەر ئەمە کە ئادەمیزاد خاوەنی سامانی خۆیانن وێنەی ئایەتی ﴿ وَجاهِدوا بِأموالِكُم ﴾ وەئێوە جەنگ بکەن بەدرایییەکانی خۆتان .

وەڵام / ئەو خاوەنداریتی‌یە وێنەی ئەوەیە بەمیوانێ ئەبێژرێ : ئـەم خـانوو کـەل و پەلـە خۆت خاوەنیانی ، مانای وایە میوان بۆی هەیە لەوێدا بنوێ و بخوا ، مانای وانی‌یە خـاوەنی ڕاستەقینەیانە .

ئاینی ئیسلام دەستوری داوە بەئادەمیزاد دەستکاری ئەو شتانە بکەن لەژێر دەستیانایە و خۆیانیان ماندوو کردووە بۆ پەیداکردنیان بـەخواردن و پۆشـین بـۆ خۆیـان و خێزانیـان و هەژاران و شتی تر . لەجگەی ئەو شتانە خۆیانیان مـاندوو نـەکردووە بـۆ پـەیدا کردنیـان لەدارایی جگەی خۆیان قەدەغەیە کە دەستکاری کردنیان بەبێ دەستوری خاوەنەکانیان .

زانایان ئەڵێن : کاتێ خوای مەزن ئایەتی ﴿ مَنْ ذا الذي يَقرضُ اللهَ قَرضاً حَسَناً ﴾ ناردە خوارەوە یانی چ کەسێ هەیە قەرز بدا بەخوا قەرزێکی شیرین ؟ جوولەکەکان ووتیان خـوا هەژارە و ئێمە ساماندارین ، خوای مەزن ئـەو بـیرو بۆچوونـەی ئـەوانی پـوچ کـردەوە و فەرمووی :

﴿ لَقَدْ سَمِعَ اللهُ قَولَ الذينَ قالُوا إنَّ اللهَ فَقيرٌ وَنَحنُ أغنيـاء ﴾ بەڕاسـتی خـوا بیسـتبوی گفتوگۆی کەسانێکی ئەوتۆ ووتیان ، بەڕاستی خوا نەدارایە و ئێمە سامانداری و بێ ئیحتاجین هەرچەندە خوای مەزن ناوی ئەو کەسانەی نەبردووە خاوەنی ئەو گفتوگۆ ناڕەوایە بـوون ، بەڵام زانایان ئەڵێن : بریتین لەجوولەکـەکان وەك لەمـەو بـەر باسـکرا و لـەوانیش دوور نی‌یە. بەتایبەتی سامانداره‌کانیان بیرو بۆچوونی نالەباری زۆری لەو بابەتەیان هەیە .

بەڕاستی ئەو کەسانە ڕەخنە لەخوا ئەگرن بەزمان یا بەدڵ ، گفتوگـۆی ناپەسـەند دێـت بەدەمیانا ، بۆ نمونە بڵێن : خوا ئەو شتە بۆناکا و ئەمەیان بۆ ئەکا ؟ یا خوا هەژارە ، ئەوانـە بێ باوەڕن و سزای بەتینیان ئەدرێ ، ئەو هەموو گفتوگۆ ناشایستانە لەسـەریان ئەنوسـرێ وەك خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ سَنَكتُبُ ما قالوا وَقَتلَهُمْ الأنبيـاءَ بِغَـيرِ حَـقْ ﴾ دوایـی ئێمـە ئەینوسـین شـتێ ئـەوان ووتویانە و لای ئێمە وون نابێ ، ئەبێ بزانن ئێمە نەدارا نین و ئەوان هەژارن و پاشـەڕۆژیان

زۆر ڕەشە و ، ئەیشنووسین کوشتنی پێشووەکانیان پێغەمەران بەبێ مافی ڕەوا ، هەرچەندە ئەو جولەکانەی سەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێغەمرانیان نەکوشتووە ، بەلام چونکە بەو کوشتنە ڕازین وك ئەمان کوشتبێتیانن وایە ، کوشتنی پێغەمەران بەهەموو جۆرێ ناڕەوایە بەڵام جوولەکەکان کوشتنی پێغەمەرانیان لا ڕەوایە .

﴿ وَنَقولُ ذُوقوا عَذابَ الحريق ذلِكَ بَما قَدَّمَتْ أيديكُم وأنَّ اللهَ لَيسَ بِظَلاّمٍ لِلعَبيد ﴾

وەئێوە بەو کەسانە ئەڵێن : ئێوە بچێژن لەپاشەڕۆژدا سزای ئاگری دۆزەخ ، ئەو سزایە بەهۆی ئەو شتەوە بۆ ئێوە خۆتان کردتان لەبێ باوەڕی و بێ فەرمانی خوا و بەدەستی خۆتان کردبوتان و ، بەهۆی ئەوەیشەوە بەڕاستی خوا ستەم لەبەندەکانی خۆی ناکا ، کەواتە لەدادپەروەری خوایە سزای پیاو خراپان بدا و چاکە لەگەڵ پیاو چاکان بکا ، خوا نەبەکەم و نەبەزۆر ستەم لەکەس ناکا .

هەندێ لەزانایان و سەرۆکەکانی جوولەکەکان هاتنە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ووتیان تۆ لات وایە پێغەمەری و نامەت بۆ هاتووە ، ئێمەش خاوەنی نامەین و لەتەوراتا بەلێنمان پێ داوە باوەڕ بە هیچ پێغەمەرێ نەهێنین ، هەتا ئەو پێغەمەرە قوربانی‌یە ئەهێنێ ئاگرێ لەئاسمانەوە بێت و ئەو شتە بخوا و لەناوی ببا و بیسوتێنێ ، خوای مەزن بۆ ئەو مەبەستە فەرمووی :

ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾

﴿ الذين قالوا إن الله عَهِدَ إلَينا أن لا نؤمِنَ لِرَسولٍ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ئەیان ووت : بەڕاستی خوا فەرمانی داوە بەئێمە و ئامۆژگاری کردووین کەئێمە باوەڕ بەهیچ پێغەمەرێ نەهێنین .

﴿ حتى يَأتينا بِقُربانٍ تَأكُلُهُ النار ﴾ هەتا ئەهێنێ بۆ لای ئێمە قوربانی‌یە ئاگر ئەو قوربانی‌یە بسوتێنێ . قوربانی بەهەموو شتێ دائەنرێ کە مرۆڤ کارێ بکا و بیەوێ بەو کارە لەخوا نزیك بێتەوە ، ئەو کەسانەی ئەو گفتوگۆ نارەوا و خراپەیان ووت بریتیبوون لەو کەسانە ئەیان ووت : خوا هەژارە و ئێمە ساماندارین .

جوولەکەکان هەتا کاتی هاتنی عیسا خوا فەرمانی پێدا بوون ئەگەر قوربانیتان کرد نابێ بیخۆن . پێویستە لەسەرتان لەجێگەیە داینێن و چاوەڕوان بکەن ئەگەر ئاگرێ لەئاسمانەوە هاتوو ئەو قوربانی‌یەی سووتان ئەوە ئەوەئەگەیەنێ کە خوا ئەو قوربانی‌یەی وەرگرتووە ، ئەگەر ئاگرێ نەهاتایە مانای وا بوو خوا وەری نەگرتووە .

ئەو کەسانەی لەسەر کاری پوچ و نارەوان گومانیان وایە هەر خۆیان شایستەی هەموو شتێکن ، کارە خراپەکانی خۆیان بەدرۆ و بەدەلەسە و پرو پاگەندە بەرگی بریقەدار ئەکەن بەبەریانا ، بەتایبەتی بە زۆری ئەو کەسانەن بازرگانی بە جەنگەوە ئەکەن و ئاگری بۆ خۆش ئەکەن لەم لاو لەولا ، بەتەنها لەبەر سوودی خراپی خۆیان زۆر جارانیش بۆ ئەو مەبەستە ژن ومناڵ و دانیشتوانی بێتاوان ئەکوژن ،لەهەموو شتێ سەیر تر ئەمەیە : ئەڵێن : بەو کارانە ئاسایش ئەپارێزین . کەواتە کارێکی تازە نی‌یە جوولەکەکان بوختان و درۆ هەڵبەستن بەدەم خواوە و بڵێن : ئێمە باوەڕ بەموحەمەد ناکەین ، چونکە فەرمانمان پێ دراوە هەتا قوربانی نەهێنێ و ئاگر هەڵی نەلوشێ .

﴿ قُلْ قَدْ جاءَكُم رُسُلٌ مِنْ قَبلي بِالبَيناتِ وَبِالذي قُلْتُمْ ﴾ تۆ بلێ : بەڕاستی هات بۆ لای ئێوە چەندین نێردراوی خوا لەپێش منەوە ، وێنەی زەکەریا و یەحیا و عیسا بەچەندین نیشانە و کاری پەکخەر و ڕوون و ئاشکرا ، هاتبوون بەشتی ئەوتۆ ئێوە ووتتان و داواتان کرد کە قوربانیان دائەنا لەسەر ڕاستی خۆیان و ئاگرێ ئەهات و ئەیسوتان و باوەڕیشتان پێ نەهێنان .

﴿ فَلِمَ قَتَلْتُموهُمْ إنْ كُنْتُمْ صادِقِين ﴾ دوایی لەبەر چ شتێ ئێوە ئەو پێغەمەرانەتان کوشت ، یانێ ڕابوردووەکانتان کوشتیانن ئێوەیش بەو کوشتنە ڕازین ، ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لە داواکاری خۆتان و پەیڕەوی پێغەمەرەکانتان ئەکەن لەدەستووری قوربانی کردندا .

﴿ فإنْ كَذَّبوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِنْ قَبلِكَ جاؤا بِالبَيناتِ والزبر والكتاب المُنير ﴾ دوایی ئەگەر جوولەکەکان تۆیان بەدرۆخستەوە و باوەڕیانی پێ نەهێناوی ، خەفەت مەخۆ ، دوایی ئەوان بەدرۆ خراونەتەوە بە چەندین نێردراوێ لەپێش تۆ ، وێنەی نوح و هود و سالح و ئیبراهیم و جگەی ئەوان هاتبوون بۆ لای گەلەکانیان بەچەندین بەلگەی ئاشکرا لەسەر پێغەمەرایەتی خۆیان هاتبوون بۆ لایان بەچەندین نووسراو و نامەی ڕوناکی دەر بۆیان و ئامۆژگاری کەریان ، مەبەست لەزەبور ئەو نامەیە نیە هاتووە بۆ لای داوود .

پاش ئەو گفتوگۆ ناپەسەندانەی جوولەکەکان کردیان لەخزمەت پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ ، خوای مەزن بۆمانی ڕوون ئەکاتەوە هەمووومان چاوەڕوانی مردن ئەکەین ، خوا تۆ لەجوولەکەکان ئەسێنێ کەتۆ بەدرۆ ئەخەنەوە ئەفەرموێ :

كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ
وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ
عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ

إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾

﴿ كُلُ نَفْسٍ ذائِقَةُ المَوت ﴾ هەموو کەسێ ئەچەژێ مردن ، مردن پیاڵەیەکە ئەسوڕێتەوە بە سەر هەموو ئادەمیزادا ، پێغەمەر بن یا پیاو خراپ ، پاشا بن یا هەژار ، هەرگیز ڕاکردن لە مردن نی‌یە .

گەورەترین کارێ پزیشك و پرۆفیسۆرەکان بیریان لێ کردەوە ئەوەبوو هەوڵ و کۆششی زۆریان دا کە بۆ ماوەیە تەمەنی ئادەمیزاد درێژ بکەن و هەرگیز بیریان لەئەوە نەکردەوە ڕێگە لەمردن بگرن . گەورەترین کۆششیان بۆ ئەو مەبەستە ئەوەبوو هەڵسان بەدەر هێنانی دڵی پیاوێکی نەخۆش و ڕرواندنی لەجێگەی دڵی پیاوێکی تردا ، ئەنجامی کۆششیان بەبێ سوود دەرچوو سەرنەکەوتن ، لەدواییدا کەوتنە بگرە و بەردە لەنێو خۆیانا . بڕیاریاندا کە دەرهێنانی دڵو چاندنی لەجێگەی دڵێ تردا گەورەترین تاوانە ، چونکە نازانرێ ئەو مرۆڤە ئەژی یان ناژی هەتا دروستبێ دڵی دەربهێنرێ ، زۆر نزیکە ئەو مرۆڤە بێ هۆش بێ و پاش ماوەیە بکەوێتە جووڵە و بۆ ماوەیە تر بژی ، زۆر جاریش وابووە ، ئەبێ بزانرێ کەدەرهێنانی تاکە گورچیلەیەکی مرۆڤێکی ساغ و ڕوواندنی لەجێگەی گورچیلەی پیاوێ ترا وێنەی دەرهێنانی دڵ نی‌یە ، چونکە دڵ ئامێری سوڕاندنی خوێنە .

﴿ وإنّما توفون أجوركم يَومَ القيامـةِ ﴾ وەبەڕاسـتی ئێـوە وەرئـەگرن پاداشـتی كـاری خۆتان لەپاشە ڕۆژدا بەبێ كەم و كوڕی . ڕستەی ﴿ توفـونَ ﴾ لەگـەڵ ووشـەی ﴿ يـومَ القيامَة ﴾ وامان پیشان ئەدەن ئادەمیزاد بەر لەپاشە ڕۆژ خوا بەشێ لەپاداشتی كارەكانیـانی داونەتێ ، لەپاشەڕۆژدا ئەو بەشەكەی تریان ئەداتێ بەتەواوی .

﴿ فَمَنْ أخرِجَ مِنَ النار وأدخِـلَ الجَنَّـةَ فَقَدْ فـاز ﴾ دوایـی هەركەسـێ دوور خرایـەوە لەئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە بەڕاستی ئەو كەسە ڕزگاری بـووە و سـەركەوتووە و بەئاواتی خۆی گەیشتووە .

﴿ وَما الحياةُ الدُنيا إلاّ متاعُ الغرور ﴾ وەژیـان و زیندەگـانی جیـهان هیـچ شـتێ نی‌یـە ڕتبواردن و خۆشیەكی فریودەرە بۆ ئادەمیزاد ، هەر كاتێ خوا بەگـەورەیی خـۆی سـامانی بەخشی بەئادەمیزاد ئەبێ خزمەتی ئایین و مرۆڤایەتی پی بكات نەك بەكاری بهێنێ بۆ زیـانی خـۆی و ئـادەمیزاد ، ئەگـەر بـەكاری هێنـا لەوانـەدا ئەبێتـە هـۆی بـەختیاری خـۆی ، بەپێچەوانەوە ئەبێتە هۆی فریودانی .

﴿ لِتَبلونَ في أموالِكُم وَأنفُسِكُم ﴾ سوێند بەخوا ئێوە تاقی ئەكرێنـەوە لـەبارەی دارایـی خۆتانەوە و كاتێ لـێتان سەنرایەوە ئایا ئێوە ناسوپاسـی ئەكـەن یـان نـە ، ئایـا ئـەو دارایـیە ئەبەخشن لەرێگەی خوادا و ، تاقیتان ئەكاتەوە لەبارەی خۆتانـەوە كاتـێ تووشـی بـەڵا و ناخۆشی و كوشتن و برینداری و لێدان و دیل كردنتان ئایا ئێوە ئارام ئەگرن یان نا ؟ خـوا هەموو شتێ ئەزانێ ، بەڵام ئەو تاقی كردنەوەیە بۆ ئەوەیە دانیشتوان بەنیازی ئێوە بزانن .

پێغەمەر نوسراوێكی بۆ فەنحاسی كوڕی عـازورا نووسـی و بـە ئەبوبـەكردا بـۆی نـارد داوای یارمەتی لێ كردبوو بەدارایی ، ئەویش ووتی خوای ئێوە هەژارە هەتا داوای یارمـەتی بكا . دووبارە كەعبی كوڕی ئەشـرەف لەجوولـەكـەكان لەهۆنراوەیـەكدا جنێـوی دابـوو بەپێغەمەر و بت پەرستانی هاندابوو لەسەر جـەنگ كـردن لەگـەڵ موسـوڵمانان ، خـوای مەزن فەرمووی :

﴿ ولتسمعن مِنَ الذیـنَ أتـوا الكِتـابَ مِـنْ قَبلِكُـمْ وَمِـنَ الذیـنَ أشـرَكوا أذىً كثـیراً ﴾ وەبەڕاستی ئێوە ببیستن لەكەسانێكی ئەوتۆ بەخشراوە بەوان نامەی خـوا لـەپێش ئێـوەوە ، ئەمیشی ببیسێ لەكەسانێكی ئەوتۆ هاوبەشیان دائەنا بۆ خوا ئازاری زۆر بـۆ ئێـوە لـەجنێو دان بەپێغەمەر و تانە دان لەئاین و هاندانی بت پەرسـتان لەسـەر جـەنگ لەگـەڵ ئێـوە و بوختان كردن بۆ خوا .

﴿ وَإنْ تَصْبروا و تَتقوا فَإنَّ ذلِكَ مِنْ عَزمِ الأمُور ﴾ وەئەگەر ئێوە ئارام بگرن و خۆتـان ڕاگرن لەسەر ئەو ئازارانە تووشتان ئەبێ و لەسەر جەنگ كردن و ، خۆتان بپارێزن لـەبێ فەرمانی خوا ، دوایی بەڕاستی ئارام گرتن و خۆ پاراستن لەكارە ناڕەواكان لـەو كارانەیـە پێویستە مرۆڤی ژێر نیازی بكا و جێبەجێیان بكا .

خوای مەزن هەڵوێستی خاوەن نامەكان دەر ئەخا كە دژی ئەو پەیمانانەن داویانە بـەخوا و دژی ئەو ئامۆژگاری‌یانەن پێغەمەرەكانیان كردویانە ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ :

وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾

﴿ وإذا أخَذَ اللهُ مِثاقَ الذین أوتوا الكِتابَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو كاتـە بكـەرە خـوا وەری گرت پەیمانی كەسانێكی ئەو تۆ بەخشراوە بەوان نامەی خوا، ئەو خاوەن نامانە بریتـین لـە زاناكانی جولەكەو گاورو زاناكانی موسڵمانان، نامەكانیش بریتین لە تەورات و ئینجیـل و قورئانی پیرۆز.

﴿ لتبْننه للناسّ ولا تكتمونه ﴾ بە ڕاستی ئەو پەیمانە ڕون بكەنەوە بـۆ ئـادەمیزادو نـەی شارنەوە لەوان. ئەو پەیمانە بریتیە لە ڕون كردنەوە هەموو ئەو شتانەی لەو نامانەدان. كـار

بەدەستانی دەوڵەت چەندین جێگەی بۆ موچە خۆران دروست کردووە. بۆ هەمویان کاریانی بۆ دیاری کردوون، پەیمانی لێ وەرگرتوون ئەو کارانە بەدەست پاکی و بە نیازی چاکەو جێبەجێ بکەن. یاسای تایبەت بۆ سزادانیان داناوە هەر کاتێ لە سنوری دیاری کراو بۆخۆیان دەرچن.

خوا ئادەمیزادی دروست کردوە، فەرمانی پێ داون بەو شتانەی چاك و ئاشتی بێ بۆ ئەوان. لەوانی قەدەغە کردووە شتێ زیان بگەیەنێ بەوان. خوا پێغەمەرانی هەڵبژاردووە فەرمانەکانی خۆی ڕابگەیەنن بە بەندەکانی، فەرمانی داوە بەو پێغەمەرانە پەیمان وەرگرن لە هەموو ئەو کەسانە ئەو پەیمان بەوان ڕائەگەیەنێ ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە ئەو فەرمانانە ڕوون بکەنەوە بۆ ئادەمیزاد. کەواتە زانای ئاینی لێپرسراوە لای خوا بەوەی نێرراوە بۆسەر پێغەمەر ڕوونی بکەنەوەو دای نەپۆشن، بە تەواوی هەروەك موچە خۆرانی دەوڵەت لێ پرسراون ئەمان لەبەردەم دەوڵەتاو ئەوان لەبەردەم خوادا... ئەوانیش پەیڕەوێکی گشتین تایبەت دار نین بۆ زانایەو جگەی زانایەتر، بە خاوەن ئایین و بێ ئایین بە باوك و بە نەوەکانیان لەو کارانەدا زانایانی ئیسلام باری سەرشانیان قورسە و نابێ کەمتەرخەمبن.

﴿ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً ﴾دوایی ئەو کەسانە فەرمانەکەیان فڕێدایە پشتی خۆیانەوەو گرنگیان پێ نەدا و ئاوڕیان لێ نەدایەوەو، ئەوان کڕییان و وەریان گرت بەو پەیمانە نرخێکی کەم لە شتە نەماوەکانی جیهان.

﴿ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾ دوایی خراپە شتێ ئەوان کڕیان و هەڵیان بژارد بۆ خۆیان و بەردەوام نابێ، ئەو ئایەتە پیرۆزە پیشانمان ئەدا جگەی زانایانی خاوەن نامەکان لە زانایانی ئیسلام ئەگەر ڕاستی یاسای قورئان بشارنەوە بۆ دڵخۆش کردنی کاربەدەستان، بۆ دەست هێنانی پلەو پایەی جیهان و پەرە پێدانی سامان، ئەو زانایانە خۆیان کردووە بە بچوکی شەیتان بۆ کەمترین نرخی ئەمرۆ.

هەندێ لە زانیان بەوانەوە ناوەستن، بگرە نامەی خواو فەرمودەی پێغەمەر ئەگۆڕن لە بەر ڕەزایەتی دڵی کاربەدەستان و ساماندااران بەوانا هەڵئەدەن بە پەخشان و هۆنراوەی

بریقەدارو ناپەسەند بۆ بەدەست هێنانی ماشین و کۆشك و پارەی زۆرو ئەو شتانەی قەدەغەن لای خوا، کردەوەی ئەو زانایانە وا دەرئەخەن کە باوەڕیان بە جگەی سامانی ئەمڕۆ نەبێ و قورئانیان لە تاقا داناوەو کاری پێ ناکەن.

زاناکانی جولە خۆیانیان گیف ئەکردەوە لە کاتێکا دانیشتوان ڕێزیان لێ ئەگرتن، لە خۆیان بایی ئەبوون کە بە زانایان ئەزانن، بۆ ئەو مەبەستەو مەبەستێ تر لە کردەوە خراپەکانیان خوای مەزن ئەفەرموێ:

لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾

﴿ لا تَحْسَبَنَّ الذِيْنَ يَفْرَحُونَ بِما أتَوْا وَيَحِبُونَ أنْ يُحْمَدُوا بِما لَمْ يَفْعَلُوا ﴾ موحەمەد تۆ گومان مەبە بەو کەسانەی ئەو تۆ شادمان و دڵخۆشن بە شتێ ئەیکەن لە گۆڕینی شێوەی تۆوە پێیان خۆشە باسیان بکرێ بە چاکە بەشتێ نەیان کردووە، بەوان بیێژرێ باوەڕدارن و هەژار دۆستن کەچی ئەو شتانە لەوانەوە دوورن.

﴿ فَلا تَحْسَبَنَهُمْ بِمغازَةٍ مِنَ العَذابِ وَلَهُمْ عَذابٌ عَظِيمٌ ﴾ دوای تۆ گومان مەبە ئەو کەسانە ڕزگاریان ئەبێ لە سزاو، بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایەکی گەورەی خاوەن ئازار.

شادمانی خۆی لە خۆیا قەدەغە نیە بە گوێرەی یاسای ئیسلام، چ کەسێکە شادمان نەبێ لە کاتی دەست کەوتنی چاکەیەو هەواڵێکی خۆشدا؟ یا ڕزگاربوونی لە ڕووداوێکی

خراپ. بەڵکو شادمانی مرۆڤ لەبەر ئەوەی جگەی خـۆی چاکەیـەکی توشـبوە بەڵگەیـە لەسەر نیاز پاکی ئەو کەسە و ئایین پەروەری ئەو. ئەوە بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ شادمانی دەربڕی لە کاتی گەڕانەوەی جەعفەری ئامۆزای لە حەبەشەو نێـو چـاوانی مـاچ کـرد فـەرمووی: نازانم من بە هاتنەوەی تۆ شادمان بم یا بە گرتنی خەیبەر.

بەڵام شادمانی خراپ و بیزارو ئەمەیە: مرۆڤ شادمانبێ بە دڵپیسی و لەکەدار کردنـی خربی و بەفریودان و دەعیەزلی، یـا شـادمانبێ بـەوە پیـاوێ سـامانەکەی تـاڵان کـراوە یـا کوژراوە یا شادمانبێ بە خەڵـەتاندنی پیـاوانی سـاویلکەو هەڵسـان لـە دژی ئیسـلام. یـا بەکارهێنانی مەیی و ئارەق و داوێن پیسی و کاری خراپ، شادمانی بۆ ئەو شتانە گونـاهی گەورەن و لە وانەیە مۆڤێ بێ باوەر ببێ.

پرسیار / خوای گەورە لەو ئایەتە مەزنەدا دووچار ڕستەی (وَلا تَحْسَبَنَّ) دووپا کردووە هۆی چیە؟

وەڵام / لەبەر ئەوەیە گوێ کران نەکەونە دوو دڵی و گومانەوە بە هۆی درێژی ڕستەی یەکەم، بۆ ئەویش ناوەڕۆکی مانای یەکەم بە ڕستەی دووەهەم بە هێزتربێ و چاکـتر بچێتـە مێشکەوە نمونەی ئەو جۆرە باسانە زۆر بەکارئەهێنرێ، بە تایبەتی لە نوسین و لـــە پەخشـی ڕاگەیاندن و ڕادوێیدا. وەك ئەبێژرێ: گومان مەبەرە بێ باوەڕان هەر شتێ ئـەڵێن، گومـان مەبە ڕاست ئەکەن.

پرسیار / ووشەی (عذاب) لەو ئایەتەدا هۆی چ شتێکە دووجار بێژراوەو سودی چیە؟

وەڵام / جیاوازی لە نێوان ئەو دوو ڕستەیەدا هەیە، چونکە ڕستە یەکەم ئەوەمان پیشـان ئەدا ئەو کەسانە ڕزگاریان نابێ لە سزا بەبێ ئەوەی جۆری سزاکە ڕوون نەبێتەوە، ڕستەی دووهەم ئاشکرای ئەکا سزاکە گرانە، وەك ببێژرێ: من تۆم خۆش ئەوێ، وەخۆشم ئـەوێی زۆر.

زانایان بیری جۆراو جۆریان هەیە لە هۆی هاتنە خـوارەوەی ئـەو ئایتـە جگـە لـەوەی لەمەوبەر باسی کرا، هەندێکیان ئەڵێن: مالومەکانی جولەکە هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو

ئایەتەن، چونکە باسی پێغەمەریان لە تەوراتا شاردوەتەوە پێیان خۆشبوو ناویان ببرێ بە چاکە. هەندێ تریان ئەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی دوو ڕوەکانە کەوازیان لە پێغەمەر هێنا لە جەنگدا، لە خزمەت پێغەمەردا بە درۆ بیانویان ئەهێنایەوە، بەو بیانوە پێغەمەر لێیان خۆشببێ، ئەوانیش بەو لێ بوردنە شادمان ئەبوون بە چاکە باسیان بکرێ.

هەندێ تر ئەڵێن: هاتوە خوارەوە دەربارەی ئەو کەسانە پەیمانیان لێ وەرگیرابوو کەباسی پێغەمەر نەشارنەوە کەچی ئەو پەیمانەیان فڕێدایە پشتی خۆیان، شادمان بوون کە نەشیان کردوە بە چاکە باسیان بکرێ. هۆی هاتنە خوارەوەی هەرشتێ بێ مەبەستە کە ناگۆڕێ. لەوانەیشە بۆ هەموویان هاتبێتە خوارەوە، ئەو کەسانە بە هەر شێوەیە بووبن درێژەیان بە خراپەی خۆیاندابێ ڕزگاریان نابێ لە سزای خوا.

﴿ واللهُ مُلْكُ الَماواتِ والأرضِ ﴾ وە بۆ خوایە پاشایەتی و خاوەنداری ئاسمانەکان و زەوی هەر خوا هەڵیان ئەسوڕێنێ، هەڵسوڕێنەری هەموو ئەو بونەوەرانە بە لە ناویاندان لە فریشتەکان و ئادەمزادو جنۆکەو درەخت و گیاو بەرد و خاك و زێڕو زیوو ئەڵماس و ئاوو ئاگرو هەموو ئەستێرەکان. هەموو بونەوەران خوا دروستی کردوون و ئەیان مرێنێ و زیندوویان ئەکاتەوە وە پاداشت و تۆڵەیان ئەداتەوە بە گوێرەی کردەوەی خۆیان و کەس توانای خوا نیەو هاوبەشی نیە، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ واللهُ عَلى كُلِ شَئٍ قَدِيرٌ ﴾ وە خوا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە لە پاداشت دانەوەی پیاوچاکان و تۆڵە کردنەوە لە گونهباران، بە خێوکردنی هەموو بونەوەران و هەڵسوڕاندنیان، ئیتر چۆن ئەبێ ئەو کەسانە دژی خواو یاسای ئەوبن، چۆن ڕزگاریان ئەبێ لە تواناو دادپەروەری پاشا و پەروەردەکەری خۆیان.

قورەیشیەکان چونەلای جولەکەکان ووتیان: موسا بە چ کارێکی پەك خەرەوە هاتووە. ووتیان دار دەستێکی زۆر گرنگ و دەستی سپی بریقەداری پێدرابوو بۆ پەك خستنی دوژمنانی ئایین. چونەلای گاورەکان ووتیان: عیسا چ شتێکی پێدرابوو، ووتیان کەرو لاڵ

و کوێرو بەڵەکاوی چاك کردەوەو مردوی زینـــدو ئـەکردەوە. چونـە خزمـەت پێغەمـەرو ووتیان: نۆ کێوی سەفامان بۆ بکە بە زێڕ، بۆ ئەو مەبەستە خوا فەرموی:

إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن

ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾

﴿إن فِي خَلْقِ السّماواتِ والأرْضَ وَأختِلاف الَيْلِ والنَهار﴾ بە ڕاستی هەیە لە دروست کردنی ئاسمانـەکان و زەوی و ئـەو شـتانەی لـەنێو ئـەواندان و لـەسـەریانن لـە فریشـتەو ئەستێرەکان، لە زیندەوەران و گژوگیاوکانەکان و شتی ترو، هەیە لە گۆڕین و هـاتوچۆی شەوڕۆژ، شەو ئەڕواو ڕۆژ دێت، ڕۆژ ئـەڕواو شـەو دێـت، جـاری وا هەیـە کـاتی شـەو زۆرترەو کاتی وا ئەبێ کاتی ڕۆژ زۆرترە.

﴿لأياتٍ لأوْلِي الألْبابِ﴾ چەندین نیشانەی ئاشکرا لەسەر یەکێتی خوا بۆ ئەو کەسـانە خاوەنی ئەقڵی تەواون و پاکن لە خراپە و گومان و خراپی پێ ئەدۆزنەوە.

لە ئایەتی (٢٢-١٦٤)ی سورەتی ئەلبەقەرە وێنەی ئەم ئایەتە باسی کرا لەگـەڵ باسـی هەندێ لەو بەڵگانە، لەبەر ئەوەی ناوەڕۆکی ئەو باسە زۆر گرنگە بۆ جـاری سـێهەم لـەم سورەتەدا دووپات کرایەوە.

لەم سورەتەدا بە شێوەیەکی کورت و بە جۆرێ تر باسی هەندێ تر بەڵگە لە سەربوون و توانای خوای مەزن ئەکرێ.

گەورەترین ڕێکە بۆ ناسینی خوای مەزن کە لەو ئایەتانەدا بۆمان دەرئەخەن مرۆڤی ژیرو خاوەن بیر ئەگەر تەماشای ئەم بوونەوەرانە بکا بە وردی بۆی دەرئەکەوێ ئەو کردارە سەر

سورھینەرانە کە دێن و ئەڕۆن و ئەوەستن و ئەرۆێنرێن و سەوز ئـەبن بـەو رێـك و پێکانـە ھەیانە بۆی دەئەکەوێ کە ئەو بونەوەرانە خۆیان بۆ خۆیان ھەواڵ ئەدەن بە ئـادەمیزاد بـەو مەبەستەی بۆی ھاتوون، ھەموویان لە جێگەی شـیاوی خۆیانـا دانـراون بـە چـاکی و بـە چالاکی و کاریگەری ھەڵساون لە رێك خستنداو ھەڵسوڕاندنی ژیاندا. ئەوانە ھـەموویان لە خۆیانەوە نەھاتونەتە بونەوەو بە دوو شت کە ئەقڵ و ھەسـتە بـە بـێ گومـان ئـادەمیزاد ڕائەکێشن بۆلای دروست کەرێکی تاك و تەنھای خاوەن زانست و تواناو ھەمیشە زینـدوو خاوەن بیستن و ئاگادار لە ھەموو شت و بە توانا بۆ دانانی ھەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا... لە زۆرترین کەسەوە ئەبیسرێ و بگـرە ئەوانـەیش بڕوایـان بـە بوونـی خـوا نیـە ھەموویان بڕوایان وایە یەکەمین ھۆیە ھەیە بۆ پەیداکردنی ئەم بونەوەرانە و دروستکردنیان. ئێمەی موسڵمان ناوی ئەو ھۆیە ئەبەین بەخوا، جگەی موسڵمانان نـاوی ئـەبن بـە مـادەو کەرەسە یا بە سروشت. تەنھا ھەر بەناو جیاوازن. موسڵمانان ئەڵێن: ئەو ھۆیە بـە ئـەقڵ و بە بەڵگە ئەزانرێ نەك بە ھەست و بـە چـاو کـە ئـەوە خـاوەنی زیندەگـانی ھەمیشـەیی و زانست و تواناو ھەموو کارێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و دادپەروەرە. بەڵام جگەی موسڵمانان لایان وایە ئەو ھۆیە ئەم بوونەوەرانـەی دروسـت کـردووە بـە چـاوو ھەسـت ئەبینرێ و ئەزانرێ کە مادەیە یا سروشتی کوێرو کەڕو لاڵ و بێ جوڵەیە. کەواتە جیاوازی نێوان باوەڕداران و بێ باوەڕان و خوا نەناسان بـە ئـەندازەی دووری نێـوان زەوی ئاسمـان زۆرترە.

﴿ الَّذِيْنَ يَذْكُرُونَ اللهَ قِياماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ ناوی خوا ئەبن و یادی ئەکەن بە ھەموو شێوەێ و لە ھەموو کاتێکا بە تایبەتی لـە نوێژەکانیـان، ھـەرگیزبێ یادی ناکەن بە وەستانەوە لە کاتی تواناداا، بە دانیشتن و بە ڕاکشان و لەسەر تەنیشتیان لە کاتی بێ تواناییدا. یا یادی خوا ئەکەن لە کاتی نوێژە سونەتەکان بە دانیشتن و بە ڕاکشان، کەواتە ئەو کەسانە واز لە یادی خوا نایەرن لە ھەموو کات و شێوەیەکدا.

﴿ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ﴾ ئەو کەسانە بیر ئەکەنـەوە بـە ووردی لـە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی بە ئەستێرەو هەواو کێوو دەشت و ئاوو ڕوبارو خۆرو مانگ و شتی تریانەوەو ئەیان کەن بە بەڵگە لەسەر توانای خوای مەزن.

جۆرەکانی بەندایێتی بۆ خوا سێ بەشن: بڕوا کردن بە دڵ. بڕیاردان بە زمان و کـردەوە بە ئەندامەکان. فـەرمودەی خـوا ( يَذْكُرُونَ ) ئامـاژە بـۆلای بـەندایێتی بـەزمان ئـەکات. فەرمودەی خوا ﴿ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ ﴾ ئاماژە بۆلای بـەندایێتی بـە ئەندامـەکان. فەرمودەی خوا ﴿ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السماواتِ وَالأَرْضِ ﴾ ئاماژەیە بۆلای بەندایێتی خـوا بە دڵ و بە بیرکردنەوەو بە گیان. ئادەمیزاد لەو سێ شـتە بـەدەر نیـە کـە بـەو سـێ شـتە بەردەوامبون لەسەر بەندایێتی، مانای وایە بە هەموو لەشی لە بەندایێتیدایە.

پێشەوا شافیعی ئەفەرموێ: ووشەی (وَعَلَى جُنُوبِهِمْ) ئامـاژە بـۆ ئـەوە مرۆڤـی نـەخۆش پێویستە لەسەریان لە کـاتی نوێـژدا لەسـەر تەنیشـت ڕاکێشـن. لـە باسـی پزیشـکیدا وا دەرئەکەوێ بیرکردنەوەی ئادەمیزاد لەسەر تەنیشت چاکترە لەسەر ئـەوەی لەسـەر پشـت ڕاکێشێ.

بە ڕاستی ئەو کەسانە بیر بکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بڕوای بێگومـان پەیدا ئەکەن بە تاك و تەنهایی خواو زانست و توانای بێ هاوتایی ئەڵێن:

﴿ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە تۆ ئەو دروسـت کراوانـە لـە ئاسمانەکان و زەوی و هەموو بونەوەران دروست نەکردون بەبێ سود، بۆ کارێکی شیاوی لە جێگەی خۆیا دانـراودا دروسـتت کـردوون، هەریەکـەیان بـۆ کـاری تایبـەتی خۆیـان دروست کراون. پەروەردگار بە جۆرێکـی سـەر سوڕهێنەر هـەڵیان ئەسـوڕێنێ و یاسـای ڕاستیانت بۆ داناون. ئەو بونەوەرانە بە جۆرێ پەیدا بوون لە کاری خۆیانـا بـە پرسـیارن، چۆن هاتونەتە بدنەوە ئەبێ بەرەو نەمان بڕۆن، پاداشت و تۆڵەی خۆیان وەرگـرن، کەواتـە ئێمە بیر ئەکەینەوە لە سزاو لێت ئەپارێینەوە ئەڵێن:

﴿ سُبْحانَكَ فَقِنا عَذابَ النار ﴾ پاك و دوری بۆ تۆیه كه تـۆ بـەبێ سـوود بونـەوەرانت دروست كردبێ، هەموو كارێكت لـه جێگەی شیاوی خۆیا داناوه، دوایی ئێمه تـۆ بپـارێزه لـه سزای ئاگری دۆزەخ.

﴿ رَّبنا إنَّكَ مَنْ تُدخِلَ النار فقد أخذيتَهُ وَما لِيلظالمينَ مِنْ أنصارِ ﴾ ئەی پەروەردەكـەری ئێمه هەركەسێ تۆ ئەو كەسه بخەیته نێو ئاگری دۆزەخ ، دوایی بەڕاستی ئەو كەسەت ڕسوا كردووه و ، نیه بۆ سـتەمكاران هیـچ كەسـێ یاریدەیـان بـدا و ڕزگاریـان بكـا . ئێمـەی موسوڵمان هەر خوا ئەپەرستین بەئارەزوی خۆمان و كەس زۆرمـان لێ ناكـا و ڕەزامـەندی خوامان ئەوێ لـەهۆكارنی ڕسـواكردنی دوورین ، هـەر كەسـێ یارمـەتی كـاری پـوچ و نارەوای دا ، ئەمڕۆ پاشەكشێ بكا لـەیاریدەی ڕاستی و واز لـەستەمدانی ئـادەمیزاد نـەهێنێ لـەپاشەڕۆژدا یارمەتی دەری نیيه .

هەتا ئێره ئەو پاڕانەوانەی پێشوو بۆ ئەو شتانه بوو بەبەڵگـەی ئـەقڵی ئەدۆزرانـەوه كـه بیركردنەوه بوو لـەدروست كردنی ئاسمانەكان و زەوی ، لـەمەو پاش پاڕانەوەی ئـەو شتانه ئەكرێ پەیوەندیان به بەڵگەی بیستراوه وه هەیه و ئەفەرموێ :

﴿ رَّبنا إنَنا سَمِعنا مُنادياً ينادي لِلإيمان أنْ آمَنـوا بِرَّبكـم فآمنـا ﴾ ئـەی پەروەردەكـەری ئێمه: بەڕاستی بیستبومان جاڕچیيه بانگی ئادەمیزاد ئـەكا بـۆ باوەڕهێنـان ، خـوای مـەزن ناوی ئەو بانگ كەرەی نەهێناوه ئایا قورئانه یا پێغەمەر ، هـەركامیانبێ جێگـەی خۆیـەتی ، كه ئێمه باوەڕبهێنین بـه پەروەردەكـەری ئێـوه ، دوایـی ئێمـه باوەڕمـان هێنـاوه بـەخوا و بەپێغەمەر و ئایینی ئیسلام .

﴿رَّبنا فأغفِر لَنا ذنوبنا وَكَفِرْ عَنّا سَيئاتنا وَتوفنا مع الأبرار ﴾ ئەی پەروەردەكـەری ئێمـه دوایی تۆ خۆش ببه لـەگوناهه گەورەكانی ئێمەو دایبۆشەو ببوره لـه گوناهــه بچوكـەكانمان و، تۆ گیـانی ئێمـه بكێشـه لـەسـەر بـاوەڕ و لـەگـەڵ ئـەو كەسـانەی دەسـتیان و گرتـوه بەفەرمودەی قورئان و پێغەمەر ، لـەپێغەمەران و پیاو چاكان .

﴿ رَبّنا وأتنا ما وعَدتنا عَلى رسلِكَ ﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە ببەخشە بەئێمە شتێ تۆ بەڵێنت داوە بماندەیتێ لەسەر زمان و فەرمودەی نێرراوەکانی تۆ .

﴿ وَلا تَخزِنا يَومَ القيامة إنَّكَ لا تُخْلِف الميعاد ﴾ وەتۆ ئێمە ڕسوا مەکە لەرۆژی هەڵسانەوەمان لەگۆڕەکانمان ، بەڕاستی تۆ پێچەوانەی بەڵێندانی خۆت ناکەی ... لێرەدا باسی ئەمانەی خوارەوە ئەکەین :

١- بێگومان یادی خوا ، باوەڕهێنان بەخوا ، بەندیەتی خوا چاك و شیرینن ، بەلاّم چاکتر لەیادی خوا و شەو نوێژ و ڕۆژووگرتن و کردنی کردوەی چاکە لەبەر ئادەمیزاد ، خۆ دانانە لەڕێگەی سوودی گشتی ، داواکردنی ڕێزداری لەخوا بێ فیداکاری بێ بەها و بێ نرخە .

٢- هەرچەندە دروستکردنی هەموو شتێ بێسوود نی‌یە ، ئەبێ بزانرێ هیچ شتێ لەسەر خوا پێویست نی‌یە هەرشتێ خوا بیکا ناشیرین نی‌یە ، دروستکردنی هەموو شتێ لەلایەن خواوە لەبەر هیچ هۆیەکی پێویست لەسەر خوا نی‌یە بەو جۆرەی زانایانی ئەشاعیرە ڕوونیان کردۆتەوە .

﴿ فأستَجابَ لَهُمْ ربُّهُمْ إنّي لا أضيعُ عَمَلَ عامِلٍ مِنكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أو أنثى ﴾ دوایی پەروەردەکەری ئەوان وەلاّمی ئەوانی دایەوە و فەرمووی : کەبەڕاستی من لەناو نادەم پاداشتی هیچ کارگوزارێ لەئێوە لەپیاو و لەژن ، هەموو شتێ پەیوەندی بەکردەوەی خۆتانەوە هەیە ، نەك بەخۆتان و بەرەگەزتانەوە . ئێوە هەمووتان یەك ڕەگەز و یەك ئاینتان هەیە و بەیەك چاو سەیر ئەکرێن .

بەو ڕستەیە بەگەورەترین و بەکورت ترین شێوە مافی ڕەوای ژنانمان بۆ ئەچەسپێ شان بەشانی پیاوان بەبێ جیاوازی و زمانی دوژمنانی ئیسلام ئەبرێ ، ئەوەی دوژمنان داوای ئەکەن بۆ ژنان ئاینی ئیسلام بەر لە (١٤٢١) ساڵ مافی ژنانی داوە ، بەلاّم وا دیارە لای ئەوان مافی ژنان بریتیە لەبێ باوەڕی و داوێن پیسی و بەڕلاّیی و تێکەلاّوی پیاوان و

گۆرانی و سووردۆان و راپێچ کردنیان بۆ ناو کارگاکان و ماندوو کردنیان لەئیش کردندا ، بەپێچەوانەی ئایینی ئیسلام رێزی ژنان بریتیە لەوە لەهەموو رویێکەوە چ ئابووری یا رامیاری و کۆمەلایەتی خوێندن و خاوەنێتی سامان و هەموو کاری رەوا وەك پیاو بن بەبێ جیاوازی چونکە ،

﴿ بَعضُکُمْ مِنْ بَعضٍ ﴾ هەندێ لەئێوە لەهەندێ ترتانن ، ژن لەپیاو پەیدا بووە ، پیاو لەژن پەیدا بووە وەك پیاو باوکتانە ژنیش دایکتانە ، هەردوو لاتان براو خوشك یا جوتەی یەکترین ، هەموتان لە ئادەمن و ئادەمیش لەخاکە ، ئەو کەسانەی لەنرخی ژن کەم ئەکەنەوە لەنرخی خۆی کەم ئەکاتەوە .

﴿ فَالذینَ هاجَروا وَأخرِجوا مِنْ دیارِهِم ﴾ دوایی کەسانێکی ئەوتۆ کۆچیان کردووە لەنیشتمانی خۆیان و لەبت پەرستان هەلّهاتوون ، خزمەتی پێغەمەریان بۆ خۆیان هەلّبژاردووە ، دەرکراون لە جێگە و نیشتمانی خۆیان ، بێ باوەران دەریان پەراندون ، ئەبێ لەبیرمان نەچێ پلەی کۆچ کراوان لای خوا گەورەتر لەپلەی دەرکراوان ، چونکە ئەوان بەخوایشتی خۆیان پێغەمەریان هەلّبژاردووە ، ئەمان دەرکراون و ناچاریان کردوون.

﴿ وَأوذوا في سبيلي وَقَاتَلوا وَقُتِلوا لَأكفرَنَّ عَنهُمْ سَیِّئاتِهِم ﴾ وەئازاردراوان لەرێگەی پەرستنی ئایینی مندا لەوێنەی بیلالی حەبەشی و سوهەیلی رۆمی و هەموو موسولّمانانی تر بەگشتی و ، جەنگیان کردووە و کوژراون بەراستی من دائەپۆشم و لائەبەم لەوان خراپەکانیان لەگەورە و بچوکیان .

﴿ وَلَأُدخِلَنَّهُمْ جَناتٍ تَجري مِنْ تَحتِها الأنهارُ ثَواباًمِنْ عِندِ اللهِ واللهُ عِندهُ حُسنُ الثَواب﴾ وەبە راستی من ئەو کەسانە ئەخەمە چەندین بەهەشت ئەروا بەژێر درەختەکانیان و بەم لاولای کۆشکەکانیان چەندین رووباری ئاوی خۆش و بەتام ، من پاداشتیان ئەدەمەوە بەپاداشتێ لەلایەن خواوە بەگەورەیی و میهرەبانی خۆی و ، لەلای خوایە پاداشتی شیرین لە سەربەستێ بەجۆرێ پاداشتی وا نەبینرابێ .

پاش ئەوەی زانرا هەموو پاداشتێ پەیوەستە بەکردوەی چاکەوە ، لەژنانەوە بێ یا لەپیاوانەوە ، خوای مەزن بۆمانی ڕوون کردەوە ئەو کردارانە پاداشتیان دووپات ئەکرێتەوە بۆ خاوەنەکانیان ئەم کردارانەی خوارەوەن :

١- کۆچ کردن لەجێگەیە نەتوانرێ خوا پەرستی تێدا بکرێ بەسەربەستی بۆ جێگەیە تر بتوانرێ خوا پەرستی تێدا بکرێ ، بەو بۆنەیەوە زانایان لایان وایە ئەگەر موسوڵمانان نەیان توانی بەئازادی دروشم و دەستوری ئاینی خۆیان جێبەجێ بکەن لەووڵاتی بێ باوەڕان پێویستە لە سەریان ئەو جێگەیە بەجێ بهێڵن لەهەموو کاتێکا و کۆچ بکەن بۆ شوێنێ تر کەبتوانن بەئاسایش خوا پەرستی خۆیانی تێدا بکەن ، ئەو کۆچ کردنەیش ئەبەسترێ بەتوانای خۆیان ، ئەگەر نەتوانرێ کۆچ بکەن یا هەموو شوێنێ وەك جێگەی خۆیان وابو یاخراپتر لەو کاتەدا گوناهبارنین لەکۆچ نەکردندا ، زۆر جێگەی سەرسوڕمانە لەم سەردەمەی ئێمەدا کەنیشتمانی بەو جۆەی پێویستبێ یاسای خوا بخرێتە کار ، کاربەدەستانی بەناو موسوڵمان بەبێ وێژ دانا نەڕێگەی پێ ئەکرن لەهەندێ جێگەدا ، بەپێچەوانەوە لەهەندێ نیشتمانی بێ باوەڕان بەئەوپەڕی سەربەستی خوا پەرستی تێدا ئەکرێ و باوەڕداران ئەتوانن بیروڕای خۆیان بڵاو بکەنەوە و ئازاریان نادرێ .. بەداخەوە لاوانی موسوڵمانان لەم سەردەمەی ئێمە دا لەبەرئازاری کاربەدەستان یا لەبەرشتێ تر هەڵدێن بۆ هەندێ لەنیشتمانی بێگانە ، پارەو پوولی زۆر لەگەڵ خۆیان ئەبەن بەفیڕۆی ئەدەن بەبێ سوود لەکاری خراپدا ، بەڵام هەرگیز بیر لەوەناکەنەوە لەجیاتی ئەوەی ئەچن بۆ ئەوروپا بچونایە بۆ ووڵاتی ئیسلام بەئاسایش بژینایە و خواپەرستیان بکردایە ، یابەلای کەمەوە خۆیان بەکردەوەی خراپەوە هەڵنەکێشن ، هەرچەندە ئەو جێگایانەش وائەبێ باشتر نین لەئەوروپا .

٢- هەروەها لەو ئایەتانەی پێشوودا ڕوون ئەبێتەوە ئەوکەسانەی دەرئەکرێن لەنیشتمانی خۆیان بەبێ تاوان خوای مەزن پاداشتی زۆریان پێ ئەبەخشێ ، بەوێنەی

موسوڵمانە دەرکراوەکانی سەردەمی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بت پەرستان لەنیشتمانی خۆیان دەریان ئەکردن ، جوولەکەکان فەلەستینیەکانیان دەرکرد ، بەفەرمانی پاشاکانی سەفەوی و هەوشاری و کەمال ئەتاتورکی ماسۆنی و ڕەزاخانی پەهلەوی بەهەزاران کوردی موسوڵمان بەبێ تاوان هەر لەبەر ئەوەی کوردن لەنیشتمانی خۆیانیان دوور خستنەوە لەساڵانی (١٩٧٧) هەتا ساڵی (١٩٧٨) کاربەدەستانی هەرێمەکانی دەوروبەری کوردستان هەزاران خانەوادەی کوردیان ئاوارە و دەربەدەر کرد ، بەدەیان شار و دێهاتەکانیان بەمزگەوتەوە ڕووخاند ، قورئانی پیرۆزیان سووتاند و پەڕەکانی ئەچوو بەئاسماندا ، لەکاتی فەرمانڕەوایی بەعسیەکاندا.

٣- ئەو کەسانەی ئازاریان ئەدرێن لەڕێگەی بڵاو کردنەوەی یاسای قورئاندا خوای مەزن پاداشتی زۆریان ئەداتێ . ڕوون و ئاشکرایە ئەو کەسانەی پەیڕەوی یاسای قورئان ئەکەن ئازاری زۆریان ئەدرێ لەلایەن کاربەدەستانی ستەمکارەوە لەکۆن و تازەدا بەتایبەتی لەم سەردەمەی ئێمە دا بەکوشتن و گرتن و بەندو ئازار بەئامۆژگاری بێگانە .

٤- ئەو کەسانەیش خۆیان ئەکەن بەفیداکار بۆ فەرمودەی خوا و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خۆیان ئەدەن بەکوشت خوای مەزن زۆرتر لەهەمویان پاداشتی گەورەیان ئەداتێ ، ئەو چوار بەشە هەموویان خوا گوناهەکانیان لەسەر لائەبا ، سەرباری ئەوەیش پاداشتی گەورەیان پێ ئەبەخشێ .

ئەوە جێگەی داخ و دەردە بۆ باوەڕداران لەم سەردەمەی ئێمەدا شوێنێکمان دەست ناکەوێ کۆچی بۆ بکەین و بەسەربەستی خوا پەرستی تێدا بکەن و زمانی خۆمانی تێدا بکەینەوە ، بەیاسای قورئان کار بکەین ، چونکە کاربەدەستانی موسوڵمانان بەشناسنامە موسوڵمانن و بێ نوێژو بەیاسای قورئان کار ناکەن ، یاسای دەست کرد بۆخۆیان دروست ئەکەن و کەمێکیان نەبێ دژی فەرموودی خوان ، هەر بۆ ئەوەی ئەو پلە و پایەی ئەمڕۆیان لەکیس نەچێ ، قورئان ئەخەنە پشتیانەوە ئەو موسوڵمانانە دژی بیروباوەڕیان

کوژراون و بەند کراون لەناوبراون . مێژوو شایەتە کەعبەیان داوەتە بەر تیشکی ساروخ و ئاگریان تێ بەردا بۆ کوشتنی دوژمن بەبیروباوەڕیان .

ئەو دەوڵەتانەی دراوسێی کوردستانن ئەوەندە ڕەگەز پەرستن لایان وایە خۆیان هەڵبژاردەی گەلی خوان ، نایەڵن بەزمانی کوردی بنووسن و هەندێکیان زمانەکەیشیان لێ قەدەغە کردوون ، هەموو کەس لای ئەوان مافی چارەنووسینی خۆی هەیە جگەی کوردان.

ڕەگەز پەرستان لەنێو خۆیاندا دژی ڕەگەزی یەکترین کەچی بۆ دژی کوردان هاوسوێند و هاوبەشن و یارمەتی یەکتر ئەدەن بۆ دژی کورد و ئاوارەکردنیان .

بت پەرستان بەهۆی مامەڵەو بازرگانیەوە سامانی زۆریان پەیدا کردبوو بەخۆشی و تێر و تەسەلی ئەژیان ، هەندێ لەموسولمانان ووتیان ، دوژمنانی خوا لەو گوزەرانەدا ئەژین و ئێمەیش خەریکین لەبرسانا بمرین ، خوای مەزن ڕووی کردە پێغەمەر و دڵخۆشی دایەوە فەرمووی :

لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾

﴿ لا يغرنَّكَ تقلب الذين كفروا في البلاد ﴾ فریوی تۆ نەدا گەڕان و ڕۆیشتنی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بۆ بازرگانی و پەیداکردنی سامانی زۆر لەشارەکاندا .

﴿ مَتاعٌ قَليل ثُمَّ مأواهُمْ جَهَنَمَ وَبِئسَ المِهاد ﴾ ئـەو گەڕانـەیان و پێکـەوەنانی دارایـی و خۆشی و سود و ڕابواردنێکی کەمە و زوو لەناو ئەچێ ، لەپاشا جێگەی گەڕانەوەی ئەوان لەپاشەڕۆژدا ئاگری دۆزەخە ، خراپ ژێرە خەرێکە ئامادەیان کردووە بۆ خۆیان .

خوای مەزن ئادەمیزادمان بە دووبەشەوە بۆ باس ئەکا :

١- ئەو کەسانەن سامان و ڕابواردنی جیهان بۆ خۆیان هەڵئەبژێرن و واز لەئایین و بەزەیی وداد پـەروەری ئـەهێنن ، دڵیـان هـەر بـۆ لای سـوودی خۆیـان ئەکەوێتـە خورپـە، جوولەکەکان و شاگردە چاو چنۆکەکانیان لەهەموو سەردەمێکا ، ئـەو بەشـەیان خـوا بەبێ باوەڕی داناون و جێگەیان دۆزەخە ، لەو ئایەتەدا پیشانی داین کە نرخ بۆ ڕاسـتی دانانێن .

٢- ئەو کەسانەی ئایین و خوا پەرستی و ترسـان لـەخوای مـەزن بـۆ خۆیـان دا ئـەنێن و خاوەنی باوەڕن و لەخەشم و گوناهی بێ فەرمانی خوا خۆیان ئەپارێزن ، ئـەم بەشـەیان جێگەیان بەهەشتە و میوان و خۆشەویستی خوان و بەم شێوەیە بۆمان ئەفەرموێ :

﴿ لكِنَّ الذين أتقوا ربهم لَهُمْ جَناتٍ تَجري مِـنْ تَحْتِـها الأنـهارُ خـالِدينَ فيـها ﴾ بـەلاّم کەسانێکی ئەوتۆ لەسزای پەروەردەکەری خۆیان ترساون و خۆیـان لـەگوناه پاراسـتووە ، کالاّو والاّی دڵ فرێـن و ڕابوردنـی ئـەمڕۆ فرێـوی نـەداون لەڕێگـەی نـاڕەوادا سـامانی خۆیانیان دانەناوە بـۆ ئـەو کەسـانە هەیـە چـەندین بەهەشـتی وا ئـەڕوا بـەژێر درەخـت و کۆشکەنیاندا چەندین ڕوبار و جۆگەی ئاوی شیرین و بێ خەوش و بەتام بەردەوامن لـەنێو ئەو بەهشتانەدا و لە خۆشیدا ئەژین و دڵخۆشن.

﴿ نُزُلاً مِنْ عِندِ اللهِ وَما عِندِ اللهِ خيرٌ لِلأبرار ﴾ شێوەی ئەو بەهشتانە بەجۆرێکـە ئامـادە کراوە خواردن و خواردنەوە لەواندا بۆ کەسانێ ئەچنە ناویـان و میوانـداری چاکیـان بـۆ ئەکرێ و پێش کەشیان ئەکەن ، بەوان ئەبێژرێ دابەزن بـەو دابەزینـە ڕێزگـیراوە لەلایـەن خواوە شتێ لای خوایە لەڕێزگرتن و خواردەمەنی بەردەوام چاکترە بۆ خـاوەنی چاکـەکان لەو شتانەی خراپەکاران پاڵ و پشتی تێدا ئەکەن لەبەرکەمی و نەمانیان بەگورجی .

ئەو کەسانە کار و کردەوەیان هـەر بـۆ جیـهان و سـامان زۆرکردنـە ، هـەموو کاتـێ لەهەوڵدان بۆ پەیداکردنی دارایی و سڵ لەقەدەغەکراوەکان ناکەنەوە ، زۆر ئاسانە سامانی زۆریان بۆ کۆ بکرێتەوە ، ئەو کەسانە لـەخوا ئەترسن و پەلاماری ڕێگەی ناڕەاو نادەن بـۆ پەرەپێدانی سامان و زۆرکردنی ، برسێتی هەڵئەبژێرن و قـازانج و سـوودی دانیشـتوانییان مەبەستە ئەو کمەسانمە بۆیان ناگونجێ سامانی زۆر بۆ خۆیان دابین بکەن .

بەو ئایەتەی پێشوو ئەو گومانە ناڕەوانەی دوژمنان سـەرنگون ئـەکا کەلـەلای هـەندێ کەس وا ئەزانن ڕژاندنی زۆر و هۆی ڕابـواردن بەسـەر بـێ بـاوەڕاندا چاکـترە بۆیـان و لەبەرئەوە خاوەن ڕێزن لای خوا ، وایش ئـەزانن دارایـیی کـەم و گوزەرانـی تەسـك و تروسك نیشانەی خراپی و بێ نرخیە ، بەو بۆنەوە خوای مەزن بەو ئایەتانـەی پێشـوو ئـەو گومانە خراپەی پوچ کردەوە .

کاتێ هەواڵی کۆچی دوایی نەجاشی پاشای حەبەشە گەیشتە خزمەت پێغەمەر فـەرموی بابچین نوێژی مردوی لەسـەر بکـەین ، دووڕووەکـان ووتیـان : ز ۆر سـەیرە و جێگـەی سەرسوڕمانە بۆ قەشەیەکی پیروکۆن نوێژ ئەکا و نایناسێ . خـوای مـەزن ئـەو باسـە ڕوون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ :

وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ

سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾

﴿ وَإنّ مِنْ أهلِ الكِتاب لمن يؤمن بالله وَما أنزلَ إلَيكم ﴾ وەبەڕاستی لەخاوەن نامەکان کەسێ بڕوا ئەهێنێ بەشتێ نێراوەتە خوارەوە بۆلای ئێوە ، نالێن عیسا و عوزێر کوڕی خوان و خوا بەتەنها ئەزانن و کوڕو هاوبەشی نیە .

﴿ وَما أنزِلَ إلَيهِم خاشعين لله ﴾ وەباوەڕ ئەهێنن بەشتێ نێرراوە بۆ لای خۆیان لەتەورات و ئینجیل ئەترسن بەکزۆلیەوە بۆ خوا و مل کەچی فەرمودەی خوان زۆر بەڕێزەوە ، نیشانەی ترسانیان لەخوا و جوێ بونەوەیان لەبێ باوەڕان ئەمەیە .

﴿ لایشترون بآیات ثمناً قلیلاً ﴾ ئەو خاوەن نامانە ناکڕن بەئایەتەکانی نامەکانی خوا و فەرمودەی خوا بەنرخێکی کەم ، ناو و نیشانەی پێغەمەر ناشارنەوە هەتا بەو بۆنەوە بەرتیل و پارە و پول بەدەست بهێنن ، شا گردەکانیان لەم سەردەمەیشدا زۆرن . بەداخەوە لەمەوبەر زاناکانی گاور و جولەکەکان وابوون ، ئێستایش هەندێ لەو کەسانە خۆیان بە زانای موسولمانان دائەنێن پەخشان و هۆنراوە لەبەردەم کاربەدەستاندا ئەخوێننەوە بۆ بەدەست هێنانی دارایی و سامان .

﴿ الئِك لَهُم أجرُهُم عند ربهم إن الله سریع الحساب ﴾ ئەو کەسانە بۆیان هەیە پاداشتەکانیان لەلای پەروەردەکەری خۆیان و بۆیان ئامادەکراوە ، بەڕاستی خوا لە پرسیارکردندا زۆر بەگورجی جێبەجێ ئەکا ، بەئاسانی پاداشتی باوەڕداران و سزای بێ باوەڕان ئەداتەوە لەماوەی کەمترین چرکەدا .

ناوەرۆکی ئەو ئایەتانەی پێشوو هەموو خاوەن نامەکان ئەگرێتەوە باوەڕ بەپێغەمەر بهێنن لەهەرکاتێکا بێ ، بەتایبەتی ئەوانەی سەردەمی پێغەمەر (ﷺ) وەك نەجاشی و عەبدولای

کورلای سەلام ، چونکە کە خوای مەزن باوەڕ لەبت پەرستان و کەسانی تر کەباوەڕیان بەهیچ نامەیەك نەبێ وەرئەگرێ ، بەچاکتر لەخاوەن نامەکانی وەرئەگرێ بەتایبەتی ئەوانەیان واز لە ئاینە پوچەکەی خۆیان هێنابێ .

﴿ يا أيها الذين آمنوا أصبروا ﴾ ئەی کەسانێکی ئەو تۆ ، باوەڕتان هێناوە ئێە ئارام بگرن و خۆتان ڕاگرن لەسەر ئازاری بیرکردنەوەتان و خۆماندوکردنتان بۆ دۆزینەوەی بەڵگە لەسەر ناسینی خواو ناردنی پێغەمەر و باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی . خۆتان ڕاگرن لەسەر ماندوو بونتان بۆ بەجێ هێنانی فەرمانە پێویست کراوەکانی خوا ئەوانەیشیان پێویست نین و چاك وایە بکرێن ، خۆتان ڕاگرن لەسەر ناخۆشی و خۆپاراستنتان لەو کارانەی قەدەغەکراون لەلایەن خوای مەزنەوە خۆتان ڕاگرن لەسەر ئازاری هەژاری و نەخۆشی و گرانی و جەنگ و ترس و شتی تر .

﴿ وَصابِروا ﴾ وەئێوە ئارام بگرن بەرامبەر بەدوژمنانی خوا لەجەنگدا و لەئارام گرتندا و بێ ئارامتر مەبن لەوان ، خۆتان ڕاگرن لەسەر ئازاری خێزانەکانتان و دراوسێکانتان .

ئادەمیزاد چەندە ڕەوشتی خراپ و پەستیان تێدا بێ لەڕق و خۆبایی بوون و چاوچنۆکی و دووڕوویی پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن ، ئەبێ خۆڕاگربن بۆ پەیداکردنی دژەکانیان ، ئەگەر بەو شێوەیە نەبن بەو جۆرە شایانبێ خۆڕاگر نەبوون و لەسەرئازاری خۆیان و جگەی خۆیان .

زانایان ئەڵێن : (الصبر والمصابرة ) بەمانا یەکن ، بێژراوە (الصبر) ئارام گرتنە لەسەر ناخۆشییە لەهیچ کەسێکەوە تووشی مرۆڤ نەبێ . (المصابرة) ئارام گرتنە لەسەر خراپەیە لەجگەی خۆیانەوە تووشیان ببێ وەك بریینداری .

﴿ وَرابِطوا ﴾ وەئێوە بەردەوامبن لەسەر جەنگ و خۆتانی بۆ ئامادەبکەن بەچەك و تفاقی پێویست ، هەرگیز سەنگەرەکانتان چۆڵ مەکەن ، نەوەك لەناکاودا دوژمن پەلامارتان بدەن و هورەتان نەمێنێ ، لەهەموو کار و کردەوەتانا پێویستە هەرلەبەر ترسی خوابێ هەتا پاداشتان زۆرتربێ و سەربکەون ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَأتقوا اللهَ لَعَلَكُم تفلحون ﴾ وەئێوە لەخوا بترسن و خۆتان ڕاگرن بۆ ئەوەی ئێوە ڕزگارتان ببێ و سەرکەون لەهەردوو جیهاندا و تووشی سزای خوا نەبن .

لەقورئانی پیرۆزدا لەزۆر جێگەدا خوا ئەفەرموێ : سەرکەوتن و سەربەستی هەر بۆ ئەو کەسانەیە لەخوا ئەترسن . بێگومان ئادەمیزاد تووشی خۆشی و چاکەو پاداشتی لای خوا نابن بەبێ خۆڕاگرتن و ئارام و ترسان لەخوا ، ئەگەر بەو جۆرە نەبن تووشی لێ بوردن و بەزەیی خوا نابن خۆراگرتن لەسەر ئازاری خۆیی و ئازاری دوژمنانی ئایین و لەسەنگەرەکان و چاودێری سنوور و پاسەوانانی بۆ ئەویە نەوەك لەناکاو دوژمن پەلاماری نیشتمان بدا ، ئەو خۆڕاگرتنە دەستوری هەموو دەوڵەتانە و بەردەوامە .

سورەتی نیساء هاتوەتە خوارەوە لەمەدینە ، دوای هاتنە خوارەوەی سورەتی (ئەلمومتەحینە ) ژمارەی ئایەتەکانی (١٧٦) ئایەتن .

ئەم سورەتە بەم جۆرانەی خوارەوە ناوەرۆکەکەی باس ئەکرێ .

١- لەسەرەتای سورەتەکەدا خوا فەرمان ئەدا بەهەموئادەمیزاد نەرم و لەسەرخۆ و خاوەن بەزەیی بن لەگەڵ خێزانی خۆیان و ژنان و هەتیوان ، تورە بەکارنەهێنن لە گەڵیانا ، چاودێریان بکەن و مافی خۆیان بدەنە دەستیان و دارایی و سامانیان بپارێزن.

٢- لەکۆتایی سورەتەکەدا خوای مەزن ، باسی ئەو کەسانەمان بۆ ئەکا ئەمرن و باوك و دایك و منداڵ و نەوەیان لێ بەجێ نامێنێ ، ناوی ئەو کەسانە ڕوون ئەکاتەوە میراتەکەی ئەیەن .

٣- لەناوەڕاستی سورەتەکەدا خوا فەرمان ئەدا بەئادەمیزاد لەگەڵ بێ باوەڕان و بت پەرستاندا جەنگ بکەن بۆ ئەوەی ئەو کارانەی لەسەر ئادەمیزاد گران و ناخۆشن نەمێنێ، خوای مەزن لەسەرەتای سورەتەکەدا باسی کارێکمان بۆ ئەکا کەبەهۆی ئەو کارەوە نەبێ ئادەمیزاد ناتوانن ئەو کارو داوایانە جێبەجێ بکەن ، ئەو هۆیەش لەپەروەردەکەری خۆیان بترسن ، بۆیە خوا ئەفەرموێ :

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبٗا ﴿١﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ يا أيها الناس أتقوا ربَّكُمْ ﴾ ئەی ئادەمیزاد ئێوە خۆتـان بپـارێزن لـەخەشـم و سـزای پەروەردەکەری خۆتان و لەخوا بترسـن ، سـەرپێچی لـەفەرمانـەکانی مەکـەن ، پـەلاماری پێویست کراوەکانی بدەن و دوورە پەرێز بن لـەقەدەغەکراوەکانیان .

خوای مەزن بەو ئایەتە ڕوو ئەکاتـە ئـەو کەسـانە لـەو سـەردەمەدا بـوون و ئەوانـەیش لەمەوپاش دروست ئەکرێن لەپیاوان و لـەژنان ، ئەوانە ناگرێتەوە بەر لـەهاتنی ئاینی ئیسـلام دروست کراون ، بەبەڵگەی ئەوە دەستوری ئیسلام نابێتە دەستور بۆ ئەوان و کاتی ئـەوان بەسەرچوە، بەگوێرەی یاسای ئەو کاتەی خۆیان پەرستنیان کردووە ، زۆر شتی وابـوە بـۆ ئەوان ڕەوا بووە و بۆ ئێمە قەدەغەیە ، بەپێچەوانەیشەوە .

ئەم سورەتە پەیوەندی زۆر پتەوی بەسورەتی پێشـەوە هەیـە ، چونکـە سـورەتی پێشـوو کۆتایی پێهاتووە بەڕستەی ﴿ وأتقوا الله ﴾ ، ئەم سورەتەیش دەستی پێ کردووە بەڕسـتەی ﴿ يأيها الناس أتقوا ربَّكُم ﴾ بەشێوە وەك یەك سورەت بن وایە ، هەردوو لایان ڕوکردنـی

گشتیە بۆ هەموو ئادەمیزاد .. ئادەمیزاد چۆن ئەبێ لەخوا نەترسن کەخوای مەزن بەبێ ئەندازە خاوەنی توانا و میهرەبانیە بۆیان ، ئەوەتا خوا ئەفەرموێ :

﴿ الذي خلقكم من نفس واحدة ﴾ پەروەردەکەرێکی ئەوتۆیە ئێوەی دروست کردووە بەتوانا و میهرەبانی خۆی لەنەبونەوە بەو هەموو ڕەنگ و شێوە و زمانە جیاوازانەوە هەتانە ، لەیەك کەسی تەنها کەبریتیە لەئادەمی باپیرە گەورەتان . مەبەست لەو کەسە ئەو ئادەمەیە بەتەنها کەبیروڕای زۆربەی زانایانەو باوەڕیان وایە خوای مەزن یەك ئادەمی دروست کردوە کەئەویش باوکی هەموو ئادەمیزادە .. هەندێکی کەم لەزانایانێ بڕوا بەوان نەکرا و گومانیان وایە کە بەر لەئادەم کەباپیرەی ئێمەیە بەدەیان ئادەمی تری دروست کردوە ، بەجۆرێ لەوانەیە هەندێ لەمانەی ئێستا نەوەی یەکێ لەوانە بن ، ئەو بیرە ناپەسەندە دژی دەرکەوتووی فەرمودەی خوا و پێغەمەرن ، بگرە هەندێ لەزانایانی بڕوا پێ‌کراو لایان وایە ئەو کەسە بیری وابێ جگەی یەك ئادەم ئادەمێ تر دروست کراوە ئەو بیرە ئەبێ بەهۆی بێ باوەڕی .. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ خوای مەزن بەر لەئادەمی باپیرەی ئێمە زیندەوەرانی زۆری دروست کردووە ، وەك فریشتەکان و جنۆکە و گیانەوەرانی تر جگە لەخوا کەسە نایانزانێ ، زۆریان بنەبڕبوون .

﴿ وخلق منها زوجها ﴾ وەپەروەردەکەر دروستی کردووە لەو کەسەتەنهایە ژنە هاوجوتەکەی خۆی کەحەوای دایکە گەورەی هەموو ئادەمیزادە .

زانایان هەندێکیان ئەڵێن : حەوا دروست کراوە لەپەراسویەکی ئادەم ، هەندێ تریان لایان وایە ئادەم و حەوا هەردوکیان دروست کراون لەیەك شت ئەویش بریتیە لەخاك ، هەر چۆنێ بێ خوا حەوای دروست کردووە بۆ هاودەمی ئادەم و حەسانەوەیان بەیەکەوە و زاوزێ بکەن بۆ فراوانی ئادەمیزاد.

﴿ وَبَثَ مِنها رجالاً كَثيراً وَنساءً ﴾ وەپەروەردگار بڵاوی کردەوەتەوە لەو کەسە و لەهاوجوتەکەی چەندین پیاو و چەندین ژنی زۆر ، ئەوەندە زۆربوون هەموو گۆشە

وکەناری زەویان گرتوەتەو زاوزێیان کردوە چین بەچین و جێگەی یـەکتریان گرتوەتـەوە ، بەجۆرێ ژمارەی ئادەمیزاد لـەم سەردەمەدا لـەشەش ملیار زۆرترن ، تەنها چـین لـەملیارێ زۆرترە .

﴿ وأتقوا اللهَ الذي تساءَلون بِهِ والأرحامَ ﴾ وەئێوە خۆتان بپارێزن لـەخواو بێ فـەرمانی خوا مەکەن ، ئەو خوایە لـەکاتی تەنگانەدا ئێوە بەهۆی ئەوەوە هـەندێکتان داوای یارمـەتی لـەهەندێ ترتان ئەکەن و ئەڵێن : لـەبەرخوا ئەو شتەمان بدەنێ ، ئەو کارەمـان بـۆ بکـەن . ئازارمان مەدەن و ، خۆتان بپارێزن لـەمافی خزمە ئازیزەکانتان ، واز لـەسەردانیان مەهێنن . ئەوەتا ئێوە ئەڵێن: لـەبەرخزمایەتی ئاگاتان لـێمان بێ ، خۆ ئێمە خزمین ، سەرمان لێ بدەن ، لـەسەرمان بێنە وەڵام و دوژمنانمان لێ دورخەنەوە .

بەکورتی خوای مەزن داوامان لێ ئەکا لـەم ئایەتەدا لـەخەشم و سزای بترسـین ، چاکـە لـەگەڵ خزمەکانمان بکەین ، خۆمان لـەوان بەگەورەتر نـەزانین و خـاوەنی هەرپلـەیـە بـین ، ستەم لـەخزمانمان نەکەین ، هەموومان لـەیەك ڕیشوین و لـەیەك کەسین و ئەویش لـەخاکـە ، بۆیە لـەکۆتایی فەرمودەکەیدا ئەفەرموێ :

﴿ إنَّ اللهَ كانَ عَلَيكُمْ رَقيباً ﴾ بەڕاستی خوا ئاگادارە بەسەرتانەوە ، پرسیار لـەئێوە ئـەکا لـەو شتەی فەرمانی داوە پێتان لـەمافی خزمەکانتان ، بەهەموو کاری نهێنی و ئاشکرای ئێوە ئەزانێ ، بۆیە پێویستە بێ فەرمانی خوا نەکەن و ئاگاتان لـەخزمانی خۆتان بێ ، ئەو کەسەی لای خۆشە خوا دارایی زۆری بداتێ سەر لـەخزمانی بدا.

خوای مەزن دوای ئەوەی فەرمانی دا بەخوا پەرستن و بـەجێ هێنـانی خزمایـەتی باسـی جۆری ترمان بۆ ئەکا لـەپەرستنی خوا کەبریتیە لـەهەوڵدان بۆ فراوانی زۆرکردنی دارایـی و سامانی هەتیوان ، ئامۆژگاری ئادەمیزاد ئەکا بەچ شێوەیە لـەگـەڵ هـەتیوان ڕەفتـار بکـەین دەربارەی دارایی و سامانیان . ئەفەرموێ :

﴿ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَـٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴾ (٢)

﴿ وآتوا اليتامى أموالهم ﴾ وەئێوە بدەنەوە بەهەتیوەکان دارابیەکانی خۆیان هەر کاتێ بالّغبوون کەلەوەوبەر درابونە دەستی ئێوە بەشێوەیەکی کاتی.

پێویستە ئەو کەسانەی هەتیون و سامانیان هەیە ، کاربەدەستان یاپیاوانی ئەو جێگەیە بۆ پاراستنی ساماناکانیان مرۆڤێکی ژیرودەست پاك و داوێن پاك دابنێن بۆ چاودێری کردنی ئەو سامانە و پەروەردەکردنی هەتیوەکان ، بەجۆرێ بن سوود و زیان بناسن بۆ ئەو سامانە.

ئەگێڕنەوە کارێ سپێراوی هەتیوان کاری ناشایستەیان لەگەڵ ئەکردن ، بۆنمونە مەڕێکی لاوازی خراپی خۆیانیان ئەگۆڕیەوە بەمەڕێکی قەڵەوی هەتیوان ، ئەیان ووت: چ خراپەیەکی تێدایە مەڕ هەر مەڕە ، بەهەڕەشەوە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَلا تبتدلوا الخبيث بالطيب ﴾ وەئێوە مەگۆڕنەوە ئەو شتە پیسەی ئەوتۆ خوا قەدەغەی کردووە لەسەرتان لەدارایی هەتیوان بەوشتە پاکەی ئەوتۆ خوا بۆئێوەی ڕەوا کردووە لەدارایی خۆتان ، لەدارایی ئەوان ڕابوێرن و بیخۆن و واز لەدارایی خۆتان بهێنن ، دارایی بێ نرخی خۆتان بگۆڕنەوە بەدارایی چاکی ئەوان بەبیانوی پوچ و لاواز ، پێویستە لەسەرتان چاودێریان بکەن.

﴿ ولا تأكلوا أموالهم إلى أموالِكُم ﴾ وەئێوە مەخۆن دارایی هەتیوان لەگەڵ دارایی خۆتان و تێکەڵاوی یەکیان بکەن و چاك و خراپی خۆتان و ئەوان بخۆن ، پیشەی ئێوە

ئەوەیە لەپاراستنی دارایی ئەوان دەرنەچن ، پێویستە مامەڵەیان پێوە بکەن بۆ فراوانی بونیان و پەرەپێدانی داراییەکانیان.

﴿ إِنَّهُ كَانَ حُوباً كَبِيراً ﴾ بەڕاستی خواردنی دارایی هەتیوان و گۆڕینەوە بەدارایی خراپ گوناهێکی گەورەیە ، هەر کاتێ ئێوە لەسنوور دەرچوون گوناهبار و تاوانبارن.

بەڕاستی ئادەمیزاد پاڵ ئەدەن بەلایەکەوە لەفەرمانەکانی خوای مەزن و بەجێگەی خۆیانیان ئەگەیەنن ، بەڵام لایە تر بەرئەدەن و وازی لێ ئەهێنن نوێژەکانیان بەتوندی ئەگرن، بەڵام مەی ئەخۆنەوە ، ئەبێ بزانرێ مانەوەی ئاینیان پەرەناسێنێ بەهەردوو لایان نەبێ ، بەجێ هێنانی هەموو یاسای قورئان پێویستە لەهەموو لایەکەوە ، هەڵسوارندنی پێویستەکانی ئاین بەبێ جیاوازی وێنەی پێویستەکانی جیهانە ، ئەگەر خوێندکارێ لەخوێندنگادا کۆشش لەڕێزمان و ژمێرەدا بکا و زانیاری و دوو وانەی واز لێ بهێنێ لەکۆتایی ساڵدا بێ بەش ئەبێ لە لەبەڵێن نامەبێ بەش ئەبێ لەهەموو وانەکاندا و بەروبومی تەمەڵی خۆی وەرئەگرێ هەروەها کاربەدەستان ئەگەر گوێ نەدەنە چاك کردنی ڕێگەو بان و ئاوبارە ، پاشەڕۆژی خۆیان و وولاتیان و ڕژێمیان ئەڕوا و لەناو ئەچن ، ئەبنە جێگەی نەفرەتی مێژوو ، ئیتر با لەلاکانی ترەوە سەرکەوتوو بن. پەیڕەو پرۆگرامی کۆمەڵایەتی قەوارەیەکی ڕێك و پێکە . بەبێ جیاوازی وێنەی قەبارەی لەشی مرۆڤە ، ئەندامێك لەئەندامەکانی توشی ئازاربێ هەموو ئەندامەکانی تری ئەو ئازار ئەچێژێ لەئەنجامدا هەموو ئەندامەکانی پەکیان ئەکەوێ و کارناکەن.

ئەو کەسانەیش لەکاتی هەڕەشەی قورئاندا لەبەرترسی خوا دارایی هەتیوان ناخۆن کە دراونەتە دەستی ، بەڵام خۆیان لەداوێن پیسی و کوشتن و ستەم ناپارێزن ، ئەو کارەیان ئەوە ئەگەیەنێ باوەڕیان بەهەندێ لەیاسا بێ و باوەڕیان بەهەندێ تری نەبێ ، ئەو کەسانە بەبێ گومان لەڕیزی بێ باوەڕاندا دانانرێن .

خوای مەزن چۆن خواردنی سامانی هەتیوانی قەدەغە کردووە ، داوێن پیسی و کوشتن و هەموو کاری ناڕەوای قەدەغەکردووە ، هەروەها قەدەغەیە بەجۆرێکی نائاسایی و ناڕەوا کچە هەتیوەکان مارە ببڕن ، ئەو کەسانەی کچانی هەتیویان لایە لەبەر قۆزی و جوانی و سامان مارەیان ئەبڕن لەخۆیان بەمارەیەکی کەم ، لەدواییدا زۆربەناپەسەندی لەگەڵیان ئەجوڵێنەوە ، چونکە لەکەس ناترسن ئەیانزانی کەس گومان ناباتە سەریان کەڕێگە بگری لەستەمیان.

خوای مەزن لەوبارەیەوە ئەفەرموێ:

وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾ وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًا مَّرِيئًا ﴿٤﴾

﴿ وإن خِفْتُمْ ألا تَقسْطَوا في اليَتافي ﴾ وە ئەگەر ئێوە ئەترسان کە دادپەروەری ناکەن لە مارە بڕینی ژنە هەتیوەکان، ئەترسان بە دادپەروەرانە کاریان لەگەڵ نەکەن بەو جۆرەی خۆیان تەنهان و هیچ کەسێ بەرگری لەوان ناکا، بە گوێرەی یاسا مارەییەکانیان نادەنێ دوایی واز لەو ژنە هەتیوانە بهێنن و جگەی ئەوان مارە بکەن و خوا گێڕاویە بۆ ئێوە ڕزگارتان ببێ لەو هەتیوانە و بەوە خوا چوار ژنی بەڕەوا داناوە بۆتان ، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ فأنكحوا ما طاب لكم من النساءِ مثنى وثلاثَ وَرُباع ﴾ دوایی مارە بكەن كەسێكی ئەوتۆ پاك و ڕەایە بۆئێوە لەژنان و دووان سێیان و چوار ، خۆتان ئازادن بۆ هەڵبژاردنی هەركام لەو ژمارانە ، بەو مەرجەی لەكاتی هێنانی زۆرتر لە یەك ژن دادپەروەری لەنێوانیان بەكار بهێنن و ستەمیان لێ نەكەن ، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ فَإن خِفتُمْ أنْ لا تَعدِلوا فَواحِدةٌ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە ترسان كەدادپەروەر نەبن لەنێوانیانا لەبەرگ و لەجێگەی دانیشتن و ئاموشۆكردنیان ئێوە یەك ژن مارە بكەن بەتەنها.

﴿ أو مامَلَكَتْ أيمانُكُم ﴾ یا ئێوە هەڵبژێرن بۆخۆتان كارەكەرێكی ئەوتۆ بەدەستی خۆتان پەیداتان كردوە ، بەخێو كردنیان ئاسانترە لەژنانی سەربەست.

﴿ ذلِكَ أدنى ألاّ تعدلوا ﴾ ئەو تاكە ژن هێنانە و هەڵبژاردنی كارەكەر نزیكترە كە ئێوە ستەم نەكەن لەنێوان زۆرتر لەیەك ژن و ، لەڕاستی لانەدەن.

ئەو ئایەتە ئەوە ناگەیەنێ زۆرتر لەچوار ژن قەدەغەبێ ، بەلاّم فەرمودەكانی پێغەمەر و پێك هاتنی كۆڕی موسولمانان بەگشتی لەیەكەم جارەوە هەتا ئێستا چین بەچین بڕیاریانداوە كەزۆرتر لەمارەبڕینی چوار ژن قەدەغەیە ، هەڵسان بەپێچەوانەی ئەو بڕیارە بێ باوەڕیە .

عەبدولاّی كوڕی عومەر ئەگێڕێتەوە : غەیلانی كوڕی سەلەمەی سەقەفی موسولمان بوو (١٠) ژنی هەبوو هەمویان لەگەڵیان موسولمان بوون. پێغەمەر فەرمووی: چواریان بۆخۆت هەڵبژێرە ئەوانی تریان قەدەغەن ، هەروەها قەیسی كوڕی حاریس موسولمان بو (٨) ژنی هەبو پێغەمەر فەرموی : چواریان هەڵبژێرە ئەوانی تریان قەدەغەن هەروەها چەند ڕووداوی تر لەو بابەتە ڕوی داوە . بەلاّم زۆرتر لە چوار ژن بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕەوا بووە.

مەبەست لەداد پەروەری هەڵسانە لەگەڵ ئەو ژنانە بەیەكسانی لەبەرگ و خواردن و لاخەوتن و شوێنی حەسانەوە و هەمو شتانەی لەتوانای ئادەمیزادان . نەك ئەو شتانەی

لەتوانا و دەسەلاتی ئەواندا نەبێ ، وەك خواست و هەستی خۆشەویستی دڵ کەلەژێردەسەلاتی ئەواندا نەبێ بۆ یەکێ لەو ژنانە ، باسی ئەم خواستەی دڵ لەئایەتی (١٢٨) ی ئەم سورەتەدا دێت لەوێدا بەدرێژی باسی دەکەین.

بێ باوەڕان و دوژمنانی ئیسلام ئەو کەسانەی بەئاوی خراپی ئەوان پەروەردە کراون ، بەرانبەر بەیاسای ئیسلام بۆ مارەکردنی هەتا چوار ژن،ئەو کەسانە پڕوپاگەندەی ناپەسەندی زۆریان بلاوکروەتەوە و ئەیشی کەن، بەبێ ئەوەی لەپێویستی و سوودی دانیشتوان وورد ببنەوە کەتوشی کاری ناهەموار ئەبن ، ئەوکەسانە ئەیانەوێ ئادەمیزاد وەك ئاژەڵ وابن و بێن و بڕۆن و بخۆن بەبێ پەروەردە و بەبێ ئابڕو ئارەزوی ژن و مێردی خۆیان بەبێ سنور و بەبێ یاسا دیاری کراو ساردبکەنەوە لەهەرکەسێ‌بێ ڕەوابێ یا قەدەغە. بەبێ دەستوری ڕێك کەوتوو لەگەڵ سروشتی ئادەمیزادا جیهان بەسەر ببەن.

خوای گەورە خۆی ئادەمیزادی دروست کردوە ، زۆر بەباشی سروشتیان ئەناسێ ، هەرخوایش ئەزانێ چ یاسایە سوود بەخشە بۆیان و لەڕەوشت دەرناچێ و خوی ئاژەڵی ناگرن، بۆیە ئاینی ئیسلامی بەیاساو پەیڕەو و پرۆگرام و دەستور هەتاهەتایە ، چەسپاوی پەسەندە لەگەڵ ژیان و سروشتیانا . ئاینی ئیسلام بێگومان ئادەمیزاد بەرەلاناکا بە هەمو شێوەیە ئارەزوی ئاژەڵی خۆیان بچەسپێنن ، هاتوە بۆئەوەی سنورێکیان بۆدیاری بکا . وازیان لێ‌ناهێنێ هەموو کارو ڕەوشتی پەسەند بخەنە ژێر دەسەلاتی خراپی پیاوان ، چۆنیان ویست دەستکاری مافی خۆیان بکەن . بەتایبەتی لەبارەی ژن و مێردی و نەریتی کۆمەلایەتی ، بۆیە ئاینی ئیسلام بۆیانی دیاری کردووە بۆ سوودی پیاوان و ژنان و بۆ پاراستنی ناموسیان ڕەوایە بۆیان مارەکردنی ژنان هەتا چوار ژن لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە :

بەڕاستی ئاینی ئیسلام پەیڕەوی ئاسایی و سروشتی بێ پۆخلەیە بۆ ئادەمیزاد لەگەڵ بەرێوەبەردنی پێویست و ڕوداوی گۆڕڕاوی ژیانیان ڕێك ئەکەوێ لەهەموو جێگە و لەهەموو کاتێکا .

ئایین پەیڕەوی پەیدا بووی بێ خراپەیە ، ئەیەوێ ئادەمیزاد لەسروشتی ئاژەڵی وێنە و نەزانین و پەستیەوە لایان بدا و بەرزیان بکاتەوە بۆ وەرگرتنی پەیڕەوێکی وا ڕەوشتی پاك و زانین و ڕێز پەرە بسێنێ لەناویانا ، بەجۆرێ سروشتی بێگەردی خۆیانیان لەبیر نەچێتەوە ، بەخواست و خوایشتی خۆیان ئەو ڕەوشتە هەڵبژێرن .

ئاینی ئیسلام لەسەر جێگەیەکی هەڵدێر و بۆش و چەپ و بەرەڵایی و بێ ڕەوشتی و ئەفسانە بازی و جادوپەرستی و ئاواتی خەو و وێنە نەوەستاوەکە لەکات و چرکەیەکدا بروخێ و بکەوێ . یا بچێ بەگژی ڕەوشتی سروشتی ئادەمیزادا ، لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەیاندا بدەن لەیەکتری ، وەك هەموو بیرو باوەڕی ڕابوردو کەناوی لەمێژوودا نەمێنێ ، وك ئەوان گڕبسێنێ و ببێ بەدوکەڵ و هەوا و بڵاو بێتەوە بەئاسماندا و نەمێنێ .

ئاینی ئیسلام دەستورێکە چاودێری ڕەوشتی ئادەمیزاد و پاکی کۆمەڵ ئەکا ، ڕێگە نادا بەوە کۆمەڵێکی مایە پوچ و هەوەس و کەڕەسە پەرست ، خوی بێ ڕەوشت وا پەیدابێ خاوەنەکەی ڕەوشتی دابەزێ و کۆمەڵ پیس بکەن. وەك ئەم سەردەمەی ئێمە کاربەدەستان کۆڕ و کۆمەڵ بۆ خۆیان دروست ئەکەن بەزۆر و هەڕەشە کچان و ژنانی قەشەنگ لەکۆلیج و لەپەیمانگا و خوێندنگاکان ئەڕازێننەوە ، پۆشاکی جوان ئەکەنە بەریان ، ئەیان بەنە دەرەوە لەسەر شەقامە گشتیەکان دەستیان پێ ئەکەن بەسوڕدان و گۆرانی ووتن و دەهۆڵ و زوڕنا لێدان وێنەی ئاژەڵ سەیریان ئەکەن ، بەشەویشدا ئەیان بەن و کوڕیان پێ ئەڕازێننەوە و پەرداخی مەیان پێ ئەگێڕن ، ئەو مایە پەرست و بێ ڕەوشتانە بەچەکوش ژیان و ناموس و ئاینیان لەسەردەزگای ئاسن ئەکوتنەوە لەئاژەڵ پەست تر تەماشای کچ و کوڕیان ئەکەن.

ئاینی ئیسلام ئەیەوێ هەموو کاتێ یاسای قورئان دابەزێنێ و یاریدەی ئادەمیزاد بدا بۆ پاراستنی ڕەوشتی بەرزی ئادەمیزاد ، کۆمەڵێکی داوێن پاك و خاوەن کردەوە دروستبێ ، هەریەکە لەوان بەکەمترین ماندووبون زۆرترین و گەورەترین سوود بەکۆمەڵگای ئادەمیزاد ببەخشن.

ئەگەر ئێمەی ئادەمیزاد لەگەڵ ئەو کارە پێویستانەدا بڕۆین کەپەیڕەوی ئاینی پیرۆزمان بۆی داناوین ، زۆر بەدادپەروەرانە و چاوی ڕونەوە تەماشای کارەساتی مێژوی ناهەموار بکەین کەئەبێتە هۆی زۆربوونی ژمارەی ژنان و کەمبونەوەی پیاون ئەمانەی بۆ ڕوون ئەبێتەوە .

بێگومان چەند کارەساتی وائەبێ لەزۆر کۆمەڵگای تایبەتیدا کەمێژووی ڕابوردوو ئێستایش پێمان ئەناسێنێ لەهەندێ جێگەدا ڕێژەی ژمارەی ژنان زۆرترە لەژمارەی پیاوان بەهۆی هەندێ کارەساتی جەنگی ناڕەوا ، بگرە وایش ئەبێ ڕەوابێ ، هەردوو لایشیان شیاوی ژن و مێرد بن لەهەموو شتێ گرنگتر بەگوێرەی مێژوو لێکۆڵینەوەی پسپۆڕانی ژمارەناس لای ژووروی زۆری ڕێژەی ژنان لەچوار ئەوەندەی پیاوان تێپەڕ ناکا لەهیچ کۆمەڵێکا و هەرگیز لەو سنورە درنەچووە هەر لەو ڕێژەدا سوڕاونەتەوە ، هەر لەبەرئەوەیشە خوا هەتا چوار ژنی بەڕەوا داناوە و لەوە زۆرتر قەدەغەیە ، کەواتە لەو کاتانەدا کەژنان زۆرتربن تیماری ئەو برینانە بەچ ڕێگەیە بکەین ؟ کەزۆر جاران دووپات ئەبێتەوە ، کەسیش ناتوانێ دژی ئەو ڕاستیە ڕاوەستێ ، لەلای هەموو کەس ڕوون و ئاشکرایە ئەو کارەساتە نالەبارانە تووشی پیاوان ئەبن بەزۆری و تووشی ژنان نابن ، بەتایبەتی جەنگ ئەبێتە هۆی لەناو چوون کوشتن و ونبونی ژمارەیەکی زۆر لەپیاوان ، بۆ نمونە لەیەکەم کاتی دەست پێکردنی جەنگ لە نێوان عێراق و ئێراندا تاساڵی (١٩٩٠) بەلای کەمەوە (٣٠) هەزار پیاو لەعێراقدا و (٥٠) هەزار لەئێراندا کوژراون ، جگە لەوانەیان بێ سەرو شوێنن کەژمارەیان هەتا ئێستا نەزانراوە ، لەو جەنگەدا بەدەگمەن ژنان ژمارەیەکی کەمیان کوژراون . لەو کاتانەدا ناگونجێ بۆ ڕێزی ئادەمیزاد واز لەو کۆمەڵە ژنە بهێنرێ کەخۆیان چۆنیان بۆهاتە پێشەوە بەبێ یاسا و دەستوور بەبەرەڵایی و دوور لەناموسەوە خۆیان بەگوێرەی هەوەس تیماری ئەو برینە بکەن کەئەوەیش هیچ مرۆڤێکی خاوەن دایك و باوك و بەناموس کەڕێزی خۆیانیان لاگرنگبێ و ئادەمیزادیان لابەڕێز بێ

بەو کارە ڕازی نین . پێویستە لەو کاتانەدا یاسا و دەستورێ هەبێ بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشی و ئەو ڕوداوە ناهەموارە . ئێمە لەئاستی ئەو ڕوداوانەدا ڕووبەڕوی ئەم چوار شتانەی خوارەوە ئەبین بمانەوێ و نەمانەوێ :

١- هەریەکە لەپیاوان تەنها ژنێ بهێنن ، ژنەکانی تر تەمەنی خۆیان ببەنە سەر بەڕۆژی ڕەش و سەختیانەوە و ئاگری بی مێردی بییان سوتێنێ ، ئەو کارەیش دژوارە و دژی سروشت و توانای ژنانە کەلەتەمەنی خۆیانا مێردی خۆیان نەناسن بەجۆرێکی ڕەوا ، بەبیرو بۆچونی کەسانی ئەقڵ پوچ ئەو نەخۆشیە چارەسەرناکرێ بەوەی ژنان بەهۆی کارکردنیانەوە لەکارگا و دەزگاکاندا ئەتوانن خۆیان بژێنن و پێویستیان بەمێرد نەبێ ئەو برینە بەوە دەرمان ناکرێ ، چونکە ژنان بۆئەوە شوناکەن بخۆن و بژین ، هەزاران کار کردن و سامانی زۆر ناتوانن ژنان لەسروشتی خۆیان بشۆرنەوە ، تاکە پێویستی ژنان لەمێرد کردنیانا کوژانەوەی هەوەسی سروشتی خۆیانە . لەو کاتەدا کەپیاوان بەگوێرەی یاسای لاواز تاقە ژنێ مارە بکەن ، لەوانەیە ژنەکانی تر لەژێرەوە دۆستێ بۆخۆیان پەیدا بکەن بۆ کوژانەوەی ئاگری سروشتیان ، یا پیاوان ئەیان کەن بەیەدەك و لەگەڵیان ڕائەبوێرن . بەو بۆنەوە بەهەزاران منالی مردوو فڕێ ئەدەنە نێو زێرابەکانەوە، یا بەزیندویی لەکۆڵان و لەشەقامەکاندا بەبێ بەزەیی وبەبێ باوك بلاویان ئەکەنەوە، ئەبنە هۆی بارگرانی بەسەر دانیشتوانەوە ، لەپاشەڕۆژدا بەزەییان بەکەسدا نایەتەوە، هەموو کەس بەدوژمنی خۆیان ئەزانن و ئەبنە دڕندە .

٢- ژن و پیاو وەك ئاژەڵ بێن و بڕۆن و کەسیان مێرد و ژنی خۆیان نەناسن و تێکەڵاوی یەك بن ، هیچ کەس باوکی خۆی نەناسێ و کەس بۆ کەس خاوەنی بەزەیی نەبێ بەو جۆرەی شایانی سروشتی ئادەمیزادە ، بێگومان ئەو کەسەی خاوەنی ئەقڵ و ڕێزبێ بەو جۆرە کارانە ڕازی نابێ مەگەر ببێتە ئاژەڵ و بیر لەکۆمەڵایەتی و ڕەگەز و خزم و خوێش نەکاتەوە .

ئاینی ئیسلام بەو دووبڕگانەی سەرەوە ڕازی نابێ ، هەرکەسێ خاوەنی ئەقڵ و هۆشبێ سەر بۆ ئیسلام شۆڕئەکا بۆ ئەوبڕیارە و مەبەستە هەیەتی ، یاسای ئیسلام ئەو دووبڕگانە بەدژی مرۆڤایەتی و ڕوی پاکی ئیسلام و داوێن پاکی دائەنێ ، خاوەنی ئەو دووبڕگانە لایان گرنگ نیە داوێن پیسی پەرەبسێنێ لەناوکۆمەڵدا بەمەرجێ بەهەوەسی خراپی خۆیانبێ. ئەو کەسانە دژی یاسای خوا ڕاوەستاون بەناڕەوایی و کەسیش دژیان ڕانەوەستێ، بگرە کار بەدەستان و زۆربەی لاوان و خاوەن سامان ڕێگەیان بۆ خۆش ئەکەن و یارمەتیان ئەدەن هەرچەندە هەڵگرانی ئاینی پاك لەدژی هەمویان ئەوەستن و هەتاڕادەیە توانیویانە کە بەبەردەوامی یاسای ئیسلام پەرەبسێنێ ، زۆریان لەومەبەستەدا بەپلەی شەهادەت گەیشتوون ، بەلاّم دوژمنانی ئیسلام لەپڕوپاگەندەی خۆیان ناوەستن .

٣- ئەبێ هەموو ئادەمیزاد بزانن چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیە شێرپەنجەیە بەم جۆرە ئەبێ پیاوان بەگشتی یاهەندێکیان زۆرتر لەیەك ژن مارەبکەن ، ئەو بۆشاییە بۆ ژنان پڕبکەنەوە ، بەو جۆرە ژنان هەمویان مێردی خۆیان ئەناسن . بەڕواڵەت دۆستی کەسی ناپاك و یەدەکی مرۆڤی ناهەموار نابن ، لەتاریکیدا پاك و بەڕێز و داوێن پاك ئەبن . سەر بەرز و خاوەن بەرز و خاوەن بەزەیی و میهرەبان ئەبن بۆ گەل و مێرد و نەوە و نیشتمانی خۆیان ... ئەو جۆرە چارەیە ئیسلام بۆخۆی هەڵبژاردوە و کردویێتی بەیاسا و دەستوری کاری خۆی ، هەرکاتێ زانرا ڕادەی ژمارەی ژنان بەرانبەر ژمارەی پیاوانە قەدەغەیە لە سەریان مارەکردنی زۆرتر لەیەك ژن بەو مەرجەی بەر لەمارەکردنی زۆرتر چاوەڕوانی بێدادی بکا . بێگومان ترسو چاوەڕوانی بێدادی هەیە و هەرئەبێ . بەو جۆرە باسکرا دژی پڕوپاگەندەی ستەمکاران و داوێن پیسان ئەوەستین . یاسای ئیسلام هەڵبژێردراوە هەتا لەگەڵ سوودی ئادەمیزاد بەبێ گیروگرفت و بەبێ تەگەرە بڕوا بە جۆرێ شیاوی سروشت و ژیانبێ لەگەڵ چاودێری ڕەوشتی بەرز و داوێن پاکی کۆمەڵدا هەتا لە بێ ناموسی و بەرەڵایی بیانپارێزێ و بیانخاتە پۆیەی پلەی پەسەند و سودبەخش بەجۆرێکی ئاسان و بێ شورەیی .

تەفسیری زمناکۆیی

پاش ئەوانەی باسکران ئەبینرێ لەنێو کۆمەڵی ئادەمیزادا ، لەکۆن تازەدا ، لەئەمڕۆ و دوێنێ و پاشەڕۆژدا شتێکی وا هەیە کەس ناتوانێ دژی ئەو شتە بوەستێ یا خۆی لێ گێل بکا ئەویش ئەمەیە : بۆیە ڕەوایە پیاوان هەتا چوار ژن بخوازن ، چونکە لەپیاوانا هێزی تۆوی زاوزێ درێژە ئەکێشێ هەتا تەمەنی حەفتا ساڵی و بگرە زۆرتریش . بەڵام لەژناندا لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا هێزی زاوزێ ئەوەستێ بگرە کەمتریش . کەواتە لە ماوەی ئەو بیست ساڵەدا لەساڵانی زاوزێدا بۆژیانی پیاوان ئەو ژنانە هەیانە بە کەڵکی زاوزێ نایەن و گومانی تێدا نیە ئامانجی ڕاستەقینەی هاوڕێیەتی ژنان و پیاوان پەرەپێدانی ئادەمیزادە ، پەرەپێدانی ڕەگەز یان جارێ بەژن و جارێ تر بەپیاو هەر بۆمەبەستی مانەوەی ئادەمیزادە ، هەر منالێشە ئەبێتە هۆی خۆشەویستی نێوان پیاوان و ژنان ، هەر بەپەرەپێدانە ڕەگەزی ئادەمیزاد ئەتوانێ زەوی ئاوەدان بکەنەوە و بڵاو ببێتەوە بەسەر زەویدا ، کەواتە شایانی پلەی پیاوان نی‌یە لەوماوەیەدا کەتاقە ژنەکەی لەمناڵبوون کەوتووە ڕۆژ و شەو ببەنەسەر کەئەوەیش دژی سروشت و فراوانی ژمارەی ئادەمیزادە ، جا بەو بۆنەوە پێویستە دەستور و یاسایە هەبێ ڕێك بکەوێ لەگەڵ هەموو کاتی تەمەنی ئادەمیزادا . نەپیاوان توشی زیان بن و نەژنانیش ، بەتۆبزی یاسایەکی دەستکرد نەسەپێنرێ بەسەر هەردوو لایاندا ، ئەو یاسایەش کەبریتی‌یە لەیاسای پاکی خاوەن دادی ئیسلام و بەڕەوا دانانی مارەکردنی زۆرتر لەیەك ژنە .

هەندێ ڕوداو و کاری وا بۆ ئادەمیزاد پەیدا ئەبێ کەپەیوەندی بەوانەی پێشەوە هەیە کەباسکران و ئەوانەیش ئەمانەن : زۆر جاران ژن و پیاو ئارەزوی تەواویان هەیە بۆ سارد کردنەوەی پیشەی ژن و مێردی ، زۆر چاك و خۆشە لایان ژیانی ژن و مێردی ببەنەسەر و لەیەك جیا نەبنەوە ، بەڵام وائەبێ تەمەنی زۆری ژیان یا نەخۆشی ڕێگە ئەبەستێ لەوە کە بتوانن مێرد لەخۆیان ڕازی بکەن لەوکاتەدا ئەمانەی خوارەوەمان بەرەنگار ئەبێ :

١- پیاوان سەرکوت بکەین و پیشەی ژن و مێردی لەوان قەدەغە بکەین بەهۆی یاسای دەست کردەوە نە پیاو بتوانێ ژن و مێردی بکا لەگەڵ تاکە ژنی لەبەر نەخۆشی

و پیری ، وەنەرێگە بدەین ژنێ تر بخوازێ ، لەو کاتەدا ئەبێ پیاوان لـەئاگری هەوەسـی ژن و مێردیدا پاڵ و پشت بکەن ، ژنە هەژارەکەیش بەچاوێکی بـێ میـهرەبانی تەماشـا بکرێ لەبەرئەوەی ناتوانێ پیاوەکەی خۆی تێر بکا لەژن و مێردی و ژیـان بەناخۆشـی ببەنە سەر لەگەڵ مێردەکەیانا .

٢- پیاوان ئەو ژنانە بەرەڵا بکەن دۆستی نهێنی بۆخۆیان بگرن و بەدزیـەوە لەگـەڵیانا بژین بەدژی سروشتی ڕەوای ئادەمیزاد و لای مرۆڤێ ژیر و خاوەن ناموس . بەتایبـەتی لای یاسای ئیسلام و ڕێزی خۆیانیان لەکیس بچێ و خۆیان لەئاژەڵ بۆ جیا نەکرێتەوە.

٣- پیاوان بۆیان ڕەوابێ بەگوێرەی پێویست زۆرتر لەیەك ژن بخوازن و خۆیان ڕزگـار بکەن لەبەرەڵاکردنی ژنە پێشـوەکەی خـۆی و زۆریـەرێژەوە خزمـەتی بکـا و سـتەمی دەربارە نەکا و خۆشەویستی کۆنی لەبیر نەچێتەوە بەخواستی ژنی تازەی خـۆی خـۆی نەکاتە جێگەی خەشم و سزای خوای مەزن ، بێگومان تەنها چارەیە کەبتوانرێ وەڵامی پێویستی سروشتی پاکی ئادەمیزاد بداتـەوە و هـاوپێچ لەگـەڵ بـیر و بۆچونـی خـاوەن ئەقڵان و ڕێزی خۆیی و پلەی ژنان و بەتایبەتی ژنە کۆنەکەی تێدابێ و بـەرچاو بکـرێ هەر ئەو لەوکاتەدا ژن پیرن یا نەخۆشن زۆرتر لەیەك ژن بخوازێ .

٤- ئەگەر ڕێگە بدرێ بەپیاوان لەکاتی نەزۆکی و نەخۆشـی و تەمـەنی زۆری ژنـاندا تەڵاقیان بدرێ و لەپاشا ژنێ تر بهێنێ، جگە لەوە ئـەو پیاوانـە کەمیـهرەبانی و شـایانی پیاوەتی خۆیانیـان پێشـێل کـردووە ئەبنـە هـۆی نـەفرەتی خـوا بۆیـان لـەلای هـەموو دانیشتواندا بەسەر شۆڕی تەماشا ئەکرێن ، بەزۆری ئەبنە هۆی دڵگرانی خزمانی ئـەوژنە بەرەڵاکراوانە ، بەتایبەتی دڵگرانی ئەو ژنـە شـوێنی چـەند ساڵەی خـۆی بەسـەردا ئەڕوخێ بەبێ پاداشت ئەوانە لەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە زۆر ژنـی نـەزۆك و پـیر و نەخۆش لەوکاتەدا ژنیان بەسەر دێ بەرەڵا ناکرێن بەگوێرەی بەزەیی سروشـتی خۆیـان ئەوپەڕی میهرەبانی خۆیان بەکار ئەهێنن بۆ خزمەتی مناڵانی ژنانی تازەی مێردەکـەیان ،

بەو بۆنەوە بەبێ ستەم و ناخۆشی ژنەکان بەیەکەوە لەگەڵ پیاوەکانیان ئەژین ، ئیتر بۆ ئەبێ زۆرتر لەیەك ژن قەدەغەبێ ، ئەبێ بزانین ئاینی ئیسلام بەناوەرۆکی ژمارەی یەك و دووی پێشەوە ڕازی نین و بڕیاری لەسەر نادا .

لەمەوبەر باسمان کرد ئەگەر ئێوە ترسان و نەتان توانی داد پەروەری دابەزێنن لەنێو زۆرتر لەیەك ژن پێویستە لەسەرتان یەك ژن بخوازن ، یا هەڵبژێرن بۆخۆتانکارەکەرێکی ئەوتۆ بەدەستی خۆتان پەیداتان کردووە ، لەمەوپاشیش باسی ئەوە ئەکەین هەڵبژاردنی کارەکەر بۆ ئەوە مەبەستە چ کاتێ دروستە و لەلایەن یاساوە ئەبێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ ؟

کاتێ دروستە هەڵبژاردنی کارەکەر نەتوانرێ کارەکەری جگەی خۆیان بخوازن بەگوێرەی یاسای ئیسلام ، لەمەودوا باسی مەرجەکانی مارەکردنی کارەکەری جگەی خۆ ئەکەین.

خواستنی کارەکەری جگەی خۆتان و هەڵبژاردنی کارەکەری خۆتان بۆ ژن و مێردی ئەوپەڕی گەڕانەوەی ڕێز و سەربەستیە بۆیان پاش کۆیلە کردنیان ، بەو بۆنەوە ئەبنە جێگەی ئازاد بوونی پاشەڕۆژیان ، ئیتر خاوەنەکانیان پێیان خۆش بێ یان نا ؟ چونکە ئەو کارەکەرانە لەیەکەم کاتی منالبونیانەوە بەگوێرەی یاسای ئیسلام ئەبنە دایکی منالان و قەدەغەیە خاوەنەکانیان بیان فرۆشن ، پاش مردنی خاوەنەکانیان کوتوپڕ ئەبنە ئازاد و سەربەست ، منالەکانیان لەوەبەر هەر سەربەست بوون ، کەواتە خواستنی کارەکەری جگەی خۆ و هەڵبژاردنی کارەکەری خۆتان هەردوو لایان بەو کارە ئەبنە جێگەی ڕێز و بەرەو ڕێبازی ئازادی ئەڕۆن کە ئیسلام زۆری پێ خۆشە و هەربۆ ئەو مەبەستەیە ئەوانەی ڕەوا کردووە .

دوژمنانی ئیسلام دەربارەی ڕێبازی بەندایەتیو کۆیلە کردن دەم درێژی زۆریان کردووە بەنیازی خراپی خۆیان ئاینی ئیسلام ڕێزی ئادەمیزادی نەگرتووە ، ئەو نیازە خراپەیان بەمانەی خوارەوە پوچ ئەکرێتەوە :

١- ڕژێمی بەندایەتی ئیسلام دای نەمەزراندووە ، بەهەزاران ساڵ بەر لەئاینی ئیسلام کراوە بەدەستور ، ئاینی ئیسلام کە خوا کردی بەیاسا بۆ موسوڵمانان و ئادەمیزادی سەەر زەویی یەکسەر ڕژێمی بەندایەتی قەدەغە نەکردووە ، چونکە لەبەرزۆری بەندە و بڵاو بونەوەی لەهەموو ڕوی زەوی بۆ موسوڵمانان ئاسان نەبوو قەدەغە کردنی یەك جار. بەڵام ئاینی ئیسلام ئادەمیزاد هان ئەدا بۆ ئازاد کردنی کۆیلەکان . لەهەندێ ڕوداویانا پێویستی کردووە بەندەیەك ئازاد بکەن ، بۆ نمونە ئەو کەسەی پیاوێ بکوژێ بەهەر بیانویە بێ ئەبێ بەندەیە ئازاد بکا . هەرکەسێ سوێندی خوارد و ویستی سوێندەکەی بشکێنێ ئەبێ لەهەندی جارا بەندەیە ئازاد بکا ، هەرکەسێ بەڕۆژوو بێ لەمانگی ڕەمەزاندا و بەچونە لای ژنەکەی ڕۆژووەکەی شکاند پێویستە لەهەندێ جاردا بەندەیە ئازاد بکا ، هەرکەسێ بەژنی خۆی بڵێ : تۆ وەك پشتی دایکم وای یا وەك دایکم و خوشکم وای پێویستە لەسەری بەندەیە ئازاد بکا ، هەرکەسێ بەشێکی زۆر لەبەندەی خۆی ئازاد بکا ، هەموو بەندەکەی ئازاد ئەبێ . ئەوانە و ئاینی ئیسلام پاداشتی زۆری دیاری کردووە بۆ هەرکەسێ بەندەیە ئازاد بکا .

٢- زۆر جاران موسوڵمانان توشی جەنگ ئەبن لەگەڵ بێ باوەڕاندا ، بەناچاری یا بۆبەرگری لەخۆیان ، یا بۆ پەرەپێدانی ئاینی ئیسلام جەنگیان تووش ئەبێ ، زۆر ڕوون و ئاشکرایە ئەنجامی هەموو جەنگێ بمانەوێ یا نەمانەوێ دیلی زۆری تێدا ئەگیرێ لەوکاتانەدا ئەو دیلانە بۆ ماوەیەکی کەم و تایبەتی ئەکرێن بەبەندە بەگوێرەی سودی موسوڵمانان و لەو کاتانەیشدا بەناچاری بەش ئەکرێن بەسەر جەنگاوەراندا بەخێویان بکەن بەیەکەوە بژین و بەگوێرەی یاسا و شایانی گەورەکانیان و خۆیان بکەونە کار بۆ ژیان ، پێویستە لەسەر گەورەکانیان ستەمیان لێ نەکەن و بەگوێرەی یاسا لەگەڵیان هەڵسن ، ئەو ژنانەیش ئەکرێن بەدیل ئەبن بەهاوجوتی پیاوە دیلەکان ، دوایش ئەبێ گەورەکانیان ژن و مێردیان لەگەڵ ئەکەن بەومەرجەی یاسا بۆی داناون بەو بۆنانەوە ئەو

بەندانە ڕێزی خۆیانیان بۆ ئەگەڕێتەوە ڕۆژێ لەڕۆژان ئاینی ئیسلام بەندایەتی خۆش نەویستووە و خۆشی ناوێ .

٣- ئەو کارە ناپەسەندانە لەهەندێ کاتا و لەنێو هەندێ کاربەدەستان و ساماندااران کەبەندەو کارەکەری زۆریان کۆکردۆتەوە بەکڕین و فرۆشتن ، ڕاپێچیان کردوون بۆ کۆشکی بۆگەنی خۆیان ، بەکاریان هێناون بەجۆرێکی نارەوا بۆ ڕابواردنی خۆیان و ساردکردنەوەی هەوەسی پیسی خۆیان ، شەویان پێ کردوون بەڕۆژ بەسەماکردن و سوڕدان و گۆرانی ووتن لەکاتی سەرخۆشیدا ، ئیتر ئەوانە ڕاستبن یا پڕوپاگەندەبێ کە لەناو موسوڵماناندا بووبێ وەك باسمان کرد ، ئەو کەسانە بەو جۆرە شایانبێ پەیڕەو و یاسای ئیسلامیان پێشێل کردووە و لەو یاسایانە لایانداوە ، ئەو کەسانە شایستەنین دانرێن بەئیسلام ، ئەو کارانە لادانە لەیاسای پیرۆزی ئیسلام .

بێگومان یاسای ئیسلام زۆر ڕوون و ئاشکرایە و سەربەخۆیە لەهەموو خولێکا و ژێردەستەی هیچ کەس نیە ، سەردار و پێشەوا و فەرمانڕەوای هەمو ئادەمیزادە ، ئیسلام شتێکە و موسوڵمانانیش شتێ ترن و زۆر لەیەکەوە دوورن ، موسوڵمانان ئیسلامیان دروست نەکردووە ، ئیسلام وەك ڕیشوو وایە و موسوڵمانان لقی ئەون ، لەئیسلامەوە ئەبێ تەماشای موسوڵمانان بکرێ ، ئەگەر یاسای ئیسلامیان تێدا بینرا ئەو کاتە موسوڵمانی ڕاستەقینەن ، نابێ لە موسوڵمانانەوە تەماشای ئیسلام بکری ، ئەگەر موسوڵمانان ستەمکار و دەست بڕوداوین پیسبون ئەو کەوسانە بەناو موسوڵمانن و لەناوەرۆکا موسوڵمان نین ، کەواتە لەو کاتانەدا ئیسلام لەلایەکەوە بەناو موسوڵمانان لەلایەترن و پەیوەندیان بەیەکەوە نیە .

لەبیرمان نەچێ لەمەوبەر باسمان کرد ئەگەر پیاو بەر لەژن هێنانی زۆرتر لەیەك ژن چاوەڕوانی ئەکرد و ئەترسا توشی بێدادی ببێ پێویستە یەك ژن بهێنێ بێگومان ئەو ترسەیش هەیە ، زۆرجارارن دیومانە بنەماڵەیە بەهۆی هێنانی ژنی زۆر تووشی ڕوخانی بنەماڵەی بووە ، کوڕانی ژنەکان یەکتریان کوشتووە.

ئەگەر پیاوێ ویستی کارەکەری جگەی بخوازێ پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا ڕەچاوبکرێ . پیاوانی ئازاد قەدەغەیە لەسەریان ژنی کۆیلە بخوازن مەگەر توانای ئەوەیان نەبێ ژنانی سەربەست و ئازاد بخوازن ، وەبترسن توشی داوێن پیسی ببن . بەر لەهاتنی ئیسلام پیاوان کچی خۆیانیان بدایە بەمێرد خۆیان مارەییەکانیان وەرئەگرت و ئەیان خوارد . خوای مەزن ئەو کارەی لەسەر ئادەمیزاد قەدەغەکرد و فەرموی :

﴿ وأتوا النساء صدقاتهن نحلة ﴾ وەئێوە بدەن بەژنەکان مارەییەکانی خۆیان و نابێ بیان خۆن بەدە ستوری ژنەکان نەبێ ، ئەو مارەییانە دیارییە کە خوا ناوی بردووە ، ئەبێ بدرێ بەژنان ، نابێ ئێوە وەری بگرن .

﴿ فإن طبن لكم عن شيء منه نفساً فكلوه هنيئاً مرئياً ﴾ دوایی ئەگەر ئەو ژنانە پێیان خۆشبوو شتێ لەو مارەییە بدەن بەپیاوان لەخۆیانەوە بەبێ لەڕوودامان ، دوایی ئێوەی پیاوان ئەو شتە بخۆن و وەری بگرن ڕەوایە بۆتان و گوناهی تێدا نیە ، نۆشی گیانتانبێ و ئازارتان پێ ناگا .

لەکۆتاییدا واچاکە ئێمە بزانین ژن هێنان زۆربێ یا کەم پێویست نەکراوە لەسەر ئادەمیزاد بەتایبەتی زۆرتر لەیەك ژن دەستورێکە بۆ چەند ڕووداوێك باسیان کرا ، بەڵام دوژمنانی ئیسلام بەگوێرەی ئارەزوی خۆیان ئەیکەن بەتاوانج بەبێ ئەوەی چاودێری مەرجەکانی بکەن . لەکاتێکا ئیسلام بڕیاری نەداوە بەخواستی زۆرۆ لەیەك ژن مەگەر چاوەڕوان بکا ستەم و بێدادی پەیدا نەبێ کەچی هەندێ لەژنانی ئەوروپا و ئەمریکا هەندێ جار پەیوەندی ئەکەن بەپیاوانی ترەوە زۆر جاران بەئاگاداری مێردەکانیان لەگەڵ ئەوەدا مێردەکەی یەك ژنی هەیە .

خوای مەزن لەمەوبەر باسی ئەو هەتیوانەی بۆ کردین کە پێویستبو سامانەکانیان بدرێتەوە بەدەست ئەوانەیان ژیر و بالغ و هوشیارن ، ئێستایش باسی ئەو هەتیوانەمان بۆ ئەکا دروست نی‌یە سامانەکانیان بدرێتە دەست لەبەرگێلی ئەوان ، ئیتر ئەو هەتیوانە نێرینە بن یا مێینە ، ئەفەرموێ :

وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾

﴿ وَلا تؤتوا السفهاء أموالكُم ﴾ وەئێوە مەدەن بەو کەسانە گێلن و دەست بڵاون و دارای خۆیان دا نانێن لەجێگەی شیاوی خۆیا لەمناڵان و ژنان داراییەکەی خۆیان کەلەژێر چاودێری ئێوەدان ، فەرمودەی خوا ڕوی خۆی ئەکاتە ئەو کەسانە سەرپەرشتیاری دارای ئەوانن ، ئیتر هەرکەسێ بن .

﴿ التي جَعَلَ لَكُمْ الله قياماً ﴾ داراییەکی ئەوتۆ خوا گێڕاویێتی بەهۆی ژیان و گەشەپێ کردن و مانەوەی خۆتان و خێزان و مناڵەکانتان ، ئەو داراییانە ئێوە سەرپەرشتی ئەکەن و لاتانە ، بۆیە خوا ئەفەرموێ ﴿ أموالكم ﴾ .

﴿ وأرزقوهم وأكسوهم وقولوا لهم قولاً معروفاً ﴾ وەئێوە خواردەمەنی بدەن بەوان لەو داراییەی خۆیان و ، ئێوە ئەوان پۆشتە بکەنەوە ، ئێوە گفتوگۆ لەگەڵ ئەوان بکەن بەگفتوگۆیەکی چاك و دڵخۆش کەر بۆیان بەگوێرەی یاسا و ئەقڵ شایانی ئەوانبێ ، ئەو

خواردەمەنی و پۆشاکەی شیاوی ئەوان و کات و جێگە بــێ ، بــەوان بلێــن ئێمــە خۆمــان ماندو ئەکەین ، هەرکاتێ زانیتان ئیش و کاری خۆتان بەڕێوە ببەن داراییەکانتان ئەدەینـــەوە بەخۆتان .

خوای مەزن لەو ئایەتەدا قەدەغەی کردوە دارایی نەدرێتە دەست گێل و دەست بـڵاو . لـەناوەرۆکی ئەو ئایەتەوە بۆمان دەرئەکەوێ پێویستە سامانی گەل و دارایی وولات نەدرێتـە دەست کاربەدەستانی ستەمکار و گێل و گاوارەی وا بۆ سودی خۆیان و سودی دوژمنـــان بەکاری بهێنن ، خاوەنی سامانی بەروبومی نیشتمان برسی و ڕوتبێ ، ژێر دەســـتەی داگـیر کەرانبن . وەك ئەمانەی سەردەمی ئێمە بەرهەمی وولاتانی ئیسلام ئەخۆن و ئەیدەن بەزایۆنی و وولاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا ، ئەبێ چ کەسێ گێل تر بێ لـەو کەســانەی سـامانی بـرای خۆیان بدەن بەفیڕۆ و ببەخشن بەخوێن مژی گەلان بەتایبەتی خوێـــن مـژی موسـوڵمانان؟ بێگومان لای هەموو کەس ڕوون و ئاشکرایە کاربەدەستانی موسوڵمانان ســامان و پـارەی خۆیان ئەنێرن بۆ بانکەکانی ڕۆژئاوا ، ئەوانیش ئەیانخەنە کار و بەقازانجەکەی چەك و فڕۆکە و تۆپ و بۆنبــای پــێ دروســت ئەکــەن و وولاتــانی موسـوڵمانی پــێ خـاپوور ئەکـەن ، بەخۆیانیان ئەفرۆشن و مەرجیان لێ وەرئەگرن کە هەر لـەدژی موسوڵمانانی بــرای خۆیـان بەکاری بهێنن ، بۆ ئەبێ کاربەدەستانی موسوڵمانان بیر نەکەنەوە لەو بێ شــەرمیە بـەکاری ئەهێنن بۆ دژی برای خۆیان و سودی دوژمنان .

﴿ وابتلوا الیتامی حتی إذا بلغوا النکاح ﴾ وەئێوە هەتیوەکان تاقی بکەنەوە بەر لــەباڵغ بونیان و بزانن ئەتوانن و ئەزانن کاری خۆیان هەڵسوڕێنن بەبێ زیان ، ئیتر ژن بن یــا پیـاو هەریەکەیان بەگوێرەی کاری شایستەی خۆیان لـەکاری هەردوو جیهانیان بەبێ جیـاوازی ، هەتا ئەو کاتە ئەگەنە کاتێ شایستە بن بدرێن بەمێرد و ژنیان بــۆ بـهێنن . لای شـافعیەکان کاتی باڵغ بوونی کوڕان پانزە ساڵە یا شەیتانی ببێ ، بۆ ژنان پازدە ساڵە یا خوێنی حــەیزی پێدا بێ ، لای حەنەفیەکان بەتەمەن ئەبێ بگەنە هەژدە ساڵی .

﴿ فإن آنستم مِنهُم رُشداً فَادفعوا إليهم أموالَهُم ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە بینیتان و زانیتان لەوانەوە شارەزایی لەفرمانی هەردوو جیهاندا و ئەتوانن بەتەنها کاری خۆیان هەڵسوڕێنن پاش باڵغ بونیان دوایی ئێوە بدەن بەوان داراییەکانیان کەلەلای ئێوەن بەبێ دواکەوتن هەتا خۆیان بیان خەنە کار . ئەو ڕستەیە بۆمان دەرئەخا واز هێنان لەفەرمانەکانی ئاین وەکو نوێژ و ڕۆژوو زەکات و شارەزایی لەمامەڵەکردندا وەك یەك وان بەبێ جیاوازی ، ئەگەر نوێژ نەکا وەك نەشارەزا وایە و بەگێل ئەژمێرێن لەلای ڕێبازی شافعیەکان ، بەڵام لەلای ڕێبازی پێشەواکانی تر و هەندێ لەزانایانی شافعیەکان شارەزایی بریتیە لەشارەزایی بەڕێوە بردنی دارایی بەتەنها .

﴿ وَلا تَاکلوها إسرافاً وَبِداراً أنْ یکبروا ﴾ وەئێوە دارایی ئەوان مەخۆن و لەناوی مەدەن بە دەرچوون لەسنور بەدەست کاری درارایی و بەکردەوەی ناپەسەند و مەیان خەڵەتێنن و ، داراییان مەخۆن ، پەلە بکەن کەگەورە ئەبن داراییەکان لەئێوە ئەسێننەوە و سوودی دارایی ئەوانتان لەکیس ئەچێ ، ئەو کارانە تاوان و گوناهن .

﴿ وَمَن کانَ غَنیاً فَلیَستَعفِفْ ﴾ وەهەرکەسێ لەهەڵسوڕێنەری دارایی هەتیوان ئەگەر ساماندارە دوایی ئەو کەسە خۆی قەدەغە بکا لەخواردنی دارایی هەتیوان و خۆی تەرخان بکا بۆ خزمەتیان لەبەر پاداشتی پاشە ڕۆژ ، هەرچەندە بۆی هەیە بەئەندازەی مزەی خۆی لەدارایی ئەوان هەڵگرێ ، ئیتر ئەو هەڵسوڕێنەرە باباوك و باپیریش بێت .

ئەگەر هەڵسوڕێنەری دارایی هەتیوان ئەترسان لەستەمکاران سامانی هەتیوان داگیر بکەن ئەتوانن ئەندازەیە لەو سامانە بدەن بەو ستەمکارانە بۆ پاراستنی پاشماوەی دارایی هەتیوەکان .

﴿ وَمَن کانَ فقیراً فلیأکل بالمعروف ﴾ وەهەرکەسێ هەژارە و دارایی هەتیوەکان ئەپارێزێ دوایی ئەو کەسە بالەدارایی هەتیوەکان بخوا بەگوێرەی یاساو دەستور جێگە و کات . بەئەندازەی پێویستی خۆی لەخواردن و بەرگ و لەوێنەی مزەی خۆی دەرنەچێ .

﴿ فإذا دفعتم إليهم أموالهم فأشهدوا عليهم وكفى بالله حسيباً ﴾ دوایی ئێـوه هـەرکاتێ گەڕانتانەوە بۆ لای هەتیوەکان داراییـەکانیان و ئـەو مەرجانـەی پێشـوو هاتـەدی دوایـی شایەتی بگرن لەسەر هەتیوەکان کەدارایی خۆیانیان وەرگـرت هـەتا لەپاشـەڕۆژدا توشـی گێرە و کێشە نەبن ، ئەو فەرماندانە بەشـایەتی گرتـن پێویسـتە لای پێشـەوایان شـافیعی و مالیك ، لەلای پێشەوا حەنەفی پێویست نیە ، بەلاّم واچاکە شایەت بگرن و خوا بەسە بـۆ ئاگاداری و پرسیارکردن لەکارو کردەوەی هەموتان . بەتایبەتی سەرپەرشتی کەری سامانی هەتیوان ، بۆیە پێویستە سەرپێچی لەفەرمانەکانی خوا نەکەن ، هەر خوا بەسە بۆ پاداشت و سزای هەموتان .

عەرەبەکان بەر لەهاتنی ئاینی ئیسلام میراتیان بەژنان و منالاّن نەئەدا ، لایان وابـو ئـەبێ ئەو کەسە میرات وەرگرێ توانای جەنگ کردنیان هەبێ ، ئەو دەستورە بەردەوامبوو هـەتا ئەوسی کوڕی سابیت مردو ژنێك و سێ کچ و دوو ئامۆزای هـەبوو ئامۆزاکـانی هـەموو میراتیەکەی ئەوسیان برد ، ژن و کچەکانیان بێ بەش کرد بەگوێرەی دام و دەزگای کۆن. ژنەکەی ئەوس هاتە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و شکاتی کرد . پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ فـەرمووی : بڕۆرەوە بزانین خوا چ شتێکمان بۆ ڕەوانە ئەکا ، بۆ ڕوون کردنەوە بەشەکانیان لـەمیرات خوا فەرموی :

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا

﴿ ٨ ﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿ ٩ ﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿ ١٠ ﴾

﴿ للرجالِ نصيب مما ترك الوالدين والأقربون ﴾ بۆ پیاوان هەیە گەورە بن یان نە ، جەنگاوەربن یان نە بەشێ لەشتی باوك و دایك و خزمەكان بەجێیان هێشتووە لەدارایی و سامان لەدوای مردنیان بەو جۆرەی یاسا دیاری كردووە . مەبەست لەخزمان لەو ڕستەیەدا و لەڕستەی دواییدا ئەو كەسانەن میرات لەیەك ئەگرن و بێبەش ناكرێن لەمیرات جگەی باوك و دایك نێر بن یان مێ ، گەورە بن یان منالّ ، هەریەكەیان بەگوێرەی بەشی دیاری كراو بۆیان .

﴿ وَلِلنساءِ نصيب ممّا تـرَكَ الوالِـدانِ وَالأقربـون ﴾ وەبۆ ژنان هەیە بەشێ بەجێیان هێشتووە باوك و دایك و خزمەكانیان دوای مردنیان .

﴿ مَمّا قَلّ مِنهُ اَو كثُرَ نصيباً مفروضاً ﴾ لەشتێ لەوەی بەجێیان هێشتووە كەمبێ یا زۆر بەو جۆرەی خوا بۆی دیاری كردوون بەشێكی دیاری كراوی پێویست كراوە و نابێ سەرپێچی لێ بكرێ .

كاتێ ئەو ئایەتەی پێشوو هاتە خوارەوە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەردوو ئامۆزاكەی ئەوسی كوڕی سابیتی بانگ كرد و بەم جۆرەی خوارەوە میراتەكەی لێ بەش كردن : هەشت یەكی سامانەكەی دا بەژنەكەی. دووسێیەكی دا بەكچەكانی . پاش ماوەكەی دابەهەردوو

ئامۆزاکەی . بەگوێرەی یاسا بەم جۆرەی خوارەوە بەشەکانیان دیاری ئەکەین و پرسیارەکە شیتەڵ ئەکەین :

ئەوسی کوڕی سابیت مرد : ژنێك و سێ کچ و دوو ئامۆزای هەبوو .

ژنەکەی ١ . کچەکانی ٢ ئەبن ، ئەوەی ئەمێنێتەوە ئەدرێ بە دوو ئامۆزاکەی .

٨ ٣ ئەسڵی پرسیارەکە لە ٢٤ = بیست و چوار .

بەم جۆرەی خوارەوە بەشەکانیان دیاری ئەکرێ .

لە ٢٤ . ٣ بۆ ژن .

١٦ بۆ سێ کچ بەش ناکرێ بەسەریانا .

٥ بۆ دوو ئامۆزا بەش ناکرێ بەسەریانا .

ژمارەی کچەکان = ٣ × ٢ = ژمارەی ئامۆزاکان و = ٦ .

٦ × ٢٤ = ١٤٤ ٦ × ٣ = ١٨ بۆ ژن .

٦ × ١٦ = ٩٦ بۆ سێ کچ .

٦ × ٥ = ٣٠ بۆ دوو ئامۆزا .

خوای مەزن بەو ئایەتەی پێشوو بە هۆی کارکردنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بۆ بەش کردنی میراتی ئەوسی کوڕی سابیت بەو جۆرەی ڕابوردو زۆربەی خزمانی مردووی بێ بەش کردووە لەمیرات بردن ئەوە لەلایە ، لەلایە ترەوە ئاینی ئیسلام هاتوە بۆ بڵاو کردنەوەی چاکە و دادپەروەری و ڕێز بۆ هەموو ئادەمیزاد بەتایبەتی خزمان و هەتیوان و هەژاران . سەرەتای ئەم سورەتە ڕوون ترین بەڵگەیە لەسەر ئەو مەبەستەی دادپەروەریە ، هەتا ئادەمیزاد بەگشتی و بەدڵخۆشی بەیەکەوە بژین و بەیەکەوە ئەندامەکانی خۆش گوزەرانبن ، چونکە هەمومان لەئادەمین و لەیەك خوێنین و ئەندامی یەکترین .

بۆئەوە ئەو کەسانەیش بەشیان بۆ د یاری نەکراوە بەو ئایەتە خوا فەرمانی دا جگەی ئەوانەی بەشیان بۆ دیاری کراوە بەشیان بدرێ لەمیراتی مردوو ، بۆئەوەی هەموو لایە بەخۆشی بژین ، فەرموی :

﴿ وَإذا حَضَرَ القسمة أولوا القربى واليتامى والمساكين فارزقوهم ﴾ وەهەرکاتێ خزمانی مردوو هەتیوان و هەژاران کەبەشیان بۆ دیاری نەکراوە ئامادەی ئەو بەش کردنە بون و لەوێ بوون ، دوایی ئێوە خواردەمەنی بدەن بەوان شتێ لەو میراتە بەش کراوەی مردوو ، هەتا ئەوانیش دڵخۆش بن و هەست بکەن بەو چاکەیە لەگەڵیان ، برِوایان بەخزمایەتی و برایانی خۆیان بەتین بێ ، لەکاتێکا ئەوشتەیان بدەنێ میرات بەرەکان گەورە و ژیر بن ، کاتێ منالبوون خوا بەرِستەی دوایی ئامۆژگاری و شارەزاییمان ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿ وَقولوا لهم قولاً معروفاً ﴾ وەئێوەی سەرپەرشتی کەری منالان و بەشکردنی میرات بلێن بەو کەسانەی ئامادەی بەشکردنەکەن گفتوگۆیەکی پەسەند و بیانوی بەش نەدانیان بۆ روون بکەنەوە : ئێمە ناتوانین بەشتان بدەین ، چونکە ئەو میرات بەرانە منالّ و نەزانن . ئێمە خۆمان هیچ شتێکمان نییە و ئەو سامانە هەمووی دارایی ئەو منالّ و نەزانانەن ، ئەگینا بێ بەشمان نەئەکردن و داواکارین دلگران نەبن .

زۆربەی زانایان لایان وایە ئەو فەرماندانە بەبەخشینی شتێ لەدارایی مردوو بەو کەسانە ئامادەی بەش کردنەکەن و بیانو هێنانەوە بۆیان بەووتەی پەسەند ، ئەو فەرمانە بۆ پێویست نییە ، بەڵکو واچاکە بەشیان بدرێ لەو سامانە . بەتایبەتی ئەگەر میراتبەرەکان گەورە و ژیر بوون ، ئەگەر منالّ بوون بەووتەی خۆش و پەسەند دڵخۆش بکرێن ئەو خزم و هەتیو و هەژارانە. پاش ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو کەسانەی کرد ئامادەی بەشکردنی میراتی مردوو بوون بۆ جارێ تر ئەگەرِێتەوە بۆلای باسکردنی هەتیوان . بەهەرِەشەوە بەسەرپەرسشتی کەرانیان ئەفەرموێ:

﴿ وليخش الذين لو تركوا من خلفهم ذرية ضفافاً خافوا عليهم ﴾ وەبابترسن کەسانێکی ئەوتۆ سەرپەرشتی منالّی ووردی جگەی خۆیان ئەکەن ئەگەر بەجێ بهێلن لەدوای خۆیان و مردنیان چەندین بێچولەی لاواز ترسیان هەبێ لەسەریان کەئەوان هەژار و بێ توانا بن کەلەناو بچن ، ئەگەر بکەونە ژێر چاودێری کەسێکەوە دوای خۆیان ،

کەواتە ئێستایش کەئەوان مناڵ و خێزانی جگــەی خۆیانیــان لایــە بــۆ چـاودێری پێویســتە لـەسەریان ئەو منالّ و خێزانانە بە باشی پەروەردە بکەن و بـەخێویان بکـەن ، سـامانەکانیان بخەنە گەڕ بۆقازانج و نەی خۆن. بیانخەنــە قوتابخانــە و فـێری خوێندنیـان بکـەن و ئـەوەی پێویستە لـەسەریان بۆیان بکەن هەتا جگەی ئەوانیش منالّی لاوازی ئەوان بەباشی پـەروەردە بکەن .

﴿ فليتقوا الله وليقولوا قولاً سديداً ﴾ دوایی با سەرپەرشتی کـەرانی هـەتیوان لــەخوا و سزای خوا بترسن لەپـەروەردەکردنی جگـەی منـالآنی خۆیـان و ، بائـەوان بلێـن بـەوان وتەیەکی پەسەند و شایان ، وێنەی ئەو گفتوگۆیانــەی کـە بـەمنالآنی خۆیـان ئـەلێن بـەبێ جیاوازی و بەنەرم و نیانی و میهرەبانی و بەزەیی و پەروەردەکردن و ئامۆژگاری .

لەدواییدا خوای مەزن ئەو کەسانە ئەترسێنێ سەرپەرشتی هەتیوان ئەکەن و ســتەمیان لێ ئەکەن و سامانیان ئەخۆن و بەفیڕۆی ئەدەن ئەفەرموێ:

﴿ إن الذينَ يَأكلونَ أموال اليتامى ظُلماً إنَّما يَأكلونَ في بطونِهِم ناراً وَسَيَصلونَ سعيراً ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ ئەخۆن و لـەناوی ئەدەن دارایی هــەتیوان بەســتەم و نـاڕەوایی و لەڕێگەی بێ دادی بەڕاستی ئەو کەسانە ناخۆن و بیکەنە وورگیان مەگرە ئاگر و لـەمەودوا ئەو کەسانە ئەگەن بەئاگری گەرمی سوتێنەری دۆزەخ ، یـانی خواردنـی دارایـی هـەتیوان ڕایان ئەکێشێ بۆ نێو ئاگری دۆزەخ . بۆیە پێغەمــەر ﴿ﷺ﴾ ئەفـەرموێ : کۆمـەلێ کـەس لەگۆڕکانیانەوە لەپاشەڕۆژدا ئاگر لەدەمیانەوە گڕ ئەسێنێ و دێتە دەرێ ، ئەیفەرموو: ئــەو کەسانە ئەوانەن سامانی هەتیوان ئەخۆن.

بەر لـەهاتنی ئاینی ئیسلام هۆکانی میرات بردن بریتی بــوون لـەخزمایـەتی و پـەیمان دان بەیەکتری ، خزمانیش جگە لەوپیاوانە جـەنگ کـەر بـوون کەسـی تـر بەشـیان لــەمیرات نەئەدان . هەندێ جار دوو کەس لـەنێوان خۆیانا بەلێنیان ئەدا بەیەکتری ، هەریەکێ لـەئێمـە مرد ئەوی ترمان میراتەکەی ببا ، هەندێ کەسیش کوڕی جگـەی خـۆی ئـەکرد بـەکوڕی خۆی و پاش مردنی ئەو کوڕە میراتەکەی ئەبرد ، کاتێ ئاینی ئیسلام خوای مــەزن کـردی

بەیاسا بۆ ئادەمیزاد ئەو هۆیانەی پێشووی هەموویان پوچ کردەوە . فەرمانی دا بەوە کەهەموو خزمان لەژن و پیاو لەگەورە و منالٚ ، جەنگاوەر بن یان نا هەمویان میرات ئەبەن بەگوێرەی ئامۆژگاری خوا . جەنگ کردن و بەلێن دان و بەکوڕکردنی جگەی خۆ نابنە هۆی میرات بردن . خوای مەزن هۆکانی میرات بردنی ڕوون کردەوە بەچوار هۆی سەرەکی : خزمایەتی تایبەتی . ژن و مێردی . گەورەیی و بەندەیی . موسوڵمانەتی . هەریەکەیان بەگوێرەی یاسای دیاری کراو بۆیان . بەم ئایەتانەی خوارەوە بەشێوەیەکی ڕوون و درێژ باسی ئەو کەسانەمان بۆ ئەکا خاوەنی بەشن لەمیراتا .

يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾

۞ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ



خوای مەزن فەرمان ئەدا لەبارەی میراتەوە کاتی مردنی خاوەن میرات ، پێویستە بەش کردنی میرات بەم جۆرەی خوارەوە بێ ، بەڵام پاش دانەوەی قەرزەکەی و بەجێ هێنانی

سپاردە کەیشی کەبەر لەمردنی کردویەتی ، بەمەرجێ لەسێیەکی سامانەکەی زۆر تر نەبێ، ئەو بەشکردنە خوا پێویستی کردووە لەسەرمان بەوجۆرەی خوارەوە فەرمانی داوە باوکان و کوڕان بەگوێرەی ڕوون کردنەوەی یاسا میرات وەرئەگرن بەیەکسانی ، بەش کردنی میرات بەو جۆرە لەم ئایەتانەی خوارەوەدا ڕوون کراونەتەوە و بەش ئەکرێ ، بەمەرجێ هەندێ شت پەیدا نەبێ ئەبنە هۆی میرات نەبردن وەك کوشتنی خاوەن میرات لەلایەن میرات گرەوە و جیاوازی ئایین و بەندایەتی ، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ یوصیکم الله في أولادِکُم لِلذکر مثل حظِ الأنثیین ﴾ خوا ئامۆژگاری ئێوە ئەکا و فەرمان بەئێوە ئەدا لەبارەی میراتی منالّەکانتان بۆ نێریان هەیە وێنە بەشی دوو مێینە ، ئەگەر کەسێ مردوو جگەی کوڕ و کچ میراتبەری تری نەبوو سامانەکەی ئەدرێ بەوان و کوڕێك دوو ئەوەندەی کچ ئەبا لەو سامانە ، ژمارەیان چەندەبێ هەریەکەیان بەشی خۆیان وەرئەگرن . ئەگەر مردووەکە هەریەك کوڕی هەبوو میراتەکە بەتەواوی وەرئەگرێ ، بۆنمونە کەسێ مردو کوڕێك و کچێکی هەبوو بەم جۆرە میراتەکەی بەش ئەکرێ لەنێوانیانا لەژمارەی سێدا ڕوون ئەبێتەوە .

٣
٢ بۆ کوڕ
١ بۆ کچ .

ئەگەر دوو کوڕ و یەك کچی هەبوو لەژمارە پێنج دا بەشەکانیان ڕوون ئەکرێتەوە :

٥
٤ بۆ دوو کوڕ
١ بۆ یەك کچ .

ئەگەر کوڕێك و دوو کچی هەبوو لە ژمارە چواردا بەشەکەیان ئاشکرا ئەبێ :

٤
٢ بۆ یەك کوڕ
٢ بۆ دوو کچ .

ئەگەر کەسێ مرد و جگە لەمناڵ میرات بەری تری هەبوو هەریەکەیان بەگوێرەی خۆیان لەمیراتەکە وەرئەگرن و ئەوەی ماوەتەوە ئەدرێ بەمناڵەکانی لەکوڕ و لەکچ ، کچ نیوەی کوڕ ئەبا .

بۆ نمونە پیاوێ ئەمرێ ژنێك و کوڕێك و کچێکی هەبوو لەژمارە بیست و چواردا بەشەکانیان ڕوون ئەبێتەوە : یەکەم جار لەژمارە (٨):

٨

١ بۆ ژن

٧ بۆ کوڕ و کچ بەش ناکرێ بەسەریانا .

ژمارەی کوڕ و کچ کە کوڕ بەدوو کچ دائەنرێ :

٣ × ٨ = ٢٤

٣ بۆ ژن .

١٤ بۆ کوڕ .

٧ بۆ کچ .

ژنێ ئەمرێ مێردێك و کوڕێك و کچێکی هەیە لەژمارەی چواردا بەشەکانیان ڕوون ئەبێتەوە :

٤

١ بۆ مێرد

٢ بۆ کوڕ

١ بۆ کچ .

ئەگەر کەسێ مرد و باوك و کوڕێك و کچێکی هەبوو لە ژمارەی هەژدەدا بەشەکانیان ئاشکرا ئەبێ :

٦

١ بۆ باوك

٥ بۆ کوڕ و کچ .

ژمارەی کوڕ و کچ ٣ × ٦ = ١٨ .

٣ بۆ باوك .

١٠ بۆ کوڕ

٥ بۆ کچ .

ئەگەر لەجیاتی باوك دایکی هەبوو هەروەك پێشەوە بەش ئەکرێ .

ئەگەر کەسێ مرد و باوك و دایك و کوڕێك و کچێکی هەبوو لەژمارە هەژدەدا بەشەکانیان ڕوون ئەبێتەوە :

٦

١ بۆ باوك

١ بۆ دایك

٤ بۆ کوڕ و کچ .

ژمارەی کوڕ و کچ ٣ × ٦ = ١٨

٣ بۆ باوك .

٣ بۆ دایك .

٨ بۆ کوڕ .

٤ بۆ کچ .

هەموو پێشەوایانی ئایینی پێك هاتوون لەسەر ئەمەی ئەگەر کەسێ مرد و کوڕ و کوڕەزای لێ بەجێ ما ، لەم کاتەدا کوڕەزا بەشی نادرێ و هەموو سامانەکەی ئەدرێ بەکوڕەکەی ، کوڕەزاکەی نێربێ یان مێ بێ .

ئەگەر کەسێ مرد و کوڕی لێ بەجێ نەما و کچی هەبوو ، لەو کاتەدا ئەگەر یەك کچی هەبوو نیوەی سامانەکەی ئەبا ، ئەگەر دوو کچ یا زۆرتری هەبوو دوو سێیەکی سامانی مردووەکە ئەبەن ئەوەی ماوەتەوە لەپاش میراتی ئەو کچانە ئەدرێ بەجگەی ئەوان

لەمیراتبەرانی بەو جۆرەی یاسا دیاری کردووە ، بەڵام لای شیعەکان هەموو میراتەکەی ئەدرێ بەکچەکانی و بەشی کەسی تر نادرێ ، لەم ڕستانەی خوارەوەدا ئەو مەبەستە ڕوون ئەبێتەوە . ئەفەرموێ:

﴿ فإنْ كُنَّ نِساءً فوق اثنتين فَلَهُنَّ ثلثا ما ترك ﴾ دوایی ئەگەر منالـەکان هەموویان ژن بوون و کوڕی مردووەکەیان لەگەڵ نەبوو لەسەرەوەی دوو کچ بوون ، یا دوو کچ بوون بەلای زۆربەی زۆری موسوڵمانان ، دوایی بۆ ئەو کچانە هەیە دووسێیەکی ئەو سامانەی مردووەکە بەجێی هێشتووە هەرچی لەوان مایەوە ئەدرێ بەجگەی ئەو کچانە لەمیراتبەرەکان بەجۆرێ یاسا دیاری کردووە .

﴿ وَإن كانَتْ واحِدة فَلَها النصف ﴾ وەئەگەر منالّی مردووەکە یەك کچ بوو بەتەنها و کوڕ و کچی تری نەبوو ، دوایی بۆ ئەو کچە هەیە نیوەی سامانی ئەو مردووە ، پاش ماوەکەی ئەدرێ بەمیراتبەرانی تر بەو جۆرەی یاسا دیاری کردووە .

ئەگەر کەسێ مردوو جگە لەمنالّی مێینە میراتبەری تری نەبوو ، لەو کاتەدا ئەگەر یەك کچی هەبوو نیوەی سامانی مردووەکەی ، ئەگەر دووکچی هەبوو یان زۆرتر سێیەکی سامانەکەی وەرئەگرن ، ئەوەی لەوان مایەوە ئەدرێتەوە بەوان ، بەگوێرەی ژمارەی خۆیان، ئەگەر میراتبەری تریان لەگەڵ بوو کچەکان بەشی خۆیان وەرئەگرن و ئەو کەسەیش لەگەڵیانە بەشی خۆی وەرئەگرێ ، دوایی پاش ماوەکەی بەش ئەکرێ بەسەر کچەکان و ئەو میراتبەرەی لەگەڵیانە بەمەرجێ جگەی ژن و مێرد بن ، بۆ نمونە کەسێ ئەمرێ دوو کچ و دایکی هەیە ، دوو کچەکەی دوو سێیەکی سامانەکە وەرئەگرن و ، دایك شەش یەك وەرئەگرێ ، ئەوەی لەوان ماوەتەوە ئەدرێتەوە بەوان بەگوێرەی ڕێژەی بەشی کچەکان و دایك ، لەژمارە شەشدا بەشەکانیان ڕوون ئەبێتەوە :

٦

٤ بۆ دووکچەکان

١ بۆ دایك

١ ماوەتەوە

ڕێژەی بەشی دایك لەگەڵ بیەشی کچەکان بەپێنج یەکە

کەواتە ٥ × ٦ = ٣٠

٢٠ بۆ دووکچ

٥ بۆ دایك

٥ ماوەتەوە بەگوێرەی ڕێژەی بەشەکانیان ئەدرێ بەو دووکچە و بەدایك ٤ + ٢٠ = ٢٤ بۆ دوو کچ

ئەو جۆرە بەش کردنە پێی ئەبێژرێ (الرد ) ١ + ٥ = ٦ بۆ دایك .

﴿ ولأبویه لکل واحد منهما السدس مّما اترك إن کان له ولداً ﴾ وەهەیە بۆ هەریەکە لەباوك و لەدایکی مردوو شەش یەك لەشتێ مردووەکە بەجێی هێشتووە ، ئیتر باوك و دایك هەردوکیانبن یا هەریەکێکیانبێ ئەگەر بۆ ئەو مردوە هەبێ منالّ ، ئیتر نێرینە بن یا مێینە . زۆر بن یان کەم ، تەنها بن یا تێکەڵاو لەنێر و مێ ، یا کوڕەزا بن ، لەدوای بەشی باوك و دایك ئەوەی ماوەتەوە منالّی مردووەکە ئەیبەن .

﴿ فإن لَمْ یَکُنْ لَهُ وَلَد وَوَرِثَهُ أبواه فلأمه الثلث ﴾ دوایی ئەگەر مردووەکە منالّی نەبوو لە نێرینە و لەمێینە نەزۆر و نەکەم ، دایك و باوکی مردووەکە میراتیان وەرگرت ، بۆ دایکی مردوەکە هەیە سێیەکی سامانی مردووەکە ، ئەوەی مایەوە هەموی ئەدرێ بەباوکی مردوەکە .

﴿ فإن کان له إخوة فلأمه السدس ﴾ دوایی ئەگەر بۆ مردوەکە هەبو چەند برایەك یا چەند خوشکێ لەیەك بەرەو ژوور ، ئیتر دایك و باوکی بن یا باوکی ، یا دایکی ، کۆبونەوە لەگەڵ دایکی مردووە، لەو کاتەدا دایکی مردووەکە شەش یەکی سامانی مردووەکە ئەبا ، لەو کاتەدا ئەگەر باوکی مردووەکە زیندو بوو ئەوەی ماوەتەوە لەبەشی دایك ئەدرێ بەباوکی مردوەکە و براکانی هیچ شتێ نابەن ، ئەگەر باوکی نەبوو ئەوەی ماوەتەوە ئەدرێ بەبراکانی و خوشکەکانی ، برای باوکی لەگەڵ برای باوك و دایکی

بەشی نادرێ ، بەجۆرێکی ڕوون و درێژتر باسی کۆبوونەوەی برا و خوشکان کراوە لەنامە یاساییەکاندا لەگەڵ چۆنێتی بەش بردنیان لەمیراتی مردوو ، هەر یەکەیان بەگوێرەی بەشی دیاری کراوی خۆیان .

﴿ مِنْ بعد وصية يوصى بها أو دين ﴾ ئەو بەشانە کاتێ ئەدری بەو میراتبەرانە باسکران لەدوای جێبەجێ کردنی سپاردەی مردوەکە و لەدوای دانەوەی ئەو قەرزەی لەلایەتی .

هەرکاتێ مردوو دارایی بەجێهێشت ، یەکەم جار پێش هەموو شتێ ئەوەی پێویست بێ لەکفن و شۆردن و بردنی بۆ گۆڕستان ئەدرێ بەجێگەکانی خۆیان ، دوایی قەرزەکانی ئەدرێتەوە بەزەکات و بەحەجەوە ، دواتر لەسپاردەکانی لەسێ‌یەکی میراتەکەی دەرئەکرێ، دوای ئەوانە هەموو ئەوەی ماوەتەوە ئەدرێ بەمیراتبەرەکان بەو جۆرەی بەشیان بۆ دیاری کراوە .

پرسیار / ئەگەر دانەوەی قەرز پێویستە بەر لەسپاردە بێ بۆچی لەوڕستەیەدا لەدوای سپاردەوە بێژراوە؟

وەڵام / ووشەی (أو) بۆ تەرتیب نی‌یە و داوای دواکەوتن یا پێش کەوتنی شتێ لەدوای خۆیەتی نایکا .

﴿ آباؤکم وَابناؤکم لاتدرون أيهم أقرب لَكُمْ نَفعاً ﴾ باوکەکانی ئێوە و کوڕانی ئێوە ، ئێوە نازانن کام لایان نزیکترن بۆ ئێوە لەلایەن سودەوە ، زۆر جاران ئێوە گومانتان وایە یەکێ لەباوك یا کوڕ لەپاشەڕۆژدا خاوەنی سودن بۆتان لەبەر ئەوە ئێوە بەشی زۆرتر ئەدەن بەو یەکە کەچی دژی گومانی ئێوە دەرئەچن ، کەواتە هەر خوا ئەزانێ کام لایان سوود بەخشن بۆیە نابێ لەئامۆژگاری خوا دەرچن بەهەر جۆرێ خوا بەشی بۆ دیاری کردوون میراتیان بدەنێ ئەگەر ئەو شتانە بداتە دەستی ئێوە سەرگەردان ئەبن و نازانن بەکامیان زۆر بدەن .

﴿ فريضة من الله إنَّ الله كان عليماً حكيماً ﴾ خوا بەو جۆرەی باسکران بەش بدرێ بەمیراتبەران پێویستی کردووە بەپێویست کردن و نابێ لابدرێ لێیان بەهیچ جۆرێ ،

بەڕاستی خوا بەسوودی ئێوە نــەزانێ ، هــەموو شتێ لەجێگــەی شیاوی خۆیا دائـەنێ ، بەتایبەتی دیاری کردنی بەشی میراتبەران .

﴿ وَلَكُم نصف ماتركَ أزواجكم إن لم يكن لهن ولـد ﴾ وەبۆ ئێوە هەیە نیوەی شتێ ژنەکانتان بەجێی ئەهێڵن لەسامان ئەگەر نەبێ بۆ ژنەکانتان منالٚ زۆر بن یان کەم لەکوڕ و کوڕی کوڕ لەهەر مێردێکی بێ ، لەدوای جێبەجێ کردنی سپاردە و دانەوەی قەرز .

﴿ فإن كان لَهُنَّ وَلَد فلكم الربع مما تركن من بعد وصية يوصين بها أو دين ﴾ دوایی ئەگەر هەبوو بۆ ژنەکانتان منالٚ لەکوڕ و کوڕەزا و کچ ، دوایی بۆ ئێوەی مێرد هەیە چواریەکی شتێ ژنەکانتان بەجێیان هێشتووە لەسامان لەدوای جێبەجێ کردنی سپاردەیە ڕایان سپاردووە لەدوای دانەوەی قەرزێ لەلایەتی .

﴿ وَلَهُنَّ الربع مِما تركتم إن لَمْ يَكن لَكُمْ وَلَـد ﴾ وەبۆ ژنان چواریەکی شتێ ئێوە بەجێتان هێشتووە لەسامان ئەگەر بۆ ئێوە هەبێ منالٚ لەکوڕ و کوڕەزا و کچ لەهەر ژنێکیان بێ و زۆربن یان کەم .

﴿ فإن كان لَكُم وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثمنُ مِما تركتم من بعد وصية توصون بِها أو دين ﴾ دوایی ئەگەر بۆ ئێوە هەبوو منالٚ بەو جۆرەی لەپێشەوە باسکرا ، دوایی بۆ ژنەکانتان هەیە هەشت یەکی شتێ ئێوە بەجێتان هێشتووە لەسامان لەدوای جێبەجێ کردنی سپاردەیە ئێوە ڕاتان سپاردووە و لەدوای دانەوەی قەرزێ لەلاتانە .

﴿ وإن كان رَجُلٌ يورَث كلالـه أو امرأةٌ ﴾ ئەگەر پیاوێ مرد و میراتی لێ ئەگیرا بەخزمایەتی جگەی باوك و منالٚ لەبراو خوشکی دایکی ، مەبەست لەووشەی (کلالە) میراتبەرێکە جگەی باوك و منالٚ ئەو کەسانەی بەهۆی ئەوانەوە ئەبن بەخزمی مردوەکە لەبرای باوك و دایکی و مام و ئامۆزا .

﴿ وَلَهُ أخ أو أخت فلكل واحدٍ منهما السدس ﴾ وەهەبو بۆ ئەو مردووە برا یا خوشکی دایکی ، دوایی هەیە بۆ هەموو یەکێ لەو براو خوشکە شەش یەکی سامانی مردووەکە .

﴿ فإن كانوا أكثر من ذلك فهم شركاء في الثلث من بعد وصية يوصى بها أو دين غير مضار ﴾ دوایی ئەگەر ئەو براو خوشكە دایكیانە زۆر تر بوون لەیەك كەس ، دوایی ئەوانە بەهەمویانەوە هاوبەشن لەسێ یەكی سامانی مردووەكە ، ئیتر هەموویان برای دایكی بن یا خوشك یا هەردوولایان بن . لەدوای جێبەجێ كردنی ڕاسپاردەیە ڕای سپاردووە و دوای دانەوەی قەرزەكەی ، ئەو ڕاسپاردەیە جۆرێ نەبێ زیان بدا لەمیراتبەران و زۆرتر نەبێ لەسێیەكی سامان و مەبەستی ئەوە نەبێ بەتەنها زیان بدا لەمیراتبەران و ڕاسپاردە بۆ قەرزێ نەبێ كەلەلای نەبێ .

﴿ وصية من الله والله عليم حليم ﴾ ئەو ئامۆژگاریە خوا ئەیكا ئامۆژگاری كردنە لەلای خواوە دروست نیە گۆڕانی و، خوا ئەزانێ بەچاكەی بەندەكانی خۆی و بەزیانیان لەفەرماندانیدا ، خوا خاوەنی مۆڵەتە و پەلە ناكا لەسزادانی گوناهباران.

ئەو زانایانەی مانای قورئانی پیرۆزیان كردووە ئەڵێن : مەبەست لەخوشك و برا لەو ئایەتەدا بریتیە لەخوشك و برای دایكی ، هەندێ لەزانایان خوێندویانەتەوە ﴿ وَلَهُ أَخٌ أو أختٌ مِنَ الأم ﴾ . بەڵام میراتی برای دایك و باوكی یا باوكی لەكۆتایی ئەم سورەتەدا باسی ئەكرێ ، هەروەها زانایان پێك هاتوون كەتاكەكەسێ لەبرا و خوشكی دایكی شەش یەكی میرات ئەبەن ، زۆر تر لەیەك سێیەك ئەبەن نێربن یان مێ .

تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾

﴿ تِلكَ خدود الله ﴾ ئەوانەی باسکران ، لەڕوون کردنەوەی فەرمانی دارای هــەتیوان و ژن ومێردی و باسی میراتی مردوان سنورە دیاری کراوەکانی خوان و نابێ لێیان دەرچن و ئەبێ جێبەجێ بکرێن .

﴿ وَمَنْ يَطِعِ الله وَرَسولهُ يُدخِلهُ جَناتٍ تَجري مِنْ تَحتِـها الأنـهارُ خـالِدينَ فيـها وَذلِـكَ الفوزُ العظيمُ ﴾ وەهەرکەسێ فەرمان بەرداری خوا و فروستادەی خوابێ خــوا ئەیخاتـە نێـو چەندین بەهەشتێ ئەڕوا بەژێر درەختەکانی و ئــەم لاولای کۆشـکەکانیا چـەندین ڕوبـاری ئاوی ڕوون و شیرین ، ئەو کەسانە بەردەوامن لەنێو ئەو بەهەشــتانەدا ، چونـە نێـوی ئـەو بەهەشتانە ڕزگاربونێکی گەورەیە .

﴿ وَمَنْ يَعصِ الله ورسُلَهُ ويتعد حدودهُ يُددخِلهُ ناراً خــالِداً فيـها وَلَـهُ عَـذابٌ عَظيـم ﴾ وەهەرکەسێ بێ فەرمانی خواو نــێردراوی خــوا بکـا و تێپـەڕی لـە سنورەکانی خـودا و فەرمانەکانی بەجێ نەهێنێ بەتایبەتی لەبەش کردنی میراتا خــوا ئـەو کەسـە ئەخاتـە ئـاگری دۆزەخەوە و بەردەوامە لەنێویدا ، بۆ ئەو کەسە هەیە سزایەکی ئابڕوبەر بۆی .

بەش کردنی میرات گرنگی زۆری پێدراوە لەلایەن ئـاینی ئیسـلامەوە ، لەگـەورەترینی بەشەکانی زانیاریدا دانراوە لەلایەن پلەو پایەوە ، بەڕێزترین توێشوە بۆ کۆمەڵایـەتی لـەنێو ئادەمیزادا ، بەرزترین زانیاری‌یە لەبارەی باسەکانیەوە ، پایەیەکی گەورەی بۆ دانراوە لەنێو هەمویاساکانی ئیسلامدا ، لقێکە لەلقە هەرە بەرزەکانی ئیسلام ، بۆیـە هاوڕێکـانی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ زۆریان نرخاندووە فێربونی یاسای میرات بەشکردن لەیەکەم کاتی ئیسلامەوە بـەر لەهەموو زانیاری‌یەکانی تردا و هەموو کـون و قوژبنـی یاسـاکانی بـەش کردنـی میراتیـان ڕوون کردوەتەوە ، هەموو یاساکانیان بەگوێرەی یاســا دەستنیشــان کـردووە ، بەسـە بـۆ بەرزی پلەی زانینی بەش کردنی میرات خوای مــەزن خـۆی بۆخـۆی بەشـکردنی مـیراتی دیاری کردووە بەجۆرێکی کورت هەموو باسەکانی میراتی لــەقورئانی پـیرۆزدا بـەتێکڕایی لەجێگەی خۆیانـا ڕوون کردوەتـەوە و داینـاوە . بەچـەند ئایـەتێکی کـەم لـەپێنج ژمـارە

تێناپەڕێ کەبەهەزاران نامە زانایان ئەو باسەیان بەتەواوی بۆ نەکراوە ، هەموو باسەکانیان لەمانای ئەو ئایەتانە دەرناچێ .

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئامۆژگاری موسوڵمانانی کردووە و هانی داون بۆ فێر بوونی بەش کردنی میرات ئەفەرموێ : بەش کردنی میرات فێر ببن و جگەی خۆشتان فێر بکەن و منتان بۆ نامێنێ ، لەکۆتایی فەرمودەیە ترد ائەفەرموێ : بەش کردنی میرات هەڵئەگیرێ و نزیکە کەدوو کەس دەمەقاڵەیان ببێ لەبەشکردنی میراتا و کەسیان دەست ناکەوێ وەڵامیان بداتەوە ، ئەوانە و چەندین فەرمودەی تر .

میراتبەران لەپیاواندا (١٥) کەسن : کوڕو کوڕی کوڕ هەتا بەرەو خوار بڕوا ، باوك و باوکی باوك هەتا بەرەو ژوور ئەڕوا ، برای باوکی و دایکی ، برای باوکی ، برای دایکی ، کوڕی برای باك و دایکی ، کوڕی برای باوکی ، مامی باوك و دایکی ، مامی باوکی ، کوڕی مامی باوك و دایکی ، کوڕی مامی باوکی ، مێرد ، پیاوێ بەندەی خۆی ئازاد کردبێ .

میراتبەر لەژناندا (١٠) کەسن : کچ و کچی کوڕی هەتا بەرەو خوار ئەڕوا ، دایك و دایکی دایك ، دایکی باوك هەتا بەرەو ژوور ئەڕۆن ئەو نەنکانە ، خوشکی باوك و دایکی، خوشکی باوکی ، خوشکی دایکی ، ژنی مێرد مردوو ، ژنێ بەندەی خۆی ئازاد کردبێ.

ئەو شتانەی ئەبنە هۆی میرات گرتن چوار شتن : خزمایەتی بە گوێرەی دیاریکراوی یاسا ، ژن و مێردی ، سەرۆکایەتی بەهۆی ئازادکردنی بەندەوە ، موسوڵمانان.

شەش کەس هەن هەرگیز بێبەش ناکرێن لەمیراتبردندا : باوك ، دایك ، کوڕ ، کچ ، ژن ، مێرد .

ئەو بەشانەی دیاریکراون بۆ هەندێ لەمیراتبەران شەش بەشن :

١- نیوەیی ( ٢\١ ) ، بەشی مێردە بەمەرجێ کوڕ و کوڕزای میراتبەری نەبێ ، بەشی تاقەکچێك و تاقە کچی کوڕە ، بەشی یەك خوشکی باوك و دایك و یەك خوشکی باوکی بەمەرجێ برای خۆیانیان لەگەڵ نەبێ .

٢- چواریەك ( $\frac{١}{٤}$ ) بۆ مێردە بەمەرجێ ژنە مردووەکە منالّی میراتبەری هەبێ لەهەر مێردێکی تر ، بۆ ژنێکە میراتبەری نەبێ لەهیچ مێردێکی .

٣- هەشت یەك ( $\frac{١}{٨}$ ) تەنها بۆ ژنە بەمەرجێ مێردەکەی منالّی میراتبەری هەبی لە هەر ژنێکی بێ .

٤- دووسێیەك ( $\frac{٢}{٣}$ ) بۆ دووکچ یا دووکچی کوڕ و زۆرتر ، بۆ دوو خوشکی باوك و دایکی و زۆرتر ، بۆ دووخوشکی باوکی و زۆرتر ، بەمەرجێ برایان لەگەڵ نەبێ .

٥- سێیەك ( $\frac{١}{٣}$ ) بەشی دایکی مردووە بەمەرجێ مردووەکە منالّی میراتبەری نەبێ ، یازۆرتر لەدووبراو خوشکی نەبێ ، ئیتر ئەو براو خوشکانە باوك و دایکی یاباوکی یا دایکی بن . بۆ نەنکە هەندێ جار کەزۆرتر لەبرای مردویان لەگەڵ بێ .

٦- شەش یەك ( $\frac{١}{٦}$ ) بەشی باوك و باپیرە بەمەرجێ مردووەکە منالّی میراتبەری هەبێ، بۆدایکی مردوو ئەگەر مردووەکە منالّی میراتبەری هەبێ یا زۆرتر لەیەك برا و لەیەك خوشك بۆ مردوو هەبێ ، بۆ نەنکە بەمەرجێ نەگاتە مردووەکە بەپیاوێ لەنێوان دووژندا ، وەك دایکی باوکی دایك ، بۆ کچی کوڕە یا زۆرتر بەمەرجێ لەگەڵ کچ بێ یا لەگەڵ کچی کوڕ کە زۆرتربن لەیەك ، بۆ خوشکی باوکی یا زۆرتر بەمەرجێ لەگەڵ خوشکی باوکی و دایکی دابن، بۆتەنها خوشکی دایکیە.

باسی کۆبونەوەی میراتبەران لەگەڵ یەکتری و میراتنەبردنی هەندێکیان بەبۆنەی کۆبونەوەی یان لەگەڵ یەکتری :

باوك و دایك و مێرد و ژن و کوڕ و کچ هەمو کاتێ میرات ئەبەن و هیچ کەس ڕێگەیان پێ ناگرێ . لەکاتی کۆبونەوەی کوڕ و کوڕی کوڕدا کوڕی کوڕ میرات نابا ، بەبونی کوڕی کوڕی نزیکتر کوڕی کوڕی دورتر میرات نابا ، باوکی باوك بەباوك یا بەباوکی باوکی نزیکتر بێ بەش ئەبێ لەمیرات ، برای مردوو لەهەموو لایەکەوە بەباوك وکوڕ وکوڕی کوڕی بێ بەش ئەبن لەمیرات. برای باوکی بە باوك و بەکوڕ و کوڕی کوڕ

بەبرای باوك و دایكی بێ بەش ئەبێ لەمیرات . برای دایكـــی بـە بـاوك و بـەباپیر بـەمناڵی میراتبەری مردوو بێ بەش ئەبن لەمیرات ، كوڕی برای باوك و دایكی بـەباوك و بـەباپیر و بەكوڕ و بەكوڕی كوڕ و بەبرای دایك و باوكی و بەبرای باوكی بێ بـەش ئـەبن. كـوڕی برای باوكی بەباوك و بەباپیر و بەكوڕو بەكوڕی كوڕ و بەبرای بـاوك و دایكـی و بـەبرای باوكی و كوڕی برای باوك و دایكی بێ بەش ئەبن لەمیرات ، مامی باوك و دایكی بـەباوك و بە باپیر و بەكوڕ و بەكوڕی كوڕ و بەبرای دایك و بـاوكی و بـرای بـاوكی و بـەكوڕی برای باوك و دایكی و بەكوڕی برای باوكی بێ بەش ئەبن لەمیرات . مامی باوكی بەوانەی ڕابوردن و بەمامی باوك و دایكی بێ بەش ئەبن لەمیرات . كوڕی مـــامی بـاوك و دایكـی بەوانەی پێشەوە و بەمامی باوكی بێ بەش ئەبێ لەمیرات ، كـوڕی مـامی بـاوكی بەوانـەی ڕاوبوردن و بەكوڕی مامی باوك و دایكی بێ بەش ئەبن لەمیرات .

كچانی كوڕ بە كوڕ و بەزۆرتر لەیەك كچ بێ بەش ئەبن لەمیرات ، بەمـــەرجێ كچـانی كوڕ بە تەنها بن و برای خۆیانیان لـەگەڵ نەبێ ، ئەگـــەر لـەگـەڵیان بـوون بـێ بـەش نـابن لەمیرات ، بەڵكو كچان دووسێ‌یەكی میرات ئەبن و كچی كوڕ ئەبێ بەهاوبەشی براكـــەی یا ئامۆزاكەی لەوەی ماوەتەوە لەمیرات لەبەشی كچان ، دایكی دایـك بـەدایك بـێ بـەش ئەبێ لەمیرات ، دایكی باوك بە باوك و بەدایكی مردوو بێ بەش ئـەبێ لـەمیرات . نـەنكی مردوو بەنەنكی نزیكتر بێ بەش ئەبێ لەمیرات لەهەردوو لای باوك دایكەوە ، نەنكی دوور لەلایەن باوكەوە بەنەنكی نزیكتری لەلایەن دایكەوە بێ بەش ئەبێ لەمیرات ، بەڵام نـــەنكی دوری لایەنی دایك بەنەنكی نزیكتری لایەنی باوك بێ بەش نابێ لەمیرات .

خوشك وەك برا وایە لەهەموو ڕویەكەوە ، كەواتە خوشكی بـاوك و دایكـی بـەباوك و بەكوڕ بەكوڕی كوڕ بێ بەش ئەبن لەمیرات . خوشـــكی بـاوكی بەوانـەی پێشـوو بـەبرای دایك و باوكی بێ بەش ئەبێ ، خوشكی دایكی بەباوك و بەباپیرو بەمناڵی میراتبەر بێ بـەش ئەبن لەمیرات . خوشكی باوك و دایكی یا باوكی بێ بەش ناكرێن لـــەمیرات لەگـەڵ ئـە م

میراتبەرانەی بەشی دیاری کراویـان هەیـە وەك مـێرد و دایـك و دوو خوشـكی دایكـی و خوشكێكی باوكی ، بەڵام برا لـەگەڵیانا بێ بەش ئەبێ ، بۆ ئەو مەبەستە تەماشـای نامـەكان بكەن . خوشكانی باوكی بەدوو خوشكی باوك و دایكی یا زۆرتر بێ بەش ئەبن لـەمیرات ، ئەو میراتبەرانەی بەشی دیاركراویان نیە هـەموو مـیراتی مردووەكـە یـا ئـەوەی ئەمێنێتـەوە لـەمیراتبەرانی بەشدار ئەیبەن .

باسی كۆبونەوەی مناڵانی مردوو لەگەڵ یەكتری و چۆنێتی میراتبردنیان :

كوڕی مردوەكە هەموو سامانی مردوو یا ئەو شتەی ئەمێنێتەوە لـەمیراتبەرانی تر ئەیبـەن. تەنها كچێ نیوەی سامان ئەبا ، زۆرتر لـەكچێ دووسـێیەكی سـامانی مـردوو ئەبـەن وەك باسمان كرد . كوڕ و كچ كۆبونەوە لەگەڵ یـەكتری كوڕێـك بەئـەندازەی دووئـەوەندەی بەشی كچ ئەبا ، مناڵی كوڕ وەك مناڵی مردوەكە وان ، مناڵی كوڕ لەگەڵ كوڕ یا لـەگـەڵ كوڕ و كچ دا بەش لـەمیرات نابا ، مناڵی كوڕ لەگەڵ كچدا ئەو شـتەی مایـەوە لـەنیوەی میرات یا دووسێیەك ئەیبەن ، كوڕی كوڕ ئەو كچەی لـەپلەی خۆیدا لـەخوشكی خۆی یـا كچی مامی ئەیكا بەهاوبەشی خۆی لـەمیرات بردندا ، هەروەها كچی سەرەوەی خۆی وەك كچی مامی و كچی مامی باوكی ئەیكا بەهاوبەشی لـەمیرات بردنـدا ، بـەڵام كچـی كـوڕ ئەگەر شەش یەكی برد و كوڕی كوڕی كوڕ ئەو كچەی كـوڕ ناكـا بـە هاوبەشـی خـۆی لـەمیرات بردندا ، ئەوەی مایەوە كوڕی كوڕی كوڕ ئەیبا . بۆ نمونە كەسێ ئەمرێ و كچ و كچیكوڕ وكوڕی كوڕی كوڕی هەیە لەژمارەی(٦)دابەشـەكان ڕوون ئەبێتـەوە: $\frac{١}{٢}$= ٣ بۆ كچ $\frac{١}{٦}$= ١ بۆ كچی كوڕ پاش ماوەكەی = ٢ بۆ كـوڕی كـوڕی كـوڕە . كەواتـە مناڵی كوڕ ئەگەر مێینە بوون یەك بن یان زۆرتر لـەگەڵ كچـی پشـتیدا شـەش یـەك ئـەبا ، لـەگەڵ زۆرتر لـەكچێ هیچ شتێ نابا و بێ بەش ئەبێ . هەر بـەو جـۆرەی باسـكرا هـەموو چینێ لـەمناڵی كوڕی مردوو نزیك و دووریان وێنەی مناڵی پشتین.

باسی میرات بردنی باوك و باپیر و میرات بردنی دایك لـەهەندێ كاتا :

باوك میرات ئەبا بەفەرز لەگەڵ منالّی نێری میرات بەر . بەتەعسیب بەش ئـەبا لەگـەڵ نەبونی منالّی میراتبەری نێرینەی مردوو ، بەفەرز و بەتەعسیب میرات ئـەبا لەگـەڵ منـالّی مێینەی میراتبەر ... دایك لەگەڵ باوك و یەكێ لەژن و مێرد سێیەكی ئەوەی ماوەتەوە ئەیبا . باپیر وەك باوك وایە بەڵام دایك ناگێڕێتەوە بۆ سێیەكی ئـەوەی ماوەتـەوە . باپـیر بـرای دایك و باوكی و برای باوكی بێ بەش ناكا لەمیرات بـردن و دایكـی بـاوكیش بـێ بـەش ناكا.

پێویستە بزانرێ مەبەست لە (العصبة) ئەو میراتبەرانـەن بەشـی دیـاری كراویـان نیـە . عەسبە بەسێ جۆرن ، عەسبە خۆی بۆ خۆی ، وەك كـوڕ و بـرا و مـام ، عەسـبە بـەهۆی جگەی خۆی ، وەك كچ لەگەڵ كوڕ و خوشك لەگەڵ برا ، عەسبە لەگەڵ جگەی خۆی، وەك خوشكی باوك و دایكی لەگەڵ كچ یاكچی كوڕ .

باسی میراتی جگەی باوك و باپیر و منالّ ، وەك برا و برازا و مام و ئامۆزا :

برا و خوشكی باوك و دایكی وێنەی منالّی مردو وان لەمیرات بردندا . بـرای بـاوكی وەك برای باوك و دایكی وان لەمیرات بردندا لەجگەی مەسـەلەی موشتەرەكەكە بریتـین لەمە ژنی ئەمرێ ئەمانە میراتی لێ ئەبەن : مێرد و دایك و برا یا خوشـكی دایكـی و بـرای باوك و دایكی هەیە ، لەو كاتەدا برای باوك و دایكی ئـەبێ بـە هاوبەشـی بـرا و خوشـكە دایكییەكاندا لەمیرات بردندا ، ئەگەر لەجیاتی برای باوك و دایكی برای هـەبو بـێ بـەش ئەكرێ لەمیرات بردندا .

كۆبونەوەی برای باوك و دایكی و برای دایكی و برای باوكی وەك كۆبونەوەی كوڕ و كوڕی كوڕ وان ، ئەگەر برای باوك و دایكی بەتەنها لەگەڵ خوشكیدا بـو بـرای بـاوكی بێ بەش ئەكەن لەمیرات بردنـدا . هـەمو كاتـێ كۆبونـەوەی بـرای بـاوك و دایكـی وەك كۆبونەوەی كوڕ و كوڕی كوڕن . بەڵام خوشك جگـەی بـرای خـۆی نایكـا بەعەسـبە . خوشكی باوك و دایكی یاخوشكی بـاوكی لەگـەڵ كچـی مـردودا كچـی كـوڕ عەسـبەن

کەواتە خوشکی باوك و دایکی لەگەڵ کچدا برای باوکی بێبەش ئەکەن لە میرات بردندا. کوڕی برای باوك و دایکی و کوڕی برای باوکی وەك باوکی خۆیان وان بەیەکەوە بن یا تەنها بن هەمو میراتەکە ئەبەن ، ئەگەر کۆبونەوە بەیەکەوە کوڕی برای باوکی بەکوڕی برای باوك و دایکی بێ بەش ئەبێ لەمیرات بردندا . هەمو کاتێ کوڕی برای باوك و دایکی و کوڕی برای باوکی وەك باوکی خۆیانن بەلاّم ئەمان دایك لەسێ یەکەوە ناگێڕنەوە بۆلای شەش یەك بردن و میرات نابەن لەگەڵ باپیردا و جگەی خوشکی خۆیان ناگێڕن بەعەسبە و لەمەسەلەی موشتەرەکیشدا بێ بەش ئەکرێن لەمیرات بردندا . مام بەوێنەی براوان بەتەنها بن یا مامی باوك و دایکی کۆببێتەوە لەگەڵ مامی باوکی ، هەروەها عەسبەکانی تریش وەك ئەوان وان وەك ئامۆزا و ئامۆزازا .

باسی میرات بردن بەهۆی ئازاد کردنی بەندەوە :

ئەگەر کەسێ مرد و میراتبەری پشتی نەبوو ، هەمو میراتەکەی یا ئەوەی ئەمێنێتەوە ئەدرێ بەئازادکەری مردوەکە ئەگەر بەندە بوو ، دوای ئەو ئەدرێ بەعەسەبەی بەخۆ بو بەعەسەبە لەپشتا بەوێنەی کوڕ و برا ، دوورەکانیان بەنزیکترینیان بێ بەش ئەبن لەوەرگرتنی میرات . کوڕی کوڕی ئازاد کەر بەکوڕی ئازاد کەر بێ بەش ئەکرێ لەبردنی میرات . بەلاّم برای ئازاد کەر و کوڕی برای ئازادکەر پێش ئەخرێن لەمیرات بردندا لەسەر باپیری ، ئەگەر ئازاد کەری نەبوو میراتەکەی ئەدرێ بە ئازاد کەری ئازادکەری دوایی ئەدرێ بەعەسبەکانیان بەوێنەی عەسبەی پشتی . ئەگەر هیچ کەسی نەبوو میراتی ئەو مردووە ئەدرێ بەموسوڵمانان ، ژن میرات نابا بەهۆی ئازاد کردنەوە مەگەر ئازاد کراوی خۆی یا ئەو کەسەی ئازاد کراوەکەی پاڵی پێوە ئەدەن لەپشتا و لەئازاد کردندا .

باسی میرات بردنی باپیر و برای مردوو لەکاتی کۆبونەوەیاندا:

بۆ باپیر هەیە لەگەڵ برای باوکی و دایکی و خوشکی باوکی و دایکی و لەگەڵ برای باوکی و خوشکی باوکی زۆرتر لەسێ یەکی میراتی مردوو بەش کردنی میرات وەك برا

بەمەرجێ خاوەن بەشی دیاریکراویان لەگەڵ نەبێ ، بۆ باپیر هەیە لەگەڵ برای باوك و دایكی و خوشكی باوكی لەگەڵ برای باوكی و خوشكی باوكی لەشەش یەك و سێیەكی ئەوەی ئەمێنێتەوە لەدوای بەش بردنی میرات بەران و بەش كردنی میرات وەك برا بەمەرجێ میراتبەری بەش بۆ دیاری كراویان لەگەڵ بێ . دوایی ئەگەر لەشەش یەك نەمایەوە باپیر ئەبێ هەر شەش یەك وەربگرێ با بەعەولیش بێ و لەوكاتەدا براكان و خوشكان بێ بەش ئەبن لەمیرات چونكە هیچ شتێ لەمیرات نامێنێتەوە هەتا بیبەن ، هەروەها بۆ باپیر هەیە زۆرتر لەسێیەكی دارایی مردوو بەش كردنی میرات وەك برا ئەگەر خاوەن بەشی دیاری كراویان لەگەڵ بێ ، زۆرتر لەشەش یەك و ئەوەی ئەمێنێتەوە و بەش كردنی وەك برا لەگەڵ برای باوك و دایكی و برایباوكی و خوشكی باوك و دایكی و خوشكی باوكی ، لەو كاتەدا برای باوك و دایكی برای باوكی و خوشكی باوكی ئەكا بەهاوڕێ بۆ خۆی لەسەر زیانی باپیر لەبەشكردندا، دوایی ئەگەر برای باوك و دایكی یا براو خوشك یا خوشك لەگەڵ كچ یا كچی كوڕ هەبون ئەو كاتە برا و خوشكی باوكی بێ بەش ئەكرێن لەمیرات . ئەگەر برای باوك و دایكی نەبو ، دوایی یەك خوشكی باوك و دایكی هەتا نیوەی دارایی ئەبا ، زۆرتر لەیەك خوشكی باوك و دایكی هەتا دوو سێیەكی دارایی ئەبەن ، زۆر جار لەدوو سێیەك هیچ نامێنێتەوە ، كەم جار لەنیوەی دارایی شتێ ئەمێنێتەوە ئەدرێ بەبرا و خوشكی باوكی . بۆ باشتر زانینی ئەم باسە تەماشای نامەكان بكە.

بەش دانانرێ بۆ خوشكی باوك و دایكیٰ یا خوشكی باوكی لەگەڵ باپیردا لەجگەی (ئەكدەریەدا) ئەویش ئەمەیە ژنێ ئەمرێ مێرد و دایك و خوشكی دایك و باوكی و باپیری هەیە ، لەو كاتەدا بەشەكانیان بەعەولەوە ئەچێتە ژمارە (٢٧) . یەكەم لەشەشە و عەولی تێدا ئەكرێ بۆ لای نۆ ، دوایی ٣ × ٩ = ٢٧ ٦ بۆ دایك ٩ بۆ مێرد ٨ بۆ باپیر ٤ بۆ خوشك .

باسی ئەو شتانەی ئەبنە هۆی وەرنەگرتنی میرات .

بێ باوەڕان میرات لەیەکتری ئەبەن با ئاینەکانیان جیاواز بن ، بەڵام بێ باوەڕی جەنگ کەر و بێ باوەڕی هاوپەیمان لەگەڵ موسوڵمانان میرات لەیەکتری ناگرن ، بێ باوەڕ و موسوڵمان میرات لەیەکتری ناگرن . دووکەس کەمیرات لەیەکتری ئەگرن ئەگەر بەیەکەوە خنکان و نەئەزانرا کامیان لەپێشەوە مردووە میرات لەیەکتری ناگرن ، ئەوکەسەی لەئاین وەرگەڕێ میرات لەکەس وەرناگرێ و میراتیشی لێ وەرناگیرێ ، بەوێنەی کەسێ هیچ ئاینێ نەپەرستێ ، پیاوێ کەسێ بکوژێ ئەو کەسە میرات لەکوژراوەکە وەرناگرێ بازامنی خوێنەکەیشی نەبێ .

ئەگەر کەسێ ونبو هەواڵی نەئەزانرا ، دەست لەدارایی ئەو کەسە نادرێ هەتا دوو شایەت شایەتی ئەدەن لەسەر مردنی یا دادوەر فەرمانی بۆ مردنی ئەدا بەڕۆیشتنی ماوەیە بەگوێرەی کات زۆر تر لەوماوەیە نەژی ، دوایی میراتەکەی ئەدرێ بەمیراتبەرانی خۆی . ئەو باسە زۆری ماوە باس بکرێ ، چاك وایە تەماشای نامەکان بکرێ بۆ فێربوونیان . باسی چۆنێتی بەش کردنی میرات و بنچینەی ژمارەی بەشکردن و باسی ئەو ژمارانە عەولیان تێدا ئەکرێ .

ئەگەر میراتبەران هەمویان بەشی دیاری کراویان نەبوو ئەو کاتە میراتەکە بەش ئەکەن لەنێوان خۆیانا وەك سێ برا کە خوشکێکیان لەگەڵ نەبێ . ئەگەر برا و خوشك بەیەکەوە کۆبوونەوە برایە بەدوو خوشك دائەنرێ ژمارەی بەشکردنیان بەئەندازەی ژمارەی خۆیانە . ئەگەر خاوەنی بەشی دیاری کراویان لەگەڵ بوو وەك نیوەی یا دوو میراتبەری بەش دیاری کراویان لەگەڵ بوو ژمارەکانیان وەك یەك وابوو ، بەوێنەی دوو نیوەیی وەك کەسێ بمرێ و مێرد و خوشکی هەبێ ژمارەی بەشکردنی میراتەکەیان لە (٢) : ١ بۆ مێردەکەی و ١ بۆ خوشکەکەی . ئەو ژمارانە ژمارەی دەچوونی بەشکردنیان لێ دەربهێنرێ ئەمانەن :

$\frac{١}{٢}$ ژمارەکەی = بە (٢) . $\frac{١}{٣}$ و $\frac{٢}{٣}$ ژمارەکانیان = بە (٣) . $\frac{١}{٤}$ ژمارەکەی = (٤) . $\frac{١}{٦}$ ژمارەکەی = (٦) . $\frac{١}{٨}$ ژمارەکەی = بە (٨) .

ئەگەر ژمارەی بەشی میراتبەران جیاواز بوون و ژمارە زۆرەکەیان بـەژمارە کەمەکـەیان کۆتایی پێ ئەهات لەو کاتەدا ژمارەی بەشکردنەکەیان ژمارە زۆرەکەیانە .

بۆنموونە : شەش یەك و سـێ یـەك لەمانـەدا کـە میراتبـەران : کەسـێ ئـەمرێ دایـك و دووبرای دایکی و برایەکی باوکی یا باوك و دایکی هەیـە لـەژمارەی (٦) دا بەشـەکانیان دیاری ئەکرێ ، $\frac{١}{٦}$ بۆ دایك . $\frac{١}{٣}$ بۆ برا یا بۆ خوشکە دایکی‌یەکان ، ماوەکـەی = ٣ بۆ برا باوکی‌یەکان یا بۆ برا باوك و دایکی‌یەکان .

ئەگەر ژمارەی بەشـی میراتبـەران هاوبـەش بـوون لەکـەرتێکا و بەژمارەیـەکی سـێهەم کۆتاییان پێ هات ، ژمارەیە بەشی میراتبەران دیاری بکا بریتیە لەکەرتی یەکێ لەو ژمارانـە لەتەواوی ئەوی تریان . بۆ نموونە : پیاوێ ئەمرێ دایك و ژن و کوڕی هەیە ، ئەسـڵی ئـەو مەسەلەیە ژمارەی (٢٤) ە ، دایك $\frac{١}{٦}$ ئەبا ، ژن $\frac{١}{٨}$ ئەبا ، ژمـارەی ٣ یـا ٤ × لـەوی تریان = ٢٤ .   ٤ بۆ دایك ، ٣ بۆ ژن ، ١٧ بۆ کوڕ .

بۆ زانین کاتێ بێژرا ژمارەی کەرتی هاوبەش ، مەبەست لەکـەرت ئەمانـەن : $\frac{١}{٢}$ و $\frac{١}{٣}$ و $\frac{١}{٤}$ و $\frac{١}{٥}$ و $\frac{١}{٦}$ و $\frac{١}{٧}$ و $\frac{١}{٨}$ و $\frac{١}{٩}$ و $\frac{١}{١٠}$ .

ئەگەر ژمارەی بەشی میراتبەران دژی یەکتری بوون بـەجۆرێ بـەژمارەی کـەم کۆتـایی بەژمارە زۆرەکە نەئەهات و کەرتی هاوبەشیان نەبوو ، ئەسـڵی مەسـەلەکە بریتی‌یـە لـە × یەکێ لەو ژمارانە لەوی تریان . بۆ نموونە : پیـاوێ ئـەمرێ دایـك و ژن و بـرای دایـك و باوکی یا برای باوکی هەیە ، دایك $\frac{١}{٣}$ ئەبا ، ژن $\frac{١}{٤}$. ٣ یا ٤ × لەوی تریـان ئـەکا = ١٢ . ٤ بۆ دایك.   ٣ بۆ ژن . ٥ بۆ برا.

دوایی ئـەبێ بزانـرێ ئەسـڵی هـەموو مەسـەلەکانی مـیرات یـانی ئـەو ژمارانـە بەشـی میراتبەرانی تێدا ڕوون ئەبێتەوە بریتین لەم ژمارانـە : ٢ - ٣ - ٤ - ٦ - ٨ - ١٢ - ٢٤ .

سێ ژمارە لەو ژمارانە عەولیان تێدا ئەکرێ ، ژمارەی شەش عەولی تێـدا ئـەکرێ بـەتاك و بەجوت بۆ لای ژمارەی (١٠) ، ٦ بۆلای ٧ بـۆلای ٨ بـۆلای ٩ بـۆلای (١٠) کەواتـە چوار عەولی تێدا ئەکرێ .

١- ژنێ ئەمری مێرد و خوشکی دایك و باوکی یا باوکی هەیە ، مەسەلەکەیان لەژمارەی ٦ دا عەولی تێدا ئەکری بۆ لای ژمارەی ٧ ، ٣ بۆ مێرد ، ٤ بۆ خوشکەکان ، لەبەشی هەمویان حەوت یەکێ کەم ئەکرێتەوە .

٢- ژنێ ئەمرێ مێرد و دوو خوشك و دایکی هەیە ، مەسەلەکەیان لەژمارە ٦ - عەولی تێدا ئەکری بۆ لای ژمارە ٨ ، ٣ بۆ مێرد ٤ بۆ خوشکەکان ، ١ بۆ دایك ، ئەم مەسەلەیە پێی ئەوترێ (المباهلە) تەماشای شەرحی مەنهەج بکە بۆ زانیاری ئەوانە .

٣- ژنێ ئەمرێ مێرد و دوو خوشکی باوك دایکی یا بابوکی و برای دایکی هەیە ، مەسەلەکە لەژمارەی ٦ عەولی تێدا ئەکرێ بۆ لای ژمارە ٩ ، ٣ بۆ مێرد ، ٤ بۆ خوشکانی باوك و دایکی یا باوکی ، ١ بۆ دایك ، ١ بۆ برای دایك .

٤- ژنێ ئەمرێ مێرد و دوو خوشکی باوك و دایکی یاباوکی و دایك و دوو خوشکی هەیە ، مەسەلەکە لەژمارەی ٦ عەولی تێدا ئەکرێ بۆ لای ژمارە (١٠) ، ٣ بۆ مێرد ، ٤ بۆ خوشکەکانی ، باوك و دایکی یا باوکی ١ بۆ دایك ٢ بۆ دووخوشکی دایکی.

ژمارەی (١٢) عەولی تێدا ئەکرێ سێ جار بەتاك ، بۆ لای ژمارە (١٣) ، بۆ لای ژمارە (١٥) ، بۆ لای ژمارە (١٧) .

١- پیاوێ ئەمرێ ژن و دایك و دوو خوشکی باوك و دایکی یا باوکی هەیە ، ئەسڵی مەسەلەکە لە ژمارەی (١٢) ە ، ٣ بۆ ژن ، ٢ بۆ دایك ، ٨ بۆ خوشکەکان ، عەولی تێدا کراوە بۆ لای ژمارە (١٣) .

٢- پیاوێ ئەمری ژن و دایك و دوو خوشکی باوك و دایکی یا باوکی و برایەکی دایکی هەیە ، عەولی تێدا ئەکرێ لەژمارە (١٢) ە بۆ لای ژمارە (١٥) ، ٣ بۆ ژن ، ٢ بۆ دایك ، ٨ بۆ خوشکەکان ، ٢ بۆ برای دایکی .

٣- پیاوی ئەمرێ ژن و دایك و دوو خوشکی دایك و باوکی یا باوکی و دووبرای دایکی هەیە . مەسەلەکە لە (١٢)ە عەولی تێدا ئەکرێ بۆ لای ژمارە (١٧) ، ٣ بۆ ژن ، ٢ بۆ دایك ٨ بۆ دوو خوشکی باوك و دایکی یا باوکی ، ٤ بۆ برا دایکیەکان .

ژمارە (٢٤) عەولی تێدا ئەکرێ بۆ لای ژمارە (٢٧) یەك جار بەتاك : پیاوێ ئەمرێ دوو کچ و دایك و باوك و ژنی هەیە. ئەسڵی مەسەلەکە لەژمارەی (٢٤) عەولی تێدا ئەکرێ بۆلای ژمارە (٢٧) ، (١٦) بۆ دوو کچەکان ، (٨) بۆ باوك و دایك (٣) بۆ ژن .

بۆ زانین : جیاوازی نێوان (الرد والعول) ڕەد بریتیە لەزۆرکردنیۆ بەشی میراۆتبەر و کەم کردنەوەی ژمارەی میراتبەران ، عەول بریتیە لەکەم کردنەوەی بەشەکان و زۆرکردنی ژمارەی میراتبەرەکان .

باسی شی کردنەوەی مەسەلەکان و ناسینی بەشی هەموو میراتبەرێ لەو ژمارەیەی بۆی دانراوە ئەگەر یەشەکانی میراتبەران لەو ژمارەیەی بۆی دیاری کراوە بەش ئەکرا بەسەریانا بەبێ کەرت ، ئەوە ئاشکرایە و ماندو بونی ناوێ ، بۆ نمونە ژنێ ئەمرێ مێرد و سێ کوڕی هەیە ، مەسەلەکەیان لەژمارەی (٤) ، $\frac{١}{٤}$ بۆ مێرد ، $\frac{٣}{٤}$ بۆ سێ کوڕ ، بەشەکانیان بەبێ کەرت بەش ئەکرێ بەسەریانا .

ئەگەر ژمارەی مەسەلەکە بەبێ کەرت بەش نەئەکرا بەسەر تاقمێ لەمیراتبەران ، دوایی بەشەکانیان دژی ژمارەی میراتبەران بوو یانێ هاوبەش نەبوون لەکەرتێکا ، ژمارەی میرات بەران × لەتەواوی ژمارەی دیاری کراو بۆ بەش کردنیان ، بۆ نمونە: ژنێ ئەمرێ مێرد و دووبرای هەیە ژمارە بەش کردن بۆیان = بە (٢) $\frac{١}{٢}$ بۆ مێرد ، ئەوە ماوەتەوە = بە ١ – بەش ناکری بەسەر دووبرادا . ژمارەۆی براکان = ٢ × ٢ = ٤ ، دوو بەش بۆ مێرد ، دووبەشەکەی تری بۆ براکان . ئەو مەسەلەیە عەولی تێدا نیە ، وائەبێ مەسەلەیە عەولی تێدا هەیە ، وەك ئەمەی ژنێ ئەمرێ مێرد و پێنج خووشکی باوك و دایکی یا باوکی هەیە ، مەسەلەکەیان = بە ٦ ، نیوەی بۆ مێرد ، $\frac{٢}{٣}$ ی بۆ خوشکەکان عولی تێدا ئەکرێ بۆلای ژمارە (٧) ، ٣ بۆ مێرد ، چواری بۆ خوشکەکان بەش ناکرێ بەسەر ژمارەیاندا کە پێنج ژمارەن ×٧ = ٣٥ ، (١٥) بۆ مێرد ، ٢٠ بۆ خوشکەکان هەریەکەیان چوار بەش ئەبەن .

ئەگەر ژمارەی دیاری کراو بۆ بەش کردن هاوبەشبوون لەگەڵ ژمارەی میراتبەران لەکەرتێکا ، ئەو کەرتە × لەژمارەی بەشی دیاری کراو بۆیان ، دوایی بەهەر ژمارەیە گەیشت ئەو ژمارەیە ژمارەی دیاری کراوە بۆ بەش کردن ، بۆ نمونە : کەسێ ئەمرێ دایك و چوار مامی باوك و دایکی یا باوکی هەیە ، مەسەلەکەیان بەبێ عەول = بەژمارەی ٣ ، $\frac{١}{٣}$ بۆ دایك ئەوەی ماوەتەوە = ٢ ، بەش ناکرێ بەسەر چوار مامدا ، کەرتی هاوبەش = ٢ × ٣ = ٦ ، ٢ ژمارەی بۆ دایك ، ٤ بەشیان بۆ چوار مام .

ژنێ ئەمرێ مێرد و باوك و دایك و شەش کچی هەیە ، مەسەلەکەیان لە (١٢) ، $\frac{١}{٤}$ بۆ مێرد $\frac{٢}{٦}$ بۆ باوك و دایك ، $\frac{٢}{٣}$ بۆکچەکان ، بەعەولەوە ئەچێتە (١٥) ، ٣ بۆ مێرد، (٤) بۆ باوك و دایك ، (٨) بۆ شەش کچ ، کەرتی هاوبەش = ٣یا ٤ × ١٥ = ٤٥ – ٩ بۆ مێرد ، ١٢ی بۆ باوك و دایك ، ٢٤ بۆ کچەکان .

ئەوانەی سەرەوە بۆ ژمارەیە بو کەبەبێ کەرت بەش نەکرێ بەسەر میراتبەراندا ، ئێستایش باسی ژمارەیە ئەکەین کەبەبێ کەرت بەش ئەکرێ بەسەر دوو تاقم لەمیراتبەران.

ئەگەر ژمارەی دیاری کراو بۆبەش کردن بەسەر میراتبەراندا بەش ئەکرا بەسەر ژمارەی زۆرتر لەیەك تاقم ، لەم کاتەدا چوار جۆرە بەش کردن لەماندا ڕەچاو ئەکرێ .

١– ئەو میراتبەرانە ئەگەر بەشەکانیان هاوبەشبوون لەگەڵ کەرتێ لەژمارەکانیان ، هەریەکە لەژمارەی میراتبەران ئەگێڕێتەوە بۆلای کەرتی هاوبەش ، دوابی ئەگەر ژمارەی تاقمەکان وەك یەك وابون ژمارەی یەکێ لەو میراتبەرانە × لەتەواوی ژمارەی بەش کراو بۆیان . بەهەر ژمارەیە گەیشت ئەبێ بەژمارەی بەشکردن .

٢– ئەگەر ژمارەی میراتبەران یەکێکیان کۆتایی بەئەوی تریان ئەهێنا جارێ یازۆر ، ژمارە زۆرەکەیان × لەژمارەی دیاری کراو بۆ بەش کردن . بەهەر ژمارەیە گەیشت ئەبێ بەژمارەی ڕاستی بۆ بەشکردنی میراتی میراتبەران.

٣– ئەگەر ژمارەی تاقمەکانی میراتبەران هاوبەش بوون لەکەرتێکا ، کەرتی یەکێکیان × ئەوی تریان تەواوەکەی × ژمارەی دیاری کراو بۆ بەش کردنیان ، بەهەر ژمارەیە گەیشت ئەبێ بە ژمارەی تەواوی بەشکردنی میراتبەران .

٤- ئەگەر ژمارەی تاقمەکانی میراتبەران دژی یەکتری بوون ، یانی نەوەك یەك وابوون، یەکێکیانیش زۆرتر نەبوو لەوی تریان ، کەرتی هاوبەشیشیان نەبوو ، تەواوی ژمارەی یەکی لەمەیراتبەران × ئەوی تریان ، تەواوەکەی × ژمارەی دیاری کراو بۆ بەش کردنی میراتی میراتبەران.

نمونەیە بۆ ئەوچوار خاڵانەی پێشوو:

١- کەسێ ئەمرێ دایك و شەش برای دایکی و دوازدە خوشکی باوك و دایکی و یاخوشکی باوکی هەیە . مەسەلەکەیان لەژمارەی (٦) بەعەولەوە ئەچیچتە (٧) ، $\frac{١}{٦}$ بۆ دایك ، $\frac{١}{٣}$ بۆ برادایکیەکەکان ، $\frac{٢}{٣}$ بۆ خوشکە باوك و دایکی یا باوکیەکان. ژمارەی براکان و خوشکەکان دوای گەڕانەوەیان بۆ کەرتی هاوبەش بۆیان = ٣ × ٧ = ٢١ ، ٣ بۆ دایك ، ٦ بۆ براکان ، ١٢ بۆ خوشکەکان .

٢- کەسێ ئەمرێ سێ کچ و سێ برای باوك و دایکی یا باوکی هەیە ، مەسەلەکەیان = یە (٣) ، (٢) بۆ سێ کچ . (١) بۆ سێ برا ، ژمارەکانیان وەك یەك وایە × ٣ = (٩) ، ٦ بۆ کچەکان ، ٣ بۆ براکان .

٣- کەسێ ئەمرێ شەش کچ و سێ برای باوك و دایکی یا باوکی هەیە ، مەسەلەکەیان لە (٣) دوای گەڕانەوەی ژمارەی کچەکان بۆ لای کەرتی هاوبەش = (٣) لەگەڵ ژمارەی براکان وەك یەك وان ، یەکێکیان ×٣ = (٩) ، ٦ بۆ کچەکان ، ٣ بۆ براکان .

٤- کەسێ ئەمرێ سێ ژن و چوار برای هەیە ، مەسەلەکەیان لە (٤)٥ ، (١) بۆ سێ ژن ، (٣) بۆ چوار برا ، ژمارەی ژنەکان و براکان دژی یەکترین و کەرتی هاوبەشیشیان نی‌یە ، ژمارەی ژنەکان × ژمارەی براکان = ١٢ × ٣ = ٣٦ ، ١٢ بۆ سێ ژن ، ٢٤ بۆ چوار کوڕ .

هەروەك ئەوەی باسکرا کەژمارەی دیاری کراو بۆ بەشکردنی میرات بەش نەکری بەسەر یەك تاقمدا یا بەسەر دوو تاقمدا ، ئەو کردەوەیە بۆ ئەوان کرا بۆ ژمارەیەکە بەش نەکرێ بەسەر سێ تاقمدا یا چوار تاقمدا ، وێنەی ئەو کردەوەیەش لەگەڵ ئەمانیشدا ئەکرێ .

ئەگەر ویستت بزانی بەشی هەریەکە لــەتاقمی میراتبــەر چــەندە لــەتــەواوی ئــەو ژمارەیــە دیاری کراوە بۆ بەش کردنی میرات ، هەر ژمارەیە × لەمەسەلەکە یا × بکە لـەیەکەیــەکی بەشی میراتبەران ، ئەو کاتە بەشی هەمویان ڕوون ئەبێتەوە .

بۆ زانین : لـەمەوپاش باسی موناسەخات ئەکەین ، موناسەخات کــۆی نەســخە ، نەســخ : لێرەدا ئەمەیە یەکێ لـەمیرات بەر بمرێ بەر لـەبەش کردنی میرات .

ئەگەر کەسێ مرد و چەند میراتبەرێکی هەبوو ، دوایی بەر لـەوەی میراتەکە بــەش بکــرێ یەکێ لـەو میراتبەرانە مرد ، ئەگەر جگــەی ئەوانــەی ماونەتــەوە مــیراتگری تــری نــەبوو ، میراتەکەی نەگۆڕابو وا دائەنرێ هەر نەبوە ، وەك ئەوەی کەسێ بمرێ و چوار برای هــەبێ بەر لـەوە میراتەکە بەش بکرێ یەکێکیان ئەمرێ و هەر ئەو سێ برایەی لێ بەجێ ئەمێنێ .

ئەگەر یەکێ لـەمیراتبەران مــرد بــەر لــەوەی میراتەکــە بــەش بکــرێ ، جگــەی ئەوانــەی ماوەتەوە میراتبەری تر بوو بەهاوبەش لــەو میراتــە یــا ئــەو میراتبەرانــە ماونەتــەوە میراتیــان ئەگرت ، بەلام میراتەکەیان وەك میراتی پێش مردنی ئــەو کەســە نــەبوو ، دوایــی هــەردوو مەسەلـەکە بەگوێرەی یاسا دروست ئەکەین و بەشی میراتبەران لـەهەردوو مەسەلـەکە دیاری ئەکەین ، دوایی ئەگەر بەشی میراتبەری مردوو لـەمەسەلـەی یەکــەمدا بــەش ئــەکرا بەســەر میراتبەرەکانیدا لـەمەسەلـەکەی خۆی ، ئەو کاتە زۆر چاکە ، بۆ نمونە: ژنێ ئــەمرێ مــێرد و دووخوشکی باوك و دایکی یا باوکی هەیە ، بەر لـەبــەش کردنــی میراتەکــەی یــەکێ لــەو برایانە ئەمرێ و ئەو برای ترەی هەیە لـەگەڵ کچێکا ، مەسەلـەی یەکەم لـە ژمارەی شەشە ، بەعەولـەوە ئەچێتە حەوت ، مەســەلـەی دووهــەم لــەژمارەی دوو دا تــەواو ئــەبێ ، بەشــی مردووەکە لـەمەسەلـەی یەکەمدا = بە (٢) ، $\frac{١}{٢}$ بەشی کچەکەیە ، ئەوەی ماوەتەوە = بــە (١) ئەدرێ بەخوشکەکە و بەبێ کەرت بەسەریانا بەش ئەکرێ .

ئەگەر کەسێ مرد و میراتەکەی بەش نەئەکرا بەسەر میراتبەراندا ، ئەگەر بەشــی مــردوی دووهەم لـەمەسەلـەی یەکەمدا بەش نەئەکرا بەسەر میراتبەرانیدا ، ئــەو کاتــە ئەگــەر بەشــی

مردوی دووهەم لەگەڵ مەسەلەی دووهەمدا کەرتی هاوبەشیان بو ، ئەو کەرتە لە مەسەلەی دووهەمدا × ئەکرێ لەمەسەلەی یەکەمدا . بۆ نمونە : کەسێ ئەمرێ و دوو نەك و خوشکێکی باوك و دایکی و خوشکێکی باوکی و خوشکێکی دایکی هەیە ، بەر لەبەش کردنی میراتەکە خوشکە دایکیەکە ئەمرێ و خوشکێکی دایکی کە خوشکە دایك و باوکیەکە لە مەسەلەی یەکەمدا و دوو خوشکی باوك و دایك و نەنکی لێ بەجێ ئەمێنێ کەیەکێکە لەو دوو نەنکەی مەسەلەی یەکەم ، دوایی مەسەلەی یەکەم لەژمارەی (٦) و لەژمارەی (١٢) بەتەواوی بەبێ کەرت بەش ئەکرێ . مەسەلەی دووهەم لە (٦) بەشی مردووی دووهەم لەمەسەلەی یەکەمدا = (٢) لەگەڵ مەسەلەی دووهەمدا لەکەرتی نیوەیدا هاوبەشن ، نیوەی مەسەلەی دووهەم = ٣ × ١٢ = (٣٦) ، هەموو یەکێ لەنەنکەکان (٣) بەشیان هەیە = بە (٦) یەکێ لەنەنکەکان لەمەسەلەی دووهەمدا بەشی تری هەیە هەموی = بە (٤) دوو خوشکە باوك و دایکیەکان لەمەسەلەی یەکەمدا (١٨) بەشیان هەیە و لەمەسەلەی دووهەمدا (١) بەشی هەیە ، هەمووی = (١٩) ، خوشکی باوکی لەمەسەلەی یەکەمدا (٦) بەشی هەیە دوو خوشکە باوکیەکان لەمەسەلەی دووهەمدا (٤) بەشیان هەیە ، هەمووی = بە (٣٦) . ئەگەر بەشی مردووی دووهەم لەمەسەلەی یەکەمدا لەگەڵ مەسەلەی دووهەمدا هاوبەش نەبون لەکەرتێکا هەموو مەسەلەی دووهەم × لەمەسەلەی یەکەم ، ئەو کاتە بەهەر ژمارەیە بگا بەبێ کەرت میراتەکە بەش ئەکرێ بەسەر میراتبەراندا لەهەردوو مەسەلەکەدا . بۆ نمونە : پیاوێ ئەمرێ ژنێك و سێ کوڕ و کچێکی هەیە بەر لەوەی میراتەکە بەش بکرێ کچەکە ئەمرێ ، دایك و سێ برا پێشوەکانی هەیە کە کوڕەکانن لەمەسەلەی یەکەمدا ، مەسەلەی یەکەم لەژمارەی (٨) تەواو ئەبێ ، کوڕەکان هەمویان شەش بەش ئەبەن ، ژنەکە یەك بەش ئەبا ، کچەکە یەك بەش ئەبا . مەسەلەی دووهەم لەژمارەی (١٨) تەواو ئەبێ ، بەشی کچە مردووەکە لە مەسەلەی یەکەمدا = بە (١) لەگەڵ مەسەلەی دووهەمدا دژایەتیان هەیە لەهاوبەشی کەرتا، کەواتە (١٨) × (٨) = (١٤٤) ژنەکە لەمەسەلەی یەکەمدا (١٨)

بەشی هەیە و لەمەسەلەی دووهەمدا (٣) بەشی هەیە هەموی = (٢١) کوڕەکان هەریەکەیان لەمەسەلەی یەکەمدا (٣٦) بەشیان هەیە و لەمەسەلەی دووهەمدا هەریەکەیان (٥) بەشیان هەیە = بە (٤١) ، هەموویان = (١٤٤) ، ئەو مەسەلەیە هەردوو مەسەلەکەی تێدا بەش ئەکرێ وەك مەسەلە وایە ، دوایی کەسێ تری سێهەم یا چوارەم مرد بەو جۆرەی ڕابورد میراتەکانیان بەش ئەکرێ .

خوای مەزن کاتێ لەئایەتەکانی پێشوودا باسی فەرمانداني پێداین کەچاکە بکەین لەگەڵ ژنان و ڕابواردن لەگەڵیان بەچاکی ، باسی ئەمەیشمان بۆ ئەکا کە توند و تیژ بین لە لەگەڵیان لەو کاتەدا دەستیان دایە داوێن پیسی ، چونکە لەڕاستیدا ئەو توند و تیژیەش چاکەیە لەگەڵیان ، نەوەك وابزانرێ فەرماندان بەچاکە لەگەڵیان ئەبێتە هۆی ئەوەی سنوری خوایان بەسەردا نەسەپێ ، هەتا بکەونە نێو چەندین خراپە و گوناهی زۆرەوە بەبۆنەی ئەو فەرمانانەوە ، بۆ ئەوەیش بزانرێ چۆن تۆڵەی خراپەکردنیان لێ بسێنرێ ، فەرمانی خوا خزمایەتی و دۆستایەتی تێدا نییە ، ڕەورەوەی ئەم دەستورە لەسەر داد پەروەری و خۆ پاراستنە لەڕێگەی خوار و خێچ ، بۆیە ئەفەرموێ :

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾

﴿ واللاتي يأتين الفاحشة مِنْ نِسائِكُم فاستَشهِدوا عَلَيهنَّ أربَعةً مِنْكُم ﴾ دوایی کەسانێکی ئەوتۆ لەژنەکانی ئێوە کارێکی بێز لێکراو و خراپیان کرد لەداوێن پیسی ، دوایی ئێوەی کاربەدەست و دادوەر داوای چوار پیاو لەخۆیان بکەن شایەتی بدەن لەسەر ئەو کارە خراپەی ژنەکانتان کردویانە ، ئیتر ئەو ژنانە ژنی خۆتان بن یان نە ؟ بەچاوی خۆیان ببینن کەخەنجەر لەکێلانا بوە .

ئەو کارە بێزلێکراوانە دەر ناکەوێ بەدوو مەرج نەبێ :

١- ئەو ژنانە یا ئەو پیاوانە ئەو کارە خراپەیان کردووە خۆیان بەدەمی خۆیان بڵێن : ئەو کارە خراپەمان کردووە.

٢- چوار پیاوی موسوڵمان و دادپەروەر و بێ‌گوناە شایەتی بدەن کە ئەو پیاوە وئەو ژنە ئەو کارە خراپەیان کردووە ئەندامی پیاوەکەمان بینی لەنێو ئەندامی ژنەکەدا ، ئەگەر شایەتەکان لەچوار پیاو کەمتر بوون ، یا شایەتی دانەکەیان دژی یەکتری بوون و لەیەك جوێ بوون هەمو یەکێ لەو شایەتانە ئەبێ هەشتا داریان لێ بدرێ ، ئەو کەسەش بوختان بەکەسێکا بکا و چوار شایەت نەهێنێ هەشتا داری لێ بدرێ .

ئەو باسە بۆمان دەرئەخا کەئادەمیزاد بەڕێزە و نابێ ناموسی بڕوشێ ، چونکە دەرخستنی خراپە سەرئەکێشێ بۆ لای خراپەی کۆمەڵگا و لەناو چوونی بنەماڵە ، بەناڕەوا نابێ ڕێزیان پێشێل بکرێ .

﴿ فإن شَهِدوا فأمسكوهنّ في البيوت ﴾ دوایی ئەگەر شایەتەکان شایەتیان دا و داوێن پیسیەکە دەرکەوت ، ئێوە ئەو ژنانە بەند بکەن لەنێو خانوەکاندا وە نەچنە دەرەوە ، نەوەك جارێ تر توشی کاری خراپ بن و تەمێ خوار بن ، بەندیان بکەن .

﴿ حتى يتوفاهن الموت أو يجعل الله لهن سبيلاً ﴾ هەتا مردن گیانەکانیان وەرئەگرێ ، یا هەتا فریشتە گیانیان وەرئەگرن لەکاتی دیاری کراو بۆ مردۆنیان ، یا هەتا خوا ڕێگەیە بۆ ئەو ژنانە ساز ئەکا و سنوریان بۆ دیاری ئەکا و ڕزگاریان ئەبی لەبەندیخانە .

ئەوئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا کە خوا ئەو بەندکردنەی نەگێڕاوە بەیاسای بەردەوام بەڵکو گێراوێتی بەدەستور بۆ ماوەیەکی دیاریکراو و کاتی ، لەپاشا دەستورێکی بەردەوام

پەیدا ئەکا ، هەروایشبوو چونکە ئەو یاسایە گۆڕدرا ، بەردەباران کرا بەسزا بۆ کەسانێ ژنیان هێنابێ و شویان کردبێ ، بۆ کەسانێ ژنیان نەهێنابی یا شویان نەکردبێ سزاکەیان لێدانی سەد دارە لەوان ، لەسورەتی (نور) دا بەدرێژی باسی ئەکرێ ، خوا یاریدەربێ .

﴿ واللذان يأتيانها منكم فآذوهما ﴾ وەئەو دووکەسانەی ئەوتۆ ئەو کارە خراپە ئەکەن لەئێوە ، دوایی ئێوە ئازاری ئەو دوو کەسانە بدەن ، بەوان بڵێن : ئێوە بۆ شەرمتان نەکرد؟ بۆ لەخوا نەترسان ؟ ئەو کارە بێز لێ کراوەتان کرد .

زانایان لەمەبەست لەو دووکەسانە بیریان جیاوازە ، زۆرتریان لەسەر ئەوەن مەبەست لەو دووکەسانە ئەو پیاو و ژنەن داوێن پیسیان کردووە ، بەڵام تێبینی ئەکرێ لەسەر ئەوبۆچونە بەجۆرێکی ئاشکرا ، چونکە ووشەی (اللذان) بۆ دوونێرینەیە بەزاراوەی عەرەبی و یاسای ئازاردانی ژن لەپێشدا باسی کراوە و هۆی دووپات کردنەوەی نیە ، ئەوەی ڕاستی بێ مەبەست لەو دووکەسە دوو پیاوە کە ئەو کارە بێز لێکراوە لەگەڵ یەکتری بکەن ، دووبارە ووشەی (منكم) کەئەویش بۆ پیاوانە بەڵگەیە لەسەر ئەو بیرو بۆچوونە ، سزای لیواتە کە ئازاردانە بەسەرزەنشت کردنیان گۆڕاوە هەروەك سزای داوێن پیسی ژن و پیاو گۆڕاوە ، سزای ئەو دوو پیاوە ئەو کارە بێز لێ کراوە لەگەڵ یەکتری ئەکەن : سەربڕینە یا سوتاندنیانە بەئاگر ، یا لەکێوێکی بەرز فڕێ بدرێنە خوارەوە ، یا دیوارێ بەسەریانا بڕوخێنرێ ، چونکە ئەوتاوانە زۆر خراپترە و مرۆڤایەتی و پیاوەتی ناهێڵێ .

﴿ فإن تابا وأصلَحا فأعرضوا عَنهُما إنَّ اللهَ كانَ تواباً رحيماً ﴾ دوایی ئەگەر ئەو دووکەسانە دوای ئەو کارە خراپە پەشیمان بونەوە و خۆیانیان چاك کرد بەکردەوەی چاك بەڕاستی ئێوە وازیان لێ بهێنن و ئازاریان مەدەن و کردەوەکانیان لەبیربەرنەوە . بەڕاستی خوا ئەبورێ لەگوناهی ئەوان ، خاوەن بەزەیی و میهرەبانیە بۆیان .

خوای مەزن لەو ئایەتەدا فەرموی : بەڕاستی خوا لەگوناهی خراپەکاران ئەبورێ و میهرەبانە بۆیان ، بۆیشمان ڕوون ئەکاتەوە مەرجەکانی پەشیمان بونەوە چ شتێکن و ئەفەرموێ:

إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾

﴿ إنّما التوبة على الله لَلذين يعمَلونَ السوء بَجَهالـة ﴾ بەڕاستی وەرگرتنی پەشیمان بوونەوە لەسەر خوا و لێبوردن لەگوناه بۆ کەسانێکی ئەوتۆیە خراپە بکەن بەنەزان و نەفامی بەواز هێنان لەڕانموبی بۆ لای گومڕایی .

﴿ ثُمَ يَتوبونَ مِنْ قَريبٍ فأوئِكَ يَتوبُ اللّٰهُ عَلَيهِمْ ﴾ لەپاشا ئەوکەسانە پەشیمان ئەبنەوە لەکاتێکی نزیکا و بەر لەمردنیان و ژیانی ئەمڕۆیان هەرچەندە دوور بێ هەر نزیکە ، دوایی ئەو کەسانە خوا پەشیمان بونەوەیان لێ وەرئەرگرێ و لەوان ئەبورێ ، بەمەرجێ لەڕاستیدا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا .

پرسیار / بەگوێرەی دەرکەوتووی مانای ئەو ئایەتە پێویستە لەسەر خوا پەشیمان بونەوە وەربگرێ لەوانە پەشیمان ئەبنەوە ، هیچ شتێ لەسەر خوا پێویست نی یە ؟

وەڵام / مەبەست ئەوەنی‌یە هیچ کەسێ شتێ پێویست بکا لەسەر خوا ، بەڵکو مەبەست ئەمەیە : خوا بەگەورەیی و بەخشندەیی خۆی وەرگرتنی پەشیمان بوونەوەی لەسەر خۆی پێویست کردووە و بەڵێنی داوە لەوان ببورێ ، پێچەوانەی بەڵێنی خوا ناچێتە ئەقڵەوە .

﴿ وَكان اللهُ عَليماً حَليماً ﴾ وەخوا ئەزانێ بەپەشیمان بوونەوەی ڕاستی و پەشیمان بوونەوەی پوچ ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ بەتایبەتی وەرگرتنی پەشیمان بونەوەی گوناهباران.

﴿ وَلَيسَتْ التوبة لِلذينَ يَعمَلونَ السيئات حتى إذا حَضَرَ أَحَدهُمُ الموت﴾ وەپەشیمان بونەوە بۆکەسانێکی ئەوتۆ نی‌یە چەندین خراپەئەکەن بەبەردەوامی هەتا ئەگا بەیەکێ لەوان مردن و لەسەرەمەرگدان و گیانیان نزیکە بکێشن .

﴿ قالَ إني تُبتُ الآن﴾ ئەو یەکە ئەڵێ : بەڕاستی ئێستا من پەشیمان ئەبمەوە لەگوناهەکانم . ئەو پەشیمان بونەوەیە وەرناگیرێ لەو کاتەدا ، چونکە دەستی لەهەموو لایە بڕاوە و چاری نەماوە .

﴿ وَلا الذين يَموتونَ وَهُمْ كفار أولئِكَ اعتدنا لَهُمْ عَذاباً أليماً ﴾ وەپەشیمان بونەوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ نیە بمرن و ئەوان بێ باوەڕبن و بەردەوامبن لەسەر بی باوەڕی هەتا کاتێ ئەمرن . ئەو کەسانە ئێمە ئامادەمان کردووە بۆیان سزایەکی خاوەن ئازار لەڕۆژی دواییدا.

بەر لەهاتنی ئاینی ئیسلام ئەگەر کەسێ بمردایە و ژنی ببوایە ئەو ژنە بەمیرات دائەنرا ، دوایی کوڕی ئەو مردووە لەژنێ تری ، یا خزمی ئەو پیاوە کراسی خۆیانیان ئەخستە سەر ژنەکەی . لەپاشا ئەگەر بیان ویستایە ئەو ژنە مارەبکەن بۆ خۆیان ئەیان کرد ، یا ئەوژنەیان ئەدا بەکەسێ تر و مارەییەکەیان ئەخوارد ، ئەو کارە نارەوایە هەروەك خۆی مایەوە هەتا ئەبولقەیسی کوڕی ئەلئەسلەت مرد ، کوڕەکەی کراسەکەی خۆی خستە سەر باوەژنەکەی کەچی وازی لێ هێنا و بەخێوی نەئەکرد ، بۆیە ئەو ژنە چوە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەو ڕوداوەی گێڕایەوە بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، خوا پەیامی ناردە سەر پێغەمەر و فەرمووی:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُواْ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾

﴿ يا أيها الذين آمنوا لا يحل لكم أن تَرِثـوا النسـاء كُرهـاً ﴾ ئـەی کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕتان هێناوە ڕەوانی‌یە بۆ ئێوە ژنانی مردوەکانتان بکەن بـەمیرات بەوێنـەی دارایـی تـر بەزۆر و بەبێ بێ‌خۆشبونی ئەوان ، هەرچەندە لایان خۆشبی هەر دروسـت نی‌یـە کردنیـان بەمیرات.

هەندێ لەزانایان مانای ئەو ڕستەیەیان بەم جۆرە کردووە : ڕەوا نی‌یە بۆ ئێوە بکەن بەمیرات دارایی ژنان بۆخۆتان بەزۆر ، ئەو مانایە لەوەوە هاتووە ژنان خاون دارایی بوون ، براکانیان یا میراتبەرانی تر نەیان ئەهێلاّ شوبکەن و بەتەمای دارایی ئەوان ئەبون ، بەلایانەوە وابوو ئەگەر شوبکەن داراییەکانیان ئەبێ بەمیراتی مێرد و منالەکانیان ، بۆیە ئیسلام فەرمانی دا بەسەربەستی ژنان بۆ شوو کردنی خۆیان . هەرکام لەو دوومانایە بێ یا هەردوکیان بی خراپەیان تێدا نی‌یە ، دژی ناوەرۆکی هەردوو ماناکە قەدەغە و ناڕەوایە .

﴿ وَلا تعضلوهن لتذهبوا به ببعض ما أتيتموهن﴾ وەئێوە تەنگ هەڵمەچنن لەژنان و ئازاریان بدەن بۆ ئەوەی مارەییەکانیان ببەخشن بەئێوە یا بەنیازی ئەوەی تەلاّقیان بدەن لەسەر پارەیە و ئێوە وەری بگرن لەوان ، یا بۆ ئەوەی ئێوە وەربگرن لەوان هەندێ لەو شتەی ئێوە داوتانە بەوان . ئەوانەی باسکران قەدەغەن و ژنان خۆیان سەربەستن لەدەستکاری کردنی سامانی خۆیان .

﴿ إلاّ أن يأتين بفاحشةٍ مبتيةٍ ﴾ مەگەر ئەوژنانە بەڕوونی و بەئاشکرا کارێکی بێز لێکراو بکەن ، جۆری ئەو کارە خراپەیە ڕوون نەکراوەتەوە ، زانایان هەندێکیان ئەڵێن ئەو کارە بریتیە لەوە ئەو ژنانە بێ فەرمانی مێردەکانیان بکەن و ڕەوشتیان چاك نەبێ و ئازاری مێردەکانیان بدەن ، هەندێ تریان ئەڵێن : لەدواێن پیسی ، هەندێ تریان لایان وایە بریتی‌یە لەهەموو کارێ بەگوێرەی یاسا ناڕەوابێ لەو کاتانەدا مێردەکانیان بۆیان هەیە ژنەکان ناچار بکەن هەتا هەموو ئەو شتانەی مێردەکانیان داویانە بەوان وەری بگرنەوە . بەلاّم بیرو بۆچوونی هەندێ لەزانایان وایە مێردەکانیان بۆیان نیە بە جگەی داوێن پیسی ژنەکان ناچار بکەن ئەگەر وانەبێ پەیڕەوی ژیان تێك ئەچێ .

ئەوەی شایانی باسبێ دادوەر بۆی دروست نی‌یە فەرمان بدا بەلابردنی مارەیی ژنێ دەرکەوتبێ داوێن پیسی کردووە ، چونکە ئەو کارە پەیوەندی بەمێردەوە هەیە بەتەنها .

هەندێ لەپیاوان بەجۆرێ یاسا بۆی دیاری کردوون لەگەڵ ژنەکانیانا ڕانابوێرن ، خوا فەرمووی :

﴿ وَعاشِروهنَّ بالمعروف ﴾ وەئێوە ڕابوێرن و بژین لەگەڵ ژناندا بەجۆرێ ناسراوە و دیاری کراوە لەلایەن یاساوە ، دادپەروەربن لەخەوتنی شەوانە لەگەڵیان و بەخێو کردنیان و گفتوگۆی شیرین لەگەڵیان ، ژنان چۆنن لەگەڵ ئێوە ئێوەش لەگەڵ ئەوان وابن .

﴿ فإنْ کَرهتموهنَّ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە ژنەکانتان خۆش نەئەویست و هاوڕێیەتی ئاوانتان پێ چاك نەبوو ئەتان ویست لەوان جیا ببنەوە لەبەر هەر هۆیە بێ ، بۆئێوە واچاکە ئارام بگرن

﴿ فَعَسی أنْ تَکرهوا شیئاً وَیَجعَل اللهُ فیه خیراً کَثیراً ﴾ دوایی شایانە و لەوانەیە کەئێوە شتێکتان پی ناخۆشە ، وك تێکەڵاوی هاوڕێیەتی ژنێ ، خوا ئەگێڕێ لەو شتەدا چاکەی زۆر ، نزیکە لەوژنە منالێکی زانا و بەسوود بۆئێوە و بۆ گەل و نیشتمان لەو ژنە پەیدا ببێ، بەو بۆنەوە خۆشەویستی لەنێوانتانا زیا دببێ و خوای مەزن پاداشتی ئارام گرتنەکەتان ئەداتەوە .

مرۆڤ نابێ پەلە بکا لەکاری ڕۆژانەی خۆی و خوای مەزن فەرمانی داوە بەئارام گرتن، ئەبی بزانرێ زۆر جاران پیاو ژنی خۆی تەڵاق ئەدا و ئارام ناگرێ ، لەپاشە ڕۆژ بیر ناکاتەوە ئەو ژنەیش بی تاوانە جگە لەوە ئەو پیاوە لەبەرچەند هۆیەکی نەگونجا و ئەو کارە ئەکا و ئەچێ ژنێ تر ئەخوازێ کەچی ئەم ژنە لەوەی پێشوو زۆر خراپترە و کاری ناڕەوای زۆرتر ئەکا ، لەداوییدا پەشیمان ئەبێتەوە بەڵام لەدوای چی .

زۆرجاران دیومانە زۆرکەس خاوەنی خواردەمەنی ڕۆژێ نیە ، ئەبێ بەبار بەسەر جگەی خۆیەوە ، کارێکی بۆ پەیدا ئەبێ خۆی بژێنێ و ڕزگاری ببی لەبۆڵەی جگەی خۆی ، دوایی واز لەو کارە ئەهێنێ بەبیانوی ئەوە ئەو کارە شایستەی ئەونیە و ئەیەوێ کار و پلەی بەرزتری دەست کەوێ ، خوا گیرۆدەی کارێکی خراپتری ئەکا بۆ تەمێ دانانی ، سزای خۆ بەبەرز دانانی ئەدا و توشی خەفەت ئەبێ کەئەوکارەی نەکردووە .

هەروەها دیومانە هەڵگری بەڵێن نامەی بەرز ڕازی ئەبێ بەکارێ بۆی ئەلوێ بەئاسانی بەنوسەری یا کەمتر ، چاوەڕوانی هەلێ ئەکا و پشت بەخوا ئەبەستێ ، زۆری پێناچێ وورده وورده بەرز ئەبێتەوە بۆ لای بلند ترین پلە و پایە .

دوای ئەوەی خوا هانی پیاوانی دا کە کردەوەیان چاکبێ لەگەڵ ژنان . هەندێ کەس پەیدا بوبون ئەیان ویست ژنێ تر بخوازن ، دەستیان کرد بەبوختان کردن بەژنەکانیانا بۆ ئەوەی ئەو ژنە ستەم لێکراوە ناچاربێ ئەو سامان و مارەییەی دراوە بەو بیداتەوە بەمێردەکەی و ئەویش دەستی لێ هەڵگرێ . خوای مەزن بۆ قەدەغە کردنی ئەو کارە فەرمووی :

﴿ وَإِنْ أَرَدتُّمْ استبدال زوج مكان زوج ﴾ وەئەگەر ئێوە ویستتان بەهۆی خۆش نەویستنی ژنەکانتانەوە ، بێ ئەوەی ئەو ژنانە داوێن پیسی و شتی خراپیان لێ ببینرێ دابنێن ژنێ تر لەجێگەی ئەو ژنانەی هەتانە و تەڵاقیان بدەن بۆ ئەوەی ژنێ تری تازە بخوازن.

﴿ وآتيتم إحداهُنَّ قنطاراً فلا تأخذونه منه شيئاً ﴾ وەئێوە بەخشیبوتان بەیەکێ لەو ژنانە ئەتانەوێ تەڵاقیان بدەن دارایی و مارەیی زۆر گەورە ، دوایی ئێوە وەرمەگرنەوە لەو مارەییە زۆرە هیچ شتێ ، زانایان بۆ دیاری کردنی مانای (قنطار) بیریان بۆ (١٠) مانا کردۆتەوە .

﴿ أتأخذونه بهتاناً وإثما مبنياً ﴾ ئایا ئێوە وەرئەگرن ئەو شتە بەزۆرو بەدرۆ و بوختان و ستەم کردن و بەگوناهێکی ئاشکرا و ڕوون . بەڕاستی نابێ ئەو کارە ناڕەوایە بکەن .

زانایان لایان وایە ئە و ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە دروستە دانانی مارەیی زۆر و گەورە بۆ ژنان ، جارێ عومەری کوڕی خەتاب ویستی ئەندازەی مارەیی ژنان دیاری بکا ژنێ لەعومەر ڕاپەڕی و ووتی : ئەو کارە بەدەستی تۆ نی‌یە و خوا دیاری کردووە و پەیوەندی بەژنانەوە هەیە .

﴿ وكيف تأخذونه وقد أفضى بعضكم إلى بعض ﴾ وەئێوە بەچ بەڵگەیە وەرئەگرن ئەوشتە و ، بەڕاستی ئێوە هەندێکتان گەیشتونەتە لای هەندێ ترتان و ژن و مێردتان لەگەڵ یەکتری کردوە ، بەدەیان گفتوگۆی جۆراوجۆر لەنێوانتانا ڕوی داوە، چاکەی زۆرتان لەگەڵ یەکتری کردوە ، جێگەی سەرسوڕمانە ئەو کارە ئەکەن و نابێ بیکەن .

﴿ وَأَخذنَ مِنكُمْ ميثاقاً غَليظاً ﴾ وەئەوژنانە وەریان گرتووە لەئێوە پەیمانێکی زۆر بـەهێز و توند کەمافی هاوڕێیەتی و تێکەڵاویە و لەلاتانبن بـەگوێرەی یاسـای قورئـان و خراپـەیان لەگەڵ نەکـەن ، ژن و مێردایـەتی گۆڕینـەوەی گیـان بـەگیان و بەسـتنی خۆشەویسـتی و بەزەییە لەنێوان ژن و مێردا ، لەش و دارایی ژنان سـامانی خۆیانـە پـەیوەندیان بەپیاوانـەوە نی‌یە .

پاش ئەوەی خوای مەزن باسی چۆنێتی ژیان و گوزەران و هەڵسانی لەگەڵ ژنـان کـرد ئێستایش دەست ئەکرێ بەڕوون کردنەوەی ئەو ژنانە قەدەغەیــە مارەکردنیـان و ئەوانـەی ڕەوایە مارەکردنیان و ئەفەرموێ:

وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ

فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾

﴿ ولا تنكحوا ما نكح آباؤكم من النساء إلا مـا قـد سـلف ﴾ وەئێـوە مـارە مەکـەن کەسێ مارەی کردووە باوکەکانتان لەژنان ، چونکە ئەو ژنانە وەك دایکـی ئێـوەن مەگـەر ژنێ ڕابوردبێ و ئێوە مارەتان کردون بۆ ئەوانە چاوپۆشیتان لێ ئەکرێ و سزاتان نادرێ .

﴿ إنهُ كانَ فاحِشةً ومقتًا وسا سبيلاً ﴾ بەڕاسـتی مـارەکردنی ژنـی باوکتـان کـارێکی بێزلێکراوەیەو نارەوایە ، لەهیچ ئاینێکا ڕەوانەبووە ، ئەبێتە جێگەی خەشمی خوا و ، خراپ ڕێگەیەکە ئەو کارە . ئەو ئایەتە قەدەغەی کردووە مارەکردنی مارەبڕاوی ژنـی بـاوك ئیتر چوبێتە لای یان نە ، بەڵام لای حەنەفیـەکان پیـاوێ داوێـن پیسـی کردبـی لەگـەل ژنێکـا قەدەغەیە کوڕی ئەو پیاوە ئەو ژنە مارە بکا .

﴿ حرمت عليكم أمهاتكم وبناتكم وأخواتكم ﴾ قەدەغە کراوە لەسەر ئێوە مـارەکردنی دایکانی خۆتان ، دایکی دایك و دایکی باوك وەك دایکی خۆتان وان لەقەدەغەکردندا و ، قەدەغە کراوە مارە کردنی کچانی خۆتان ، کچی کوڕ و کچی کچ وێنـەی کچـی پشـتی خۆتان وانە لەقەدەغەکردندا و ، قەدەغەیە مارەکردنی خوشکانی خۆتان ، خوشکی باوك و دایکی بن یا باوکی یا دایکی .

﴿ وعماتكم وخالاتكم ﴾ وەقەدەغەکراوە خوشکانی باوکتان ، خوشـکی بـاوکی بـاوك وەك خوشکی باوك وان لەقەدەغە کردندا و ، قەدەغەکراوە خوشکانی دایـك ، خوشـکی دایکی دایك وەك خوشکی دایك وان .

﴿ وبنات الأخ وبنات الأخت ﴾ وەقەدەغەکراوە مـارەکردنی کچـانی بـرای دایـك و باوکی و برای باوکی و برای دایکی ، کچی کچی براکان وێنەی کچانی بران و ، قەدەغە کراوە مارەکردنی کچانی خوشکی باوك و دایکی و خوشکی باوکی و خوشکی دایکـی ، کچی کچی خوشك و کچی کوڕی خوشك قەدەغەن بەوێنەی کچی خوشك .

﴿ وأمهاتكم اللاتي أرضعنكم وأخواتكم من الرضاعة ﴾ وەقەدەغە کراوە لـەئێوە مـارە کردنی دایکەکانتان ئەوانەی ئەوتۆ شیریان داوە پێتان ، هـەرژنێ بـەهۆی پشـتەوە قەدەغـە کرابێ بەهۆی شیریشەوە قەدەغە کراوە و ، قەدەغە کـراوە خوشـکەکانی ئێـوە لـە لایـەن شیرەوە ، نەنکی شیری و خوشکەزای شیری بەوێنەی دایکەکانیان قەدەغەن .

بـۆ قەدەغـە کردنـی ژنـان پێویسـتە ئـەم دوو مەرجانـە بێنـەدی : لای شـافعیەکان و حەنبەلیـەکان پێویسـتە ئـەو شـیردانە لـەپێنج جـار کـەمتر نـەبێ ، لای حەنەفیـیـەکان و مالیکەکان شیردان کەمبێ یا زۆر ئەبێتە هۆی قەدەغەکردنی ، مەرجێ تر ئەمەیە ئـەو منالـە تەمەنی نەگەیشتبێتە دوو ساڵان.

﴿ وأمهات نسائكم ﴾ وەقەدەغە کراوە دایکـانی ژنـەکانتان ، نـەنکی ژنـەکانتان وەك دایکی ژنەکانتان قەدەغەیە مارەکردنیان. بەمارەبڕینی ژنەکانتان دایکی ژنەکانتان قەدەغەیـە ئیتر ژن و مێردیتان لەگەڵ کردبن یان نە ؟

﴿ وربائبكم اللاتي في حجوركم من نسـائكم اللاتـي دخلتـم بـهن ﴾ وەقەدەغـەکراون کچانی ژنەکانتان لە مێردێ تریان ئەو کچانەی ئـەوتۆ لـەژێر چـاودێری و بـەخێوەکردنی ئێوەدان لەو ژنانەی ئەوتۆی ئێوە ژن و مێردیتان لەگەڵ کردبن .

قەدەغەکردنی ئەو کچانە مەرج نیە هەر بەخێو کراوەکانی ئێـوە بـن ، بەڵکوئەوانـەیش ئێوە بەخێوتان نەکردبن هەرقەدەغەن ، بەڵام بەزۆری ئێوە بەخێویان ئەکەن بۆیـە هەرباسـی ئەوان کراوە .

﴿ فإن لم تكونوا دخلتم بهن فلا جناح عليكم ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە بەو جۆرە نەچوبونـە لای دایکی ژنەکانتان و ژن و مێردیتان لەگەڵ نەکردبوون دوایی مارەی بڕینیـان ، دوایـی

هیچ گوناهێ لەسەر ئێوە نیە بۆ مارە بڕینی ئەو کچانە بەمەرجێ دایکەکانیان بەیەکجاری تەلاق بدرێن یا بمرن بەر لەوەی ئێوە بچنە لایان ، لای شافعیەکان و حەنبەلیەکان بەدەست لێدان و ماچ کردنی ژنەکانتان قەدەغە نابن ، بەلاّم لای حەنەفیەکان و مالیکەکان ئەوانە ئەگەر بەئارەزوی ژن و مێردی بێ کچەکانیان قەدەغە ئەکەن بەوێنەی چوونە لایان .

﴿ وحلائل أبنائكم الذين من أصلابكم ﴾ وەقەدەغە کراون ژنانی کوڕانی ئێوە ئەو کوڕانەی ئەوتۆ لەپشتی ئێوە پەیدا بوون ، نەك ئەوانەی جگەی کوڕی خۆتان و بیان کەن بەکوڕی خۆتان ، ژنی کوڕی شیری وەك ژنی کوڕی پشتی قەدەغەیە .

﴿ وان تجمعوا بين الأختين إلا ماقد سلف ﴾ وەقەدەغەکراوە کە ئێوە دوو خوشك بەیەکەوە کۆبکەنەوە لەژنێتیدا لەیەك کاتا ، بەلام ئەگەر یەکێکیانتان تەلاّق دا بەیەکجاری یا مرد ئێوە بۆتان ڕەوایە خوشکەکانیان مارە بکەن .

شافعیەکان لایان وایە ژنێ تەلاّق درا بەتەلاّقی رەجعی بۆ ئەوکەسە دروست نیە خوشکی ئەو ژنە بهێنێ هەتا عیدەکەی تەواو نەبێ ، ئەگەر بەبائینە تەلاّقی دا دروستە خوشکی ئەو ژنمارە بکا لەکاتی عیدەدا چونکە تەلاّقی بائیتە کۆتایی بەژن و مێردی ئەهێنێ . بەلاّم لای مەزهەبەکانی تر ئەبێ کۆتایی بەعیدە بهێنن بەبێ جیاوازی لەنێوان تەلاّقی رەجعی و بائیتە .

بۆ زانین : هەموو زانایانی ئیسلام پێك هاتوون لەسەر ئەوەی چوونە لای ژنێ بەگومانی ئەوە کەژنی ڕەوای خۆیە بەوێنەی مارەکردنی ڕاستی دائەنرێ ، کەواتە دایك و کچ و ئەو ژنانەی تر قەدەغە کرابون لەمارەکردنی ڕاستیدا قەدەغە ئەکرێن .

﴿ إن الله كان غفوراً رحيماً ﴾ بەڕاستی خوا لێبوردن و بەزەیی زۆرە .

**کۆتایی بەنوسینی جزمی چوارەم هات بە ١١ / ١٠ / ١٩٩٨ ی زاینی**

**بەرانبەر بە ساڵی (١٤١٩) ی کۆچی .**

**تەفسیری زمناکۆیی**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

**سوپاسی بێپایان بۆ خوای هەموو بونەوەران .**

**درودی بێژمارە لەسەر پێغەمەر و یار و یاوەرانی**

خوای مەزن قەدەغە کردنی مارە برینی ئەو ژنانە خاوەنی مێردن بەر لەتەلاقدانیان و کۆتایی عیدەکانیان ڕون کردەوە. بەلاَم ئەو ژنانەی لەجەنگی بێ باوەڕاندا بەدیل ئەگیرێن ، ئەوانەیشیان خاوەنی مێردبن بەدیل کردنیان نیکاحی مێردە بێ باوەڕەکانیان پوچ ئەبێتەوە ، دوایی بەکارەکەر کردنیان و کڕینیان دوای شۆردنی یەك حەیز دروستە ژن و مێردیان لەگەڵ بکری ، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ :

وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ ۚ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾ وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ

بَعْضٍ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ



﴿ والمحصنات من النساء ﴾ وەقەدەغە کراون مارەکردنی ئەو ژنانە سەربەستن و خاونی مێردن و پارێزراون لەداوێن پیسی بەهۆی مێردەکانیانەوە ، هەروەك ئەوەی مێردەکانیان پارێزراون لە لەداوێن پیسی بەهۆی ژنەکانیانەوە .

﴿ إلا ماملکت أیمانکم ﴾ مەگەر ژنێ بەدیل گیرابێ و کرابێ بەتالانی و مێردی هەبێ مێردەکەی باوەڕی نەهێنابێ و بکرێ بەدارایی بۆ ئێوە ، ئەو ژنە مارەکردنی قەدەغەنیە بامێردەکانیان مابن ، چونکە ئەو ژنە بەدیل کردنەکەی پەیوەندی ژن و مێردی لەنێوان خۆی و مێردەکەی هەڵئەگیرێ ، بەلام ئەبێ ژن و مێردی لەگەڵ نەکرێ هەتا حەیزێ ئەشۆری ، ئەگەر سکی هەبوو نابێ بچیتە لای هەتا منالەکەی ئەبێ ، ئەگەر ئەو ژنە دیل کراوە هەرگیز حەیزی پێدا نەهاتبوو یا لەحەیز وەستابوو پێویستە مانگێ سەرجەم چاوەڕوان بکرێ ئەنجا بچنە لای ، حەنەفیەکان لایان وایە ژن و مێرد بەیەکەوە دیل کران پەیوەندیان لەیەك ناپچڕێ و بەردەوامە نابی خاوەنەکانیان بچنەلایان بەڵام لای شافعیەکان و مالیکەکان ژن و مێردیان ئەپچڕێ .

موسوڵمان ئەبێ خاوەنی ژن بەدوو هۆ ، یانێ ژنانێ سەربەست نەبن :

١- کاتێ جەنگی ئایینی پەیدا ببی لەنێوان موسوڵمانان و بێ باوەڕاندا و موسوڵمانان سەرکەوتن ئەوکاتە بێ باوەڕان بەژنیان و منالّ و داراییان ئەبن بەتالاّنی بۆ موسوڵمانان، ژنی بێ باوەڕان بەدیل کردن لەمێردەکانیان جیا ئەبنەوە بەلای هەموو زانایانەوە .. ئەو فەرمانە جێبەجی کراوە لەجەنگەکانی پێشوی ئیسلامدا ، لەبەر گەڕانەوە لەبێ باوەڕی و هاندانیان بۆ ئیسلام بوون . بەلام ئەوەی شایانبی هەر لەبەر پەرستنەو، خوا خۆی ئەزانێ بەسودی ئەوکارە.

٢- موسوڵمان ئەبێ بە خاوەنی ژن بەکڕینی کارەکەرێ ، دوایی مارەی بکا لە کەسێ. دوای مارەکردنی بفرۆشرێ بەکەسێ تر بەلای ئیبنومەسعودەوە بەوفرۆشتنە لەمێردەکەی جیا ئەبێتەوە وەمارەکردنەکە پوچ ئەبێتەوە ئەو کەسەی ئەی کڕێ بۆی هەیە بچێتە لای ئەو کارەکەرە پاش یەك حەیز

﴿ کتاب الله علیکم ﴾ قەدەغەکردنی ئەو ژنانە سەربەستن و خاونی مێردن و قەدەغەکردنی ئەو تاقمە ژنانەیش لەئایەتی (٢٢) و (٢٣) سورەتی نیساء دا لەکۆتایی جزمی چواردەمدا خوا پێویستی کردووە بەپێویست کردن .

﴿ واحل لکم ماوراء ذلکم ﴾ وەڕەوا کراوە بۆ ئێوە ژنێ جگەی ئەو ژنانە باسکران کە قەدەغەن مارەکردنیان ، بەومەرجەی مارە بېڕێن بەگوێرەی یاسای دیاری کراو ، مارەیەکەیان بدرێتێ بەرانبەر بەو مارەکردنە نەك بەکرێ لەسەر داوێن پیسی وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ ان تبتغوا باموالکم محصنین غیر مُسَافِحِینَ ﴾ کەئێوە داوایان بکەن و مارەیان بکەن بەگوێرەی یاسا و بەدارایی خۆتان و بیکەن بەمارەیی بۆیان بەجۆرێ مارەیان بکەن بەداوێن پاکی بی جگەی داوێن پیستان ، ئیتر ئەو ژنانە سەربەستبن یا بەندەبن و خاون مێرد نەبن ، ئەگەر خاوەن مێرد بوون نابێ بچنە لایان بەدەستوری مێردە کانیان و بەخۆشی ئەوان بەگوێرەی نەریتی بەر لەئیسلام هەتا منالّەکەی ڕەسەنبێ .

تەفسیری زمناکۆیی

بۆ زانین : ژنێ سێ بەسێ تەڵاق درابێ قەدەغەیە ئەو مێردەی مارەی بکاتەوە هەتا مێردێ تر نەکا پاش تەواو بوونی عیدەی مێردە تەلاق دەرەکەی ، دوایی مێردەکەی تەلاقی بدا و عیدە کۆتایی پێ بێ ئینجا مێردی پێشووی مارەی بکاتەوە . ئەم ژنانەیش قەدەغەن مارە بکرێن .

١- ژنێ لەعیدەی پیاوێکا بێ قەدەغەیە مارەکردنی هەتا عیدەکەی کۆتایی پێ نەیە .

٢- ئەگەر یەکێ لەو ژنانەی قەدەغەن مارەبکرێن تێکەڵاو بەژمارەیەکی دیاری کراو لەژنانی تر بوو ، بۆ نمونە : کچی پیاوی تێکەڵاوی بیست ژن بوو قەدەغەیە مارە کردنی هەموو ئەو ژنانە هەتا ڕوون نەبێتەوە ئەو کچە کامیانە .

٣- ئەو ژنانە مارە ئەکرێن بە (نکاح الشغاو ) قەدەغەن و مارە بڕینەکەیان پووچە ، وەك ئەوەی پیاوێ بڵێ بەمرۆڤێ تر : من مارەم کرد لەتۆ کچەکەی خۆم لەسەر ئەوەی تۆیش کچەکەی خۆتم لێ مارە بکەی و کچێتی هەریەکەیان مارەیی ئەوی تریان بێ .

٤- ژنێ لەئاینی ئیسلام وەرگەڕێ قەدەغەیە مارەکردنی هەتا نەگەڕێتەوە بۆ لای ئاینی ئیسلام .

٥- ئەو ژنانەیش بۆ ماوەیە مارە بکرێن قەدەغەن ، وەك ببێژرێ ئەو کچەی خۆمم لێ مارە کردی بۆ ماوەی ساڵێ یا مانگێ.

٦- ئەو ژنانەو ئەو پیاوانە ئیحرامیان بەحەج بەستبی لەو کاتەدا مارەکردن و ژن هێنان قەدەغەن و پوچە.

٧- ئەو ژنانە گومانیان لێ پەیدا بکرێ ئایا سکیان هەیە یان نە ؟ قەدەغەیە مارە کردنیان هەتا ڕاستی دەرئەکەوێ .

٨- ژنانی بێ باوەڕان لەجگەی خاوەن نامەکان قەدەغەیە مارەکردنیان بەوێنەی ئەو ژنانەی بت پەرستن .

﴿ فما أستمتعتم به منهن فاتوهنَّ أجورهنّ فريضــةً ﴾ دوایی ژنێ ئێوە ڕاتانبواردووە لەگەڵی دوای مارەبڕینی لەو ژنانەی ڕەوایە مارەکردنیان ، دوای بیبەخشن بەو ژنانە

کەمارەییەکانیان ، مافێکە پێویست کراوە لەلایەن خواوە نەك ئێوە وابزانن چاکەیان لەگەڵ ئەکەن و پێویست نی‌یە .

﴿ ولا جناحَ عَلَيكُمْ فيما تَراضَيْتُمْ بـه مـن بعـد الفريضـة ﴾ وەهیـچ گوناهـێ لەسـەر ئێوەنی‌یە لەشتێکا ئێوە لەنێو خۆتانا ڕازی ئەبن بەو شتە لەدوای پێویست کردنی مارەییەکە و لەدوای مارەبڕینی ژنەکان ، یانی هەرکاتێ مارەبڕینی ژن لەسەر مارەییەکی دیاری کـراو بوو لەکاتی مارەبڕینەکەدا ئەو مارەییە مافێکی پێویست کراوە بۆ ئەو ژنە و ئەتوانێ دەست کاری بکا لەوەو دوا بەهەر جۆرێ خۆی بیەوێ ، بەڵام دوایی قەدەغـە نی‌یـە ژن و مـێرد لەنێو خۆیانا پێك بێن لەسەر واز هێنانی هەموو مارەییەکە یاهـەندێکی یـا زۆرتـری بکـەن لەئەندازەی دیارکراو ، هەروەك قەدەغە نی‌یـە ڕازی بـبن لەسـەر جـۆری خواردەمـەنی و بەخێو کردن و ئەندازەی یارێك بکەون لەسەر تەلاقدان .

﴿ إن الله كان عليماً حكيماً ﴾ بەڕاستی خـوا ئـەزانێ بەهـەموو شـتێ بـەر لەدروسـت کردنیان ، هەموو شتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ کەپێویستی کـردوە مـارە بڕیـن بـۆ پاراستنی بنەماڵە .

بۆ زانین : شیعە ئیمامیەکان ئەو ئایەتەی پێشویان کردوە بەبەڵگە لەسەر دروست بوونی موتعە (زواج المتعه ) ، بۆیە پێویستە بزانین (زواج المتعه ) چۆنە . بەڵگـە لەسـەر دروسـت نەبونی چ شتێکە ، بەڵگەی ئیمامیەکان چ شتێکە بۆ دروستبونی؟

(زواج المتعه ) ئەمەیە : پیاوێ ژنێ مارە ئەکا بەم ڕستانە و بەو ژنە ئەڵێ : من ڕائـەبوێرم لەگەڵ تۆ بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ یا مانگێ یا سـاڵێ ، یـا بـەماوەی دانیشـتنم لـەم شـارە ، ژنەکە ئەڵێ : قبوڵم کرد . دوای کۆتایی پێهاتنی ئەو ماوەیە یا نەمانی پیاوەکە لەو شارەدا، مێردەکە لەژنەکە جیا ئەبێتەوە و ژن و مێردی لەنێوانیانا کۆتایی پێ دێ ، وایش ئەبێ ئـەو ماوەیە دیاری ناکرێ .

موسوڵمانان بیروڕایان جیاوازە لەبارەی مارەکردنی موتعە : زۆربەی هاوڕێکانی پێغەمەر و زانایـانی یاسـازانی موسـوڵمانان ئـەڵێن : نیکـاحی موتعـە پوچـە و هیـچ فـەرمانێ

لەفەرمانەکانی ژن و مێردی پەیدانابێ لەسەری و قەدەغەیە ، چونکە بوخاری و موسلیم ووتویانە : پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نیکاحی موتعە و خواردنی گۆشتی گوێ درێژی خۆماڵی قەدەغە کردووە لەڕۆژی گرتنی مەکەیا جەنگی ئەوتاس یا جەنگی خەیبەر ، لەبەر ئەوەی مەبەست لەنیکاحی موتعە جێبەجێ کردنی ئارەزوی دەرونی و ڕابوارەدنی کاتی‌یە ، ئەوەیش دژی مەبەستی مارەکردنی یاسای ئیسلامە کەبەردەوامی نێوان ژن و مێردە و ژیانیان بەیەکەوە و پەیداکردنی بنەماڵەی خێزانی و بەخێو کردنی مناڵانە ، پرسیار کرا لەعەبدوڵای کوڕی عومەر لەبارەی موتعەوە ، فەرموی : موتعە داوێن پیسی و زینایە .

بەڕاستی گێڕاوەتەوە قەدەغەکردنی نیکاحی موتعە لەپێشەوایان ئەبی جەعفەر موحەممەد ئەلباقیر و ئەبی عەبدوڵا جەعفەری سادیق کە دووپێشەوای ئیمامیەکانن ، بەسامی سەیرەفی پرسیاری کرد لەئەبا عەبدوڵا لەبارەی موتعەوە بۆی باس کرد ، فەرمووی : ئەوە زینایە .

لەنامەی ئەلکافیدا هاتووە لەحەسەنی کوڕی یەحیای کوڕی زەید زانا و یاسا زانی عێراقی ئەڵێ : بەڕاستی خانەوادەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پێك هاتوون لە سەر پێناخۆش بوونی موتعە و قەدەغەیان کردووە ، ئەوانیش دوای پێشەوای ڕانموی عەلی کوڕی ئەبو تالیب کەتوون فەرمووی : ناهێنرێتە لای من ئەو ژن و پیاوەی موتعەیان کردبی مەگەر من بەردەبارانیان ئەکەم ، وەك فەرموی بەئیبنو عەباس کاتێ بەو گەیشت فەتوای داوە بەدروست بوونی موتعە : تۆ پیاوێکی سەرگەردانی بەڕاستی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ نیکاحی موتعەی پوچ کردوەتەوە .

بەڕاستی گێڕاویەتی‌یەوە بەیهەقی لە ئیبنوشەهابی زەهریە : کەبەڕاستی ئیبنوعەباس کۆچی دوایی نەکردووە هەتا گەڕاوەتەوە لەو فتوایەی داویتی لەبارەی ڕەوا بوونی موتعە . ئەوانەی ڕابوردن بیرو بۆچوونی زۆربەی زۆری هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و زانایانی یاسا زانی موسوڵمانانە جگەی ئیمامیەکان.

بەڵام شیعە ئیمامیەکان ئەڵێن : نیکاحی موتعە ڕاستە و ڕەوایە ، ناوی ئەبەن بە نیکاحی کاتی ، چونکە قورئان ئەفەرموێ : ﴿ فما أستمتعتم به منهن فاتوهنَّ أجورهنّ فريضةً ﴾ زۆربەی زانایان ئەو بەڵگەیەی ئەوانیان پوچ کردۆتەوە بەمەی ئەو ئایەتە هاتووەتەخوارەوە بۆ ڕوون کردنەوەی نیکاح ، باسی موتعەی هەرگیز تێدا نەکراوە ، چونکە بەر لەوە باسی ئەو ژنانەی کردووە مارەکردنیان قەدەغەیە لەپاشا ئەفەرموێ :﴿ وأحل لكم ما وراء ذلكم أن تبتغوا بأموالكم محصنين غير مسافحين فما استمتعتم به منهن فآتوهن اجورهن ﴾ لەپاشا لەدوای ئەوە ئەفەرموێ : ﴿ ومن لم يستطع مِنكُمْ أن ينكح المحصنات المؤمنات فمّا ملكت أيمانكم من فتيانكم المؤمنات ﴾

هەروەها شیعەکان ئەڵێن : بەڵگە لەسەر ڕەوایی موتعە پێکهاتنی کۆمەڵی موسوڵمانانە بەگشتی ، جگەی ئەویش پێویستی بەموتعە لە ئیسلامدا هەیە لەسەر بونی و کاریشی پی کراوە ، ئەوانەیش لایان وایە ڕەوا بونی نیکاحی موتعە پوچ کراوەتەوە قەدەغە کراوە لەپاش ڕەوا بونی بەڵگەکانیان جیاوازن و هەریەکێکیان بەجۆرێ باسی ئەکەن ، ئەوەیش نابێتە بەڵگەی بێگومان. ئەوپەڕی ئەوەیە ئەکرێ بەبەڵگە لەسەر میرات نەگرتن و تەڵاق نەدان و بەتەواو بونی ماوەکە پێویست بەتەلاق نی‌یە.

بێگومان ئەو بەڵگەیە پوچ کراوەتەوە چونکە داواکەیان بۆ پێك هاتنی موسوڵمانان بەگشتی لەسەر ڕەوابونی موتعە دا نەبەستراوە ، چونکە ئەوکەسانەی پاش پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمویانە بەگشتی نیکاحی موتعە قەدەغەیە ، جگەی ئیبنو عەباس ئەویش پەشیمان بوەتەوە لەفتوای خۆی لەبەرئەوەی پێویستی نەماوە لەئیسلامدا .

بۆ زانین : شیعەکان زۆربەیان نیکاحی موتعە کاری پێناکەن ، زانای بەناوبانگ (جواد مفنیە ) ئەڵێ : شیعەکانی لوبنان و سوریاو عێراق نیکاحی موتعە بەکار ناهێنن هەرچەندە بڕوایان بەڕەوا بوونی هەیە ، دادگای لوبنان دەستوریان نەداوە بەکردنی موتعە لەکاتی پێکهێنانیان هەتا ئەمڕۆ ، بەڵای یاسای مافەکانی خێزانی لوبنانی لەژمارەی (٥٥) دا بڕیاری داوە لەسەر ئەوەی نیکاحی موتعە پوچە و قەدەغەیە .

ژن هێنان بەر لەئاینی ئیسلام بەچوار جۆر بووە بەم شێوانەی خوارەوە :

١- پیاو خوازبێنی ژنی ئەکرد لەخزم و کەس و کاری و مارەیی بـۆ دیـاری ئـەکرا و مارە ئەکرا بەگوێرەی یاسای ئەوکاتە ، یاسای ئیسلام ئەم جۆرەی پەسەند کردووە و بـۆ خۆی هەڵبژاردووە .

٢- پیاو بەر لەئاینی ئیسلام بەژنی خۆی ئەووت بەخۆشیەوە هەر کاتـێ لەحـەیز پـاك بویتەوە بچۆرە لای فلان پیـاو و داوای لێ بکـە بێتـە لات ، پـاش ئـەو کـارە مێردەکـە نەئەچووە لای ژنەکەی هەتا ئاوسی ژنەکەی بۆ دەرئەکـەوت ، دوایـی ئەگـەر ئـارەزوی هەبوایە ئەچووە لای ژنەکەی . ئەو کارە ناپەسەندەیان بۆ یە ئەکرد هـەتامناڵێکی ڕەسـەن و جوان و قۆزی ببوایە .

٣- وایش ئەبوو کەمتر لە (١٠) پیاو ئەچونە لای ژنێ ، ئەگەر ئەو ژنە ئاوس ببوایـە و مناڵێکی ببوایە پاش تێپەڕ بوونی چەند ڕۆژێ بەسـەرمناڵ بونیـا پیاوەکـانی بـانگ ئـەکرد بۆلای خۆی و مناڵەکەی ئەچەسپاند بەسەریەکێ لەو پیاوانەدا ، پیاوەکەیش بەبێ وورتەو چەندو چوون مناڵەکەی وەرئەگرت و بەخێوی ئەکرد بۆ خۆی .

٤- وایش ئەبو ژنێ جێگەیەکی بۆ خۆی دیاری ئەکرد بۆ داوێن پیسـی و بـەیداخێکی هەڵئەکرد ، بەبێ ژمارە پیاوان ئەچونە لای ، کاتێ مناڵی بەو کارە ناڕەایە بۆ پەیدا ببوایـە نیشانی پیاوێکی شێواز ناسی ئەدا ، بەگوێرەی بیرو بۆچونی ئەوپیاوە ئـەو مناڵـە شـێوەی لەهەرکەسێ لەو پیاوانە بچوایە مناڵەکەیان ئەدا بەسەریا ، ئەو کەسەیش مناڵەکەی ئـەبرد بۆ خۆی و ئەبوو بەمناڵی ئەو کەسە .

ئاینی پاکی ئیسلام بەشی یەکەمی هەڵبژاردووە بۆ موسوڵمانان ، چونکە لەداوێن پیسی دوورە ، ئەو سی بەشەکانی تری قەدەغە کردووە و خراوەتە زبڵدانەوە .

هەتا ئێستا باسی ژن هێنانی سەربەستمان کرد ، ئێستایش باسی مارەکردنی ژنـی بـەندە ئەکەین ، ئەگەر توانای مارەکردنی ژنی سەربەسـتی نـەبو ، مەرجـەکانی مـارەکردنی ژنـی بەندە ئەمانەی خوارەوەن :

١- نەتوانێ مارەیی ژنی سەربەست پەیدا بکا لەبەر ئەوەی مارەیی ئەوان زۆر گرانبێ ، مارەیی بەندەکان سووکتر و کەمتر بێ و پێویستە خزمەتی گەورەکەیشی بکا .

٢- ترسی داوێن پیسی هەبێ ، ئەم مەرجانە بیرورای هەڵبژێردراوی کۆمەڵێکە لەهاورێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، وەبیرورای شافیعی و ئەحمەدیشە ، بەڵام لای ئەبوحەنیفە مەرجی یەکەم لای پێویست نی‌یە و مرۆڤی سەربەست و خاوەن سامان ئەتوانێ ژنی بەندە بخوازێ ئەگەر ژنی سەربەستی نەبێ ، لای ئەبوحەنیفە مەرج نی‌یە ئەو بەندەیە باوەڕداربێ، بەڵکو ئەتوانێ بەندەی خاوەن نامە بخوازێ .

ئەو مەرجانە بۆیە پێویستە بۆ مارەکردنی ژنی بەندە لەبەر ئەوەیە هەرمناڵێ لەو ژنە بەندەیە پەیدا ببێ ئەبێ بەبەندەی خاوەنی‌دایکەکەی ، خوای مەزن بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە فەرمویەتی :

﴿ و من لم یستطع منکم طولاً أن یَنکِحَ المُحصنات المؤمنات ﴾ وەهەرکەسێ لەئێوە توانای سامانێکی وای نەبو مارە بکا ژنانی سەربەستی باوەڕدار .

﴿ فمن ما ملکت أیمانکم من فتیاتکم المؤمنات ﴾ دوایی مارە بکا ژنێ لەو ژنانە دارایی و کارەکەری برای باوەڕداری هاو ئاینی خۆتانن لەژنە لاوە باوەڕدار و کارەکەرەکانی خۆیان .

﴿ والله أعلم بایمانکم بعضکم من بعضٍ ﴾ وەخوا زاناترە لەهەموو کەسێ بەئایین و باوڕهێنانی ئێوە و کام لاتان لەئێوەی سەربەست و لەبەندەکان باوەڕتان بەهێزترە ، زۆر جاران ژنێکی بەندە باوەڕی بەهێزترە لەباوەڕی ژنێکی سەربەست ، ژنی وایش هەیە باوەڕی بەهێزترە لە پیاو ، کەواتە نابێ بێز بکەنەوە لەمارەکردنی ژنانی بەندە هەندێ لەئێوە لەهەندێ ترتان. دروست بوون بەبێ جیاوازی لەنێوان سەربەست و بەندە ، هەموتان لەیەك ڕەگەزن و لەئادەمنو ئادەمیش لەخاکە .

﴿ فانکحوهنَّ بإذنِ أهلِهنَّ ﴾ دوایی ئێوە مارەبکەن ئەو کارەکەرانە بەدەستوری خاوەنەکانیان بەمەرجێ لەیەك کارەکەر زۆرتر مارە نەکەن و ترسی داوێن پیسیتان هەبێ و

باوەڕداربێ وەك لەمەو بەر باسكرا ، بەمەرجێ ئەو پیاوەش یا هەرژنی نەبێ یا ژنی هەبێ و بۆ ژن و مێردی دەست نەدا .

﴿ وأتوهن أجورهن بالمعروف محصنات غير مسافحات ولا متخذات اخدانٍ ﴾ وەئێوە ببەخشن بە خاوەنی كارەكەرەكان مارەییەكانیان ، داوێن پاك بن و داوێن پیس نەبن بەئاشكرایی لەجێگەی دیاری كراودا ، وەلەنهێنیدا دۆستیان بۆ خۆیان وەرنەگرتبێ كاری خراپیان لەگەڵ بكەن ، ئەو كارە خراپانە بەر لە ئیسلام ڕەوشتیان بووە و قەدەغە كراون .

﴿ فإذا أحصن فإن أتين بفاحشةٍ فعليهن نصف ما على المحصنات من العذاب ﴾ دوایی كاتی ئەو كارەكەرانە پارێزران لەداوێن پیسی بەهۆی شوكردنیانەوە ، دوایی ئەو ژنە بەندە كارەكەرە كاری بێزلێكراو و داوێن پیسیان كرد ، دوایی لەسەریانە نیوەی شتێ لەسەر ژنانی سەربەستە لەسزا بەو جۆرە یاسا دیاری كردووە كەبریتیە لەپەنجا دار نەك بەردەباران چونكە نیوەی بەردەباران ناگونجێ ، بەندە كوڕبن یان كچ مێردیان كردبێ یان نە ، هەر پەنجا داریان لێ ئەدرێ .

﴿ ذلك لمن خشي العنت منكم ﴾ ئەو مارەكردنەی كارەكەرەكان لەكاتی بێ دارایی پیاواندا بۆ كەسێكە بترسێ لەداوێن پیسی لەلایەن ئێوە و ئارەزوی ژن و مێردی تەنگی پێ هەڵچنیبێ.

﴿ وأن تصبروا خيرٌ لَكُمْ والله غفورٌ رحيمٌ ﴾ وەئارام گرتنی ئێوە و مارەنەكردنی كارەكەرەكان چاكترە بۆ ئێوە لەبەرئەوەی ئەگەر منالێكتان لەو كارەكەرانە بۆ پەیدا ببێ ئەگەڕێن بەبەندە و خاوەنی دایكەكانیان هەڵیان ئەسوڕێنن لەكاری خۆیانا لەدەروە و لەناوەوە ، بەهەرچۆنێ بێ چاك وایە كارەكەر مارە نەكن . خوا خاوەنی لێ خۆشبوونە بۆ كەسێ ئارام نەگرێ ، میهرەبانە بۆ كەسانێ دەستوری پێدراوە كارەكەر بخوازێ .

پاش ئەوەی خوای مەزن ڕوونی كردەوە ئەو ژنانەی قەدەغەن مارەكردنیان و ئەوانەی ڕەوان ڕونیشی ئەكاتەوە كە ئەوانە هەمویان بۆ سودی ئادەمیزاد و بەرژەوەندیانە و ئەفەرموێ :

يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾

﴿ يريد الله ليبين لكم ويهديكم سنن الذين من قبلكم ﴾ خوا ئەیەوێ ڕونی بکاتەوە بۆ ئێوە ئەو شتانەی ڕەوان و ئەوانەی قەدەغەن و ئەوشتانەی پەنهانن لەئێوە ئەوانە خاوەنی سودن بۆتان لەکردەوە بەرزەکانتان و ، خوا ئەیەوێ ڕانموویی ئێوە بکا و شارەزای پرۆگرام و دەستوری کەسانێکی ئەوتۆتان بکا لەپێش ئێوەوە بوون لەخاوەن شارەزاکان هەتا ئێوە ڕێگەکانیان بگرن بۆ ئەو شتانە ڕەوان و ئەوانەی قەدەغەن هەر لەکاتی ئیسماعیلەوە هەتا سەردەمی ئادەم .

﴿ ويتوب عليكم والله عليم حكيم ﴾ خوا ئەیەوێ یاریدەی‌ئێوە بدا لەسەر پەشیمان بوونەوەتان و لەگوناهەکانتان خۆش بێ و هانتان بدا لەسەر پەشیمان بونەوە ، لابدا لەسەرتان ناکۆکی نێوانتان و ، خوا ئەزانێ بەو شتانەی سوودی ئێوەی تێدایە ، هەموو کارێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ .

﴿ والله يريد أن يتوب عليكم ويريد الذين يتبعون الشهوات أن يميلوا ميلاً عظيماً ﴾ وەخوا ئەیەوێ یاریدەی ئێوە بدا لەسەر پەشیمان بوونەوە ، ئەیەوێ کەسانێکی ئەوتۆ دوای ئارەزوی ناپەسەندەکانی خۆیان کەوتوون کەئێوە لابدەن لەڕاستی و قەدەغەکراوەکان

بەڕەوا دابنێن ، بەلادانێکی زۆر گەورە و بتان خەنە هەڵەوە کەمارەکردنی خوشکی باوکی دروستە .

پرسیار / خوای مەزن لەدوو ئایەتا یەك لەدوای یەك ڕستەی (یتوبوا) ی دووبارە کردۆتەوە سوودی چ شتێکە ؟

وەڵام / یەکەمیان بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو ژنانەیە ڕەوان مارەکردنیان و قەدەغەن بێ ئەوەی خوا فەرمان بدا بەپەشیمان بوونەوەو بیەوێ ، دووهەمیان بۆ ئەوەیە خوا فەرمان بە پەشیمان بونەوە ئەدا و ئەیەوێ بەوازهێنان لەقەدەغەکراوەکان .

ئەو کەسانەی ئەوتۆ پەیڕەوی ئارەزوو هەوەسی خراپی خۆیان ئەکەون کە ئازاد بن لە زنجیرەی یاسای ئاین و ڕەوشتی بەرز ، بەرەڵا بن و بڕۆن لەگەڵ ئارەزوی دەرونی ، بۆ هەرلایە ڕویان پێبکا ئەوانە لەهەمو کاتێکا هەن هەر لەکۆنەوە هەتا ئێستا . هەرچەندە جۆری ئارەزوەکانیان جیاوازبن بەگوێرەی کات و جێگە .

لەم سەردەمەی خولی بیستەمدا بەناوی سەربەستی و گۆڕانکاری و پێش کەوتنەوە لەسنوری ئاینی و مرۆڤایەتی دەرچوون بە هورو رۆژانی ئارەزوو هەوەس لەڕێگەی فلیم و چیرۆکی دەست کرد و بەڕووت بونەوەی ئەندام و جم و جوڵ و سوڕدان ، بێگومان ئەوەیە لادانی گەورە لەڕاستی و کاری پەسەند .

﴿ يريد الله أن يخفف عنكم ﴾ خوا ئەیەوێ کە سوك بکا لەسەر ئێوە فەرماندانەکانی خۆی لەڕەوا کردنی هەندێ لەژنان بۆ ئێوە و بگرە لەهەموو کارێکا لەکاتی ناچاریدا .

بەکورتی ئەو کەسانەی دوای ئارەزو هەوەسی خۆیان ئەکەون ئەمانەی خوارەوەن :

١- تاقمێك هەن لەنێو ئیسلامدا ئەوانە بریتین لەمانە : داوێن پیسان ، قومار کەران ، مەی خۆران ، بەرتیل دەران ، بەرتیل وەرگران ، دۆستە بێشەرمەکانی ڕۆژئاوا کە ئەوروپاییەکان ئەیان کەن بەداردەستی خۆیان و ئەیان کەن بەهۆی تالان کردنی دەرامەت و پیتی وولاتی ئیسلام ، ئەیان کەن بەبەندەی خۆیان بۆ چەوسانەوەی موسوڵمانان و مژینی خوێنیان .

٢- تاقمێ تریان هەن لەدەرەوەی وولاتی ئیسلامان لەدانیشتوانیئەوروپا ، ئەوانە بەچاوچنۆکی خۆیان پەلاماری وولاتانی ئیسلام ئەدەن بەهۆی بەکرێگیراوە بەناو موسوڵمانەکانەوەو دانیشتوانی وولاتی ئیسلام داگیر ئەکەن و ئابووری و سامانیان ئەخۆن بەتایبەتی زێڕی ڕەشیان ، بەنهێنی دەرامەتی موسوڵمانان ئەدزن و ئەی خۆن ، ئەوانە بۆ سودی خۆیان و ریان ئەگرن ، کەچی دانیشتوانی وولاتی ئیسلام هەموو ئاواتیان بریتیە لەمانە : بەرگ و پۆشاکی نایاب ، خواردن و خواردنەوە ، ڕابواردنیان لەگەڵ ژنانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات ، خۆیان لەموسوڵمانان جیا ئەکەنەوە و تێکەڵاوی جولەکەکان ئەکەن و واز لەبرای خۆیان ئەهێنن فیزیان بەسەردا ئەکەن و خۆیان بەگەورە تر ئەزانن و ئەڵێن : ئێمە ڕۆشنبیر و پێشکەوتوین .

هەرێمەکانی ئیسلام ئەوانەیان ئێمە ئەیان ناسین و ئەیان بیستین ، بەتایبەتی عێراق و سوریا و تورکیاو لوبنان و میسر و مەراکیش ، کارەبەدەستەکانیان و بەتایبەتی کاربەدەستانی سعودی و میرنشینەکانی کەنداو بەحرەین و کوەیت ، خوێندەوار و ساماندارەکانیشیان و هەندێ تریان بەهیچ شتێ خۆشی و ئارەزویان ناجوڵێ و تەواو نابێ مەگەر بەخواردن و خواردنەوە و بەرگ و ڕابواردن و دانیشتنیان لەسەر مێز و چێشتخانە و گازینۆ و ئوتێلی ئەوروپا نەبێ ، بەمەی و قومارکردن جێگەکانیان ئەڕازێننەوە و لاسایی ئەوروپاییەکان ئەکەنەوە لەهەموو کارو فرمانیانا بەتایبەتی داوێن پیسی کردن لەگەڵ کوڕان و ژنانیانا .

ئەو کارە ناپەسەندانە ئێمە ئەیان بینین و ئەیان بیستین ئەگەر باوك و باپیرەکانمان و پێشووەکانمان بیاندیایە شێت ئەبوون و خەفەت دای ئەگرتن و لەداخانا ئەمردن . ئەوروپاییەکان و گاورو جولەکەکان و لەئاین وەرگەڕاوەکان دێنە وڵاتانی ئیسلام بەڕوتی و بەهەژاری و بەبێ سامان کەچی زۆری پێ ناچێ ئەبنە خاوەنی کۆشك و سامانی زۆر ، ئەبێ ئەوانەیان چۆن پەیدا کردبێ ؟ پەیدایان کردووە بەپەرداخی پڕ لەئاوی ژەهراوی

کەدەرخواردی دانیشتوانی وولاتانی ئیسلامیان ئەدەن و سەرخۆشیان ئەکەن و پارەی زۆریان لێ ئەسێنن لەمەی خانەکان و قومار خانەکان و مێزیان بۆ ئەڕازێننەوە و بێ هۆشیان ئەکەن و قومارەکانیان پێ ئەدۆڕێنن و باخەڵی خۆیانیان لێ پڕ ئەکەن ، زۆر کاری تری نارەوای تریان پێ ئەکەن .

﴿ وخلق الإنسان ضعيفاً ﴾ وەئادەمیزاد دروست کراون بەلاوازی و بێ توانا ، خۆڕاگر نین و تووشی ئازاری زۆر ئەبن ، خۆیان ڕاناگرن لەسەر پەرستنی خوا ، بەتایبەتی بەرانبەر بەژنان و هەژاری و ڕووداوو کارەساتی ناکاو و نەخۆشی و زۆر شتی تر .

ئادەمیزاد هەرچەندە بێ توانان لەکار و پەرستنی ئایینیدا لەشێر ئازاترن بۆ کاری جیهانی بەزەوی ڕازی نابن و ئەفڕن بۆمانگ و ئەستێرەکانی تر و ڕامیان ئەکەن بۆ سوودی خۆیان .

خوای مەزن لەمەو بەر بۆمانی ڕوون کردەوە ئەو ژنانەی مارەکردنیان قەدەغەن ، ئێستایش باسی ئەو دارایی و سامانانەمان بۆ ئەکا قەدەغەن لەهەندێ ڕێگەوە ، داوامان لێ ئەکا جۆرێ کاری کۆمەڵایەتیمان بۆ ڕوون بکاتە بەهۆی ڕوون کردنەوەی هەندێ لەمامەڵەدا .

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾

﴿ يا أيها الذين آمنوا لا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل ﴾ ئەی کەسانێکی ئـەوتۆ ئێـوە باوەڕتان هێناوە ئێوە مەخۆن داراییەکانی خۆتان لەنێوان خۆتانا بەجۆرێکی پوچ و نـاڕەوا و بە گوێرەی یاسـا نـەبێ ، وەك سـود و قومـار و دزی و بەسـوێندی درۆ و بـەرتیل و درۆ بەکارهێنان لەدادگاکاندا و بەمامەڵەی پوچ و مەرجەکانی نەهاتبێتە دی .

﴿ إلا أن تكون تجارة عن تراض منكم ﴾ مەگەر ئەو داراییانە بەبازرگانیە بێ بەدەستوور و ڕەزایەتی نێوان خۆتان بێ ، بەمەرجێ ئەو بازرگانیە لەسنور دەرنـەچێ بەگوێـەی یاسـا و نەبێتـە هـۆی تێـك چونـی ڕەوڕەو و بـەرژەوەندی دانیشـتوان بـەهۆی بـەرتیلدان بـە کاربەدەستان ، مەرج نیە نرخی کاڵای هـەردوولایان وەك یـەك وابـن ، چونکـە لەوانەیـە نرخی کاڵای یەکێکیان زۆرتربێ لەو کاتەدا ئەو لایەنە بۆی هەیە ئەو زۆرەیش ببا بەمەرجێ مامەڵەکە بەڕەزابەتی هەردوو لابێ و درۆی تێدا نەکرێ .

پرسیار / ئەگەر بازرگان پڕوپاگەندە بکا بـۆ پارچـە و کـاڵای خـۆی بـۆ ڕەواج پـەیدا کردن ئایا ئەو کارە خواردنی دارایی دانیشتوانە بەجۆرێکی ناڕەوا؟

وەڵام / ئەو کارە قەدەغە نیە بەمەرجێ ئەو پڕوپاگەندەیە بـەو جـۆرە بـێ کردوبێتـی ، ئەگەر بەو جۆرە نەبوو بۆ کڕیـار هەیـە مامەڵکـە پـوچ بکاتـەوە و فرۆشـراوەکە بداتـەوە بەخاوەنەکەی و نرخەکەی وەربگرێتەوە.

﴿ ولا تقتلوا أنفسكم ﴾ وەئێوە خۆتان مەکوژن بەناڕەوا و ستەم ، هـەندێکتان هـەندێ ترتان مەکوژن ، ئەو ڕستەیە ئاماژەیە بۆ ئەوە ئادەمیزاد بەوێنەی یـەك کـەس وان کوشـتنی یەکێ لەوان وەك خۆی کوشتبێ وایە ، ئەو خۆکوشـتنە وەك ئـەوەی مـرۆڤ خـۆی بخاتـە خوارەوە لەسەر کێوێ یا خۆی بسـوتێنێ ، بەتایبـەتی جـەنگێ ببێتـە هـۆی کوژرانـی زۆر لەنێوانتانا ، وەك جەنگی نێوان عێراق و ئێران کەزۆرتر لەیەك ملیۆن ئێرانی و نیو مليـۆن عێراقی تێدا کوژرا .

﴿ إن الله كان بكم رحيماً ﴾ بەڕاستی خوا میهرەبان و خاوەن بەزەییە بۆ ئێوە ، فـەرمان بەهەر شتێ بدا و هەرشتێ قەدەغە بکا بـۆ سـودی ئێوەیـە کـەچی ئێـوە خۆتـان بـەزەییتان بەخۆتانا نایەتەوە یەکتری ئەکوژن و دارایی خۆتان ئەدەن بەدوژمنی خۆتان .

﴿ ومن يفعل ذلك عدواناً وظلماً فسوف نصليه ناراً وكان ذلك على الله يسيراً ﴾ وەهەرکەسی بیکا خواردنی دارایی خۆتان و کوشتنی خۆتان لەبەر دەست درێژکردن و لادان لەسنور و لەبەر ستەم کردن لەیەکتری نەك بەهەڵەکردن و تۆڵەسەندنەوە ، دوایی ئێمە ئەو کەسە ئەخەینە ئاگر و تووشی سزای ئەکەین ، وەخستنی ئەو کەسە بۆ نێو ئاگر زۆر ئاسانە لەسەر خوا و کەس ناتوانێ ڕێگە لێ بگرێ بەهەرجۆرێ بێ لەبیرچوون و هەڵەکردن و زۆر لێ‌کراو کارەکانیان بەستەم و بەسنوور دەرچوون دانانرێن .

لەبەر ئەوەی ئەو ئایەتەی پێشوو وای دەرئەخا ئێمە بەهیوای بەزەیی خوا نەبین و لێمان نابورێ بۆ دڵدانەوەمان ئەفەرموێ:

إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾

﴿ إن تجتنبوا كبائرما تنهون عنه ﴾ ئەگەر ئێوە دوور بکەونەوە و خۆتان بپارێزن لەگوناهە گەورەکانی ئەوتۆ ئێوە قەدەغە کراون لەکردنیان .

﴿ نكفر عنكم سيئاتكم وندخلكم مدخلاً كريماً ﴾ ئێمە ئەشۆرینەوە گوناهەکانی ئێوە و لێتان خۆش ئەبین و ، ئێمە ئێوە ئەخەینە جێگەیەکی بەڕێز و گەورە لەڕۆژی دواییدا کەبریتیە لەبەهەشت.

قورئانی پیرۆز گوناهی کردووە بەدوو بەشەوە : گوناهە بچوکەکان و گوناهە گەورەکان ، هەرکاتێ ئێمە زانیمان گوناهە گەورەکان چین و کامانەن ، دوایی بۆمان دەرئەکەوێ گوناهە بچوکەکان کامانەن و چین .

زانایان بیریان جیاوازە دەربارەی گوناهە گەورەکان ، ئەوەی لەهەموو شتێ نزیکتربێ هەر گوناهێ سنور و حەدی بۆ دیاری کرابێ یا بەئاشکرا هەڕەشەی تێدا بێ لەلایەن خواوە

قەدەغە کرابێ گوناهی گەورەن بەلاَم گوناه نابێ بەگەورە لەگەل داوای لیٚ بوردندا ، گوناه لەگەلّ بەردەوامیدا بەپچوك دانانرێ . چاکترین بیرو بۆچوون ئەوەیە گوناه لەخۆیا هەمویان گەورەن ، بەلاَم هەندێ گوناه لەهەندێ تریان بچوکترن ، بۆ نمونە : تەماشاکردنی ژنی بێگانە بەگومانەوە گەورەیە لەخۆیا ، بچوکە بەرانبەر بەماچ کردن ، ماچ کردن بچوکترە بەرانبەر بەداوێن پیسی ، خواردن لەسەر مێزی مەی خواردنەوە بچوکترە لەخواردنەوەی مەی ، هەروەها .

هەندێ لەگوناهە گەورەکان ئەمانەن ، لەهەموو گوناهێ گەورەتر هاوبەش دانانە بۆ خودا ، دوایی بێ ئومێدی لەبەزەیی خوا ، ئەمین بونەوە لەسزادانی خوا ، ئازاردانی باوك و دایك ، کوشتنی ئادەمیزاد بەناڕەوا ، بوختان کردن بەداوێن پاکاندا ، خواردنی دارایی هەتیوان پشت کردنە جەنگی بێ باوەڕان ، خواردنی سود ، جادوکردن ، داوێن پیسی ، سوێندی درۆ ، خواردنەوەی مەی ، نوێژ نەکردن بەدەستی ئەنقەست ، بچڕاندنی خزمایەتی، زەکات نەدان ، شایەتی درۆ ، ڕۆژو نەگرتن ، گۆشتی بەراز خواردن ، حەج نەکردن ، دارایی خواردنی خەلّکی بەستەم ، ئەوانە و هەندێ تر و لەوانەیە بگەنە حەوت سەد.

نوێنەرانی ژنان چوونە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ووتیان بەپێغەمەر : ئایا خوا خوای ژنان و پیاوان نیە ؟ تۆیش پێغەمەری هەمویان نیت ؟ بۆچی خوا هەرناوی پیاوان ئەبا ؟ ئێمە ئەترسین چاکمان تێدا نەبێ و خوا پێویستی بەئێمەی ژنان نیە ، ئوموسەلمە ووتی : ئەی فروستادەی خوا پیاوان لەرێگەی خوادا جەنگ ئەکەن ،ئێمە جەنگ ناکەین ، خۆزگایە ئێمەش وەك پیاوان بوینایە . بۆ دلّخۆش کردنی ژنان خوا فەرمووی :

وَلَا تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۢ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌۭ مِّمَّا ٱكْتَسَبُواْ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌۭ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ

وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٣٢﴾ وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِىَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ ۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾

خوای مەزن کاتێ قەدەغەی کرد لەئایەتەکانی پێشوودا خواردنی دارایی هاونیشتمانان بەنارەوایی و کوشتنی خۆیان ، خوا فەرمانمان پێ ئەدا لەم ئایەتەی دواییدا بەشتێ تری ئاسان و رەوا هەتا واز بهێنین لەو شتانەی قەدەغە کراون ئەویش ئەوەیە هەموو کەسێ رازی بێ بەو شتەی خوا پێی بەخشیوە لەدارایی و پلە و پایە و بەتەمای سامانی خەڵکی نەبێ ، هەتا بەوبۆنەوە دارایی یەکتری نەخۆن و یەك نەکوژن ، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ ولا تتمنوا ما فضل الله به بعضكم على بعض ﴾ وەئێوە ئاوات مەخوازن بۆ شتێ خوا رێزی هەندێ لەئێوەی داوە بەسەر هەندێ ترتانا بەهۆی ئەو شتەوە کەدارایی زۆر و پلە و پایەی بەرزی پێداون ، لاتان خۆشبێ ئەو شتانەی ئەوان بۆ ئێوەبێ ، ئەوانە بەدەستی ئێوەنین و خوا پێی بەخشیون وەك پێغەمەرایەتی و زانیاری و جوانی و سامان .

بۆ زانین : ئاوات خواستن بۆ دارایی دوو جۆرە :

١- (الغبطه ) یانی داواکردنی وێنەی شتێ خوا بەخشیوێتی بەکەسێ کە خوا بەویشی ببەخشێ و ئەو شتە خوا لەو کەسەی تری نەستێنێتەوە ، ئەو جۆرە ئاواتە رەوایە و قەدەغە نیە .

٢- (الحسد) یانی داواکردنی شتێ خوا بەخشیوێتی بەکەسێ و خوا لەو کەسەی بسێنێتەوە و بیدا بەم بەتەنیا ، ئەو جۆرەیان قەدەغەیە و مەبەستە لەفەرماندانی خوا بەورستەیە .

بەگوێرەی فەرمودەی خوا جۆری یەکەم ڕەایە کەئەفەرموێ : ﴿ ربنا أتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ ببەخشە بەئێمە لە جیهاندا چاکە و لەدوارۆژ و چاکەی گەورە.

﴿ للرجال نصيب مما أكتسبوا وللنساء نصيب مما أكتسبن ﴾ بۆ پیاوان هەیە بەشێك و پاداشتێ لەشتێ پیاوان خۆیان کردویانە ، بۆ ژنان هەیە بەشێك و پاداشتێ لەشتێ خۆیان کردویانە ، بۆ هەموو ئادەمیزادێ هەیە پاداشتی کردەوەی خۆیان ، دروست نیە دەرونی خۆیان خەریك بکەن بەئاواتی خراپ و دلپیسی .

﴿ واسألوا الله من فضله إن الله كان بكل شيء عليماً ﴾ وەئێوە داوابکەن لەخوا وێنەی شتێ خوا بەخشیوێتی بەجگەی خۆتان و داوای نەمانی شتێ مەکەن خوا بەخشیوێتی بەوان، گەنجینەی خوا کۆتایی پێنەهاتووە ، بەتەمای دارایی جگەی خۆتان مەبن ، بەڕاستی خوا بەهەموو شتێ ئەزانێ جێگەی شایستەیە ئەوەی ئەیدا بەکەسێ ، ئاگای لەوانی تر هەیە .

پرسیار : فەرماندان بەداواکردن لەخوا وای دەرئەخا ئەو داوایە وەربگیرێ کەچی ئادەمیزاد هەمویان یا زوربەیان بەپەرۆشەوە ئەپاڕێنەوە لەخوا و ، خوا وەلامی داواکەیان ناداتەوە ؟

وەلام : زۆر ڕاستە خوا فەرمانی داوە بەپاڕانەوە ، بەلام لەهەمان کاتدا فەرمانی داوە بەکۆشش و کارکردن و نابێ مرۆڤ بەتەمەلی دانیشێ و هەر شتێ بەدلیا هات خوا بیداتێ، ئەگەر بەو جۆرە خوا وەلامی مرۆڤ بداتەوە گەردون کاول ئەبێ ، چونکە وائەبێ دوو کەس لەیەك کاتا داوای دووشتی دژ بەیەکتری بکەن هەرکەسێ داوای شتێ بکا و بەتەمەلی دانیشێ ئەبێ بە خەفەتەوە بمرێ .

﴿ ولكلٍ جعلنا موالي مما ترك الوالدان والأقربون ﴾ وەبۆ هەموو کەسێ لەپیاوان و ژنان ئێمە بۆ ئێوەمان گێڕاوە و بۆمان دیاری کردووە چەندین میراتبەر لەشتێ بەجێی هێلاوە باوك و دایك و خزمەکانتان لەمنال و برا و مام و کەسانی تر .

ووشەی (موالی ) بەشەش مانا هاتووە :

(١)ئازاد کەری بەندە کە میراتی ئازادکراوەکەی خۆی ئەبا .

(٢)بەندە ئازاد کراو چونکە پەیوەندی بەسەر دارایی خۆیەوە هەیە .

(٣)ئامۆزایان ، چونکە ئەوان سەرداری پاراستنی هەموو کارەساتێکی خزمانی خۆیانن .

(٤)هاوسوێند ئەبێتە بەڕێوەبەری کاری هاوسوێندەکەی بەهۆی دابەستنی سوێندەوە یاریدەی یەکتری ئەدەن لەهەموو ڕوداوێکا.

(٥)دۆستانی خوا چونکە خوا یاریدەریانە.

(٦)میراتبەران ، مەبەست لەم ووشەیە لەم ئایەتەدا میراتبەرانە .

﴿ والذين عقدت ايمانكم فاتوهم نصيبهم ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ بووبن بەهاوسوێندی یەکتری بۆ ئەوەی میرات لەیەکتری بگرن ، دوایی ئێوە بیبەخشن بەوان بەشەکانیان بەگوێرەی گرێ بەندەکەتان ، بەر لەهاتنی ئاینی ئیسلام هاوسوێند میراتیان لەیەکتری ئەگرت ، بەلاّم بەئایەتی ﴿ وأولوا الأرحام بعضهم أولى ببعضٍ ﴾ وەخاوەن خزمەکانتان هەندێیان چاکترن لەهەندێ تریان بۆ ئێوە و نزیکترن لەئێوەوە مانکەی گۆڕاوە .

لای ئەبو حەنیفە ئەگەر پیاوێ موسولّمان بو لەسەر دەستی پیاوێ تر و پەیمانیان بەست کە میرات لەیەکتری بگرن ئەو کارە دروستە .

بۆ زانین : پەیمان بەستن ئەمانەیش ئەگرێتەوە : گرێ بەندی نێوان ژن و مێردی ، گرێ بەندی سەرداری نێوان ئازاد کەر و ئازادکراو ، گرێ بەندی ئیسلامەتی کەسێ بمرێ و میراتبەری نەبێ موسولّمانان میراتەکەی ئەیەن .

﴿ إن الله كان على كل شيء شهيداً ﴾ بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکا ئاگادارە و بەنهێنی و ئاشکرای هەموو شتێ ئەزانێ .

لەبەرئەوەی پەیمانی دۆستایەتی و خۆشەویستی بەستراوە لەنێوان ژنان و پیاواندا ، خوا پێویستی کردوە ئەو دۆستایەتی‌یە بتەوتربێ لەنێوانیانا بەگوێرەی سروشت خوا پێویستی کردووە لەسەر پیاوان ستەم لەژنان نەکەن و لەسنور دەرنەچن ، بۆ ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ :

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ
عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ
قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ
نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ
وَٱضْرِبُوهُنَّۖ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًاۗ
إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ
بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن
يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا



﴿ الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعضٍ ﴾ پیاوان دانراون بەسەر ژنانی خۆیانەوە بۆ بەخێو کردن و دەست گرتنیان و یاریدانیان و جێبەجێ کردنی کارەکانیان . پیاو و ژن بنچینەی سەرەکین بۆ ژیانی ئادەمیزاد هیچ یەکی لەوان بەبێ ئەوی تریان کار و فەرمانیان ناڕوا بەڕێوە ، بەڵام جۆرە جیاوازی‌یەك هەیە لەگەڵ ژنان ، ئەگەر وەك یەك وابن لەهەمو لایەکەوە پێویستی بەدروست کردنی هەردوکیان نەئەبوو ئەگونجا

هەر یەکێکیانبێ، ئەوکاتە بوون نەبونی ئەوی تریـان یەکسـان ئـەبوو ، دوایـی داواکردنـی بۆلای یەکسانی نێوانیان دژی گفتوگۆی ژیانی جیهانـە ، پیـاو ڕێزدارتـرە لـەژنان بـەهۆی چەند شتێکەوە . خوا ڕێزی هەندێ پیاوی داوە بەسەر هەندێ ژنانا ، خـوا ڕێـزی هـەموو پیاوانی نەداوە بەسەر هەموو ژناندا ، زۆر ژن هەن بـەڕێزتر و گـەورەترن لـەهـەزاران پیـاو هەر لـەبەرئەوە خوا نەی فەرموە ﴿ بما فضلهم عليهن ﴾ کەکورت تریشە .

زۆرکەس لـەژنان و یاریدەدەرەکانیان ئەڵێن : مەبەستمان ئەوەیە ژنان و پیاوان یەکسانبن لەهەندێ مافەکان و پێویستیەکانیان ، نەك یەکسان بـن لەگـەڵ پیـاوان لـەهـەموو شـتێکا کەلـەوانەن منالبوون و شیردان . لـەوەڵامدا جیاوازی دروستبونی ئەندامانی ژنان بێگومـان داوای ئەوە ئەکەن جیاواز بن ژن و پیـاو لـەهـەندێ مـاف و پێویسـتیدا ، بگـرە جیـاوازن لـەئارەزوی ژن و مـێردا ، ئـەو کەسـەی بڵـێ : یەکسـانن لەهـەموو لایەکـەوە لـەمافو پێویستیدا وەك ئەمەوایە بڵێ : ئەبێ جیاواز بن لـەهەموو شتێکا ، ئەوەی ڕاسـتی بـێ ژن و پیاو هاوبەشن لـەزۆر مافدا ، گرنگتر لـەهـەموان یەکسـانن لـەبـەردەم خـوادا و سەربەسـتن لـەدەستکاری کردنی دارایداو لـەهەڵبژاردنی هاوبەشی خۆیانا ، جیاوازن لـەهەندێ مافدا ، لـەئایەتی (٢٢٨) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی (١٠) جیاوازی نێوان ژن و پیاویان کردوە لـەیاسای ئیسلامدا ، مەبەستی ئەو ئایەتەی ئێرەیش ئەمانەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە :

١- پیاو سەردارە لـەسەر ژنـان : مەبەسـت لـەپیاوان بەتایبـەتی مێردەکانـە ، لـەژنان بەتایبەتی ژنانێ مێردارن ، مەبەست لـەسـەردار بەسـەر ژنانـەوە دەسـەڵاتداری پیـاوان نیـە بەبەرەڵایی بەجۆرێ پیاو سەردارێکی دیکتاتۆربێ و ژن بچوکی پیاوبـێ و هـیـچ توانایـەکی بەرانبەر پیاونەبێ ، بەڵکو مەبەست جۆرە سەرداریەکی کەمە ، یاسازانان بۆ پیاوانی دیـاری کردووە کە تەڵاقدان دراوەتە دەست پیاوان ، پێویستە ژن پەیڕەوی پیاو بکا بـۆ خـەوتن ، لـەجێگەی مێرد دەرنەچێ بەبێ دەستوری پیاو ، ژن و پیاو لـەجگەی ئـەو شـتانە وەك یـەك وان و یەکسانن .

٢- خوا دوو هۆی داناوە بۆ سەرداری پیاوان ، ئاماژەی بەیەکمیان کردووە بە ﴿ بما فضل الله بعضهم على بعضٍ ﴾ وەئاماژەی کردووە بۆ هۆی دووهەم کەئەفەرموێ: ﴿ وبما أنفقوا من أموالهم ﴾ وەپیاوان دانراون بەسەر ژنانەوە سەردارییانن بەهۆی شتێ پیاوان ئەیبەخشن بەژنان لەمارەیی و بەخێو کردنیان .

خوای گەورە جۆری ڕێزداری پیاوانی ڕوون کردوەتەوە ، هەرئەوەندە ئەفەرموێ ﴿ بما فضل الله ﴾ زانایان و ئەو کەسانەی مانای قورئانیان کردووە ئەلێن : پیاو لەژن بەهێزتر لەدروستبوونی ئەندامەکانی ، زانایان درێژەیان داوە بەدیاری‌کردنی ڕێزداری پیاوان ، بەو جۆرەی ئێمە ئەیبینین کارە گەورە و بەسودەکانی ئاینی و زانیاری و ڕامیاری زۆربەی هەرە زۆریان لەپیاوانەوە ئەبینری و کەم جاران لەژنانەوە ، زۆرتر لەهەموو شتێ ژنان گرنگی بەرگ و ڕازاناوەی لەشیان و هوروژانی هەستی ژنایەتی ئەدەن ، وائەبێ لەمانگێکا ژن بەهۆی حەیزەوە ناتوانێ کاری ڕامیاری بکا .

ئەوەی شایانی ئاماژە بێ بۆ لای فەرمودەی خوا ﴿ وبما أنفقوا من أموالهم ﴾ هەرکاتێ پیاو ژنی بەخێو نەکرد سەرداری پیاو بەسەر ژنانەوە نامێنێ ، لەو کاتەدا ژن بۆی هەیە لای دادوەر داوای تەڵاقدان بکا بەگوێرەی یاسا ئەگەر پیاو سەرپێچی کرد دادوەر لەجیاتی پیاو تەلاقی ئەدا .

بەلای مالیك و شافیعیەوە ، ژنان ئەکرێن بەدوو بەشەوە :

١- ﴿ فالصالحات قانتات حافظات للغيب بما حفظ الله ﴾ دوایی ژنانی کردەوە چاك ئەو ژنانەن پەیڕەوی فەرمودەکانی خوا ئەکەن و بەو جۆرەی خوا بۆی دیاری کردوون پەیڕەوی مێردەکانیان ئەکەن ، پارێزەری ئەو کارانە ئەکەن لەبەرچاونین و ناموسی خۆیان و دارایی مێردەکانیان ئەپارێزن .

بەهۆی پاراستنی خوا بۆ ژنان ، بەو بۆنەوە خوا فەرمانی پێداون کارە نهێنیەکان بپارێزن، فەرمانی داوە بەپیاوان مارەییەکانیان بدەنێ و ژنەکانیان بەخێو بکەن و لەڕووداوی خراپ بیان پارێزن .

بەڕاستی ژن و پیاو یەکسانن وەك باسکرا ، بەڵام لەمانەی خوارەوە یەکسان نین :

١- خوێنی ژنان نیوەی خوێنی پیاوانە .

٢- تەڵاقدان و گەڕانەوەی ژنان بۆ لای نیکاحی پیاوان لەهەندێ جۆری تەڵاقدا بەدەستی پیاوانە نەك ژنان .

٣- بۆ ژن قەدەغەیە نەچێتە لای مێردی خۆی بۆ خەوتن .

٤- نوێژی هەینی پێویست نی‌یە لەسەر ژنان .

٥- نابێ ژنان بکرێن بەسەرۆکی باڵای موسوڵمانان ، لای جگەی ئەبی حەنیفە نابێ بکرێن بەدادوەر . بەڵام لەمافەکانی ئادەمیزادا نەك مافەکانی خوا .

٦- بۆ ژنان دروست نیە ببن بەپێشەوای نوێژی بەکۆمەڵی پیاوان ، پیاو دروستە بۆی ببێ بەپێشەوای پیاوان و ژنان .

٧- شایەتی ژنان لەجگەی داراییدا وەرناگیری . بەڵام شایەتی دانی ژنان بۆ مناڵبوون و کچایەتی و بێوەژنی وەرئەگیرێ و دوو ژن بەپیاوێ دائەنرێ لەشایەتی دانان .

٨- ژنان نیوەی پیاو ئەبەن لەمیرات وەرگرتندا .

٩- پێویستە لەسەر ژنان هەموو ئەندامانی خۆیان داپۆشن بەرانبەر بەپیاوان جگەی دست و ڕومەتیان .

١٠- داوا لەژنان ناکرێ بچن بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بێباوەڕان ، سەرانە لەژنانی بێ باوەڕ ناسەنرێ و لەجەنگدا نابێ بکوژرێن مەگەر جەنگاوەربێ .

١١- بۆیان نیە ژن مارە بکەن بۆ کوڕی مناڵیان و بۆشیان نیە بکرێن بەسەرداری دارایی مناڵان ، بۆ باوك دروستە .

١٢- غاردانی چارەوێ و تیربازی بۆ ژنان ڕەوانی‌یە .

١٣- خزمێکی ژنان بەهەڵەو نەزانین پیاوێ بکوژێ هاوبەشی خوێندانەکەی نیە لەگەڵ پیاواندا ، ئەو کارە پێی ئەوترێ (العاقلە) .

١٤- ژنان پێویستە پیاوان بەخێویان بکەن و زۆر شتی تریش لەسەر پیاوان پێویستە و لەسەر ژنان پێویست نی‌یە.

٢- بەشی دووهەمی ژنان : ژنان هەیانە گوناهبارو چەقەچرۆ لەپێویستی سەر شانی خۆیان لایانداوە دەربارەی پیاوان ، ئەم بەشەیان لەڕستەی دواییدا خوا فەرمانی خۆی بۆ دیاری کردوون .

پیاوان و ژنان بۆیەکتری چاکترین چاکەی خوان بەمەرجێ خۆشەویستی نێوانیان نەپچڕێ ئەگەر خۆشەویستی پچڕا ئەبنە شێرپەنجە بۆ یەکتری نەختە نەختە یەکتری لەناو ئەبەن.

لەهەندێ ئایندا هاتوە خوا لەپاشەڕۆژدا سزای تاوانباران بەئاگر و پاداشتی چاکەکاران بەبەهەشت ناداتەوە ، بەڵکو تاوانباران ئەکا بەمێردی پیرژنێکی ناشیرینی ڕەوشت خراپ بەو بۆنەوە ئازاری ئەدا ، پیاوچاك ئەکا بەهاوسەری ژنێکی جوانی ڕەوشت چاك و بەپێچەوانەیشەوە .

﴿ واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن ﴾ وەژنانێکی ئەوتۆ ئێوە ئەترسان لەلادانیان لەسنوورو هەڵنەسان بەمافی ژن و مێردایەتی و لەئاژاوەی نێوانیان ، دوایی ئێوە ئامۆژگاری ئەو ژنانە بکەن بەنەرم و نیانی و گفتوگۆی خۆش ، بلێن ئێوە لەخوا بترسن و واز لەکاری خراپ بهێنن ، مافی پیاوان لای خوا بەسەرتانەوە زۆرە ، خواش پاداشتتان ئەداتەوە .

﴿ واهجروهن في المضاجع ﴾ وەئێوە واز لەژنەکان بهێنن و لەگەڵیان مەخەون و ژن و مێردیان لەگەڵ مەکەن ، ئەگەر بەوانەوازیان نەهێنا .

﴿ وأضربوهن ﴾ وەئێوە بدەن لەژنەکان ، بەڵام لێدانێکی سوك و بریندازیان نەکەن و ئەندامەکانیان نەشکێنن و ڕوومەتیان نەڕۆشێنن .

ئەو فەرمانە پێویست نەکراون لەسەر پیاوان و هەرئەبێ بکرێن لەگەڵ ژنان ، زانایان بەگشتی لایان وایە لێ نەدانی ژنان چاکتر و گەورەترە لای خوا، هەروەك پێك هاتوون ئەگەر ژنان بەسوکترین شتێ گەڕانەوە بۆلای یاسا قەدەغەیە کاری سەخت تریان لەگەڵ بکرێ ، ئارام گرتنی مێرد لەسەر ئازاری ژنان لای خوا پاداشتی زۆر گەورەی هەیە .

ئەو شتانەی ئەبنە هۆی لێدانی ژنان چوار شتن :

(١)خۆجوان نەکردنیانە بۆ مێردەکانیان .

(٢)وەڵام نەدانەوەی مێردەکانیان بۆ خەوتن لەگەڵیان .

(٣)نوێژ نەکردن و لەش پیسی دەرنەکردن .

(٤)چونە دەرەوە بەبێ ئاگادرای مێردەکانیان و بەبێ بیانوی ڕەوا .

﴿ فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلاً ﴾ دوایی ئەگەر ژنەکان پەیڕەوی ئێوەیان کرد بە یەکێ لەو سێ فەرمانانە یا بەهەمویان ، دوایی ئێوە ڕێگەیە داوا مەکەن لەسەر ئەو ژنانە بۆ ئازاردانیان و برِو بیانوی پوچیان بۆ دروست بکەن با خۆشیشتانەوێن ، نابێ نەبە زمان و ، نەبەکردەوە ئێوە ئازاری ژنان بدەن ، ژن هاوڕێگەی ژیانی خۆشیتانە قەدەغەیە ئازاردانیان.

﴿ إن الله كان علياً كبيراً ﴾ بەڕاستی خوا پایەی بڵندە و کەس ناتوانێ پایەی بۆ دیاری بکا و ستەم کردن لەژنان خۆشنابێ و چاو پۆشیتان لێ ناکا زۆر گەورەیە و پێویستی بەکەس نیە .

خوای مەزن لەئایەتی پێشوودا باسی سەرچەوتی ژنانی کرد ، لەم ئایەتەی دواییدا باسی سەرچەوتی ژنان و پیاوان ئەکا لەیەك کاتا ، هیچ لایەکیان مافی ئەوی تریان جێبەجێ نەکەن بۆ دیاری کردنی یاسای نەهێشتنی ناکۆکی نێوانیان خوا ئەفەرموێ:

﴿ وأن خفتم شقاق بينهما فابعثوا حكماً من أهله وحكماً من أهلها ﴾ وەئەگەر ئێوەی کاربەدەستان ترسان لەبەردەوامی ئاژاوەی نێوان ژن و مێرد ، دوایی ئێوە بنێرن بۆ ڕوون کردنەوەی سەرچەوتی ئەوان و هۆی ئاژاوەی نێوانیان پیاوێ لەخزمان و دۆستی پیاو شیاوی ئەو بێ فەرمان بدا و بتوانێ ئاشتی ساختەبهێنێ و ، پیاوێ تر لەخزمان و دۆستی ژن کەئەویش شایستەدادوەری بێ ، هەتا بۆیان دەربکەوێ شاراوەی دڵی ژن و مێرد و هۆی ئاژاوەی نێوانیان و بتوانن گێرە و کێشەکەیان چارەسەر بکەن .

مەبەست لەچاك کردنی نێوان ژن و مێرد پاراستنی بنەماڵە و ترسی لەناوچونی منالەکانە ، مەرج نی‌یە ئەو پیاوە ناوبژی کەرە خزمبێ چونکە مەبەست نەهێشتنی ئاژاوەی

نێوانیانە هەرچەندە خزم باشتر نهێنی دڵیان ئەزانێ و بەبەزەیی ترە بۆیان و بۆ ناردنی ڕاپۆرتە بۆ دادوەر .

﴿ إن يريد إصلاحاً يوفق الله بينهما إن الله كان عليماً خبيراً ﴾ ئەگەر ئەو دووپیاوە ناوبژی کەرانە مەبەستیان چاك کردنی نێوان ژن و مێردبێ خوا یاریدەی ئاشتبونەوەی نێوان ژن ومێرد ئەدا ، بەڕاستی خوا ئەزانێ مەبەستی ناوبژی کەران و ئاگای لەستەمکار هەیە .

خوای مەزن باسی لادانی ژنی لەیاسا کرد و دواییش باسی لادانی ژن و مێردی کرد بەیەکەوە . باسی لادانی مێردی نەکرد بەتەنها ، زانایان ئاماژەیان بۆ کردووە ، ووتویانە : هەرکاتێ مێرد لەسنور لای‌دا و هەندێ لەمافی ژنی زەوت کرد ، ژنەکە ئامۆژگاری مێردەکەی بکا ، بۆی نیە لەگەل مێردەکەی نەخوێ و لێی بدا ، چونکە ئەوانە پێویستە خوا دەستوری پێدابێ‌و نەیشی داوە . بەلام بۆژن هەیە داواکاری خۆی بباتە لای دادوەر و دادوەر بەگوێرەی یاسا ئاژاوکەیان نەیەلێ بەلێدانی مێرد یا بەند کردنی یا تەلاقدانی ژنەکەی .

زانایان لەناردنی ناوبژی کەران بیریان جیاوازە : هەندێکیان ئەلێن : ناوبژی‌کەران بۆیان هەیە لەپاش سەرنەگرتنی کۆششیان ژن و مێرد لەیەك جیا بکەنەوە بەتەلاقدان . پێشەوا مالیك و قوتابی و هاورێکانی ئەم بۆچونەیان پەسەند کردووە ، فەرمودەیەکی پێشەوا شافیعی لەگەڵ ئەو بۆچونەیە ، کەواتە ناوبژی کەران دەسەلاتی دادوەریان دراوەتێ. هەندێ تر لەزانایان ئەلێن : ناوبژی کەران وەکیلی ژن و مێردن بۆیان نیە جیاکردنەوەی نێوان ژن و مێرد بەتەلاقدانی ژن ، کەواتە مێرد ناوبژی کەری خۆی بکا بە وەکیل بۆخۆی بۆتەلاقدانی ژنەکەی لەسەرپارە ، ژنەکەیش ناوبژی‌کەری خۆی بکا بەوەکیل بۆ وەرگرتنی تەلاق لەسەر پارە .

کاتێ خوای مەزن فەرمانی دا بەرەوشتی چاك لەگەڵ ژنان و هەتیوان و خێزان ، ئێستا باسی ئەو شتانەمان بۆ ئەکا زۆر بەرێز و گەورەن . بەر لەهەمویان فەرمان ئەدا بەپەرستنی خوا و ئەفەرموێ :

وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾

﴿ وأعبدوا الله ﴾ وەئێــوە خـوا بپەرســتن ، پەرسـتنی خـوا بەجـەنگ کـردن لەگـەڵ بێباوەڕان و خۆ کردن بەقوربانی بۆ ئاین لەهــەموو پەرستنێ گـەورەترە لەبـەر ڕاسـتی و سەربەستیو مرۆڤایەتی گەڕان بەشوێن زانیاری و خۆمـاندوکردن بـۆ ژیـان و گـوزەران و یارمەتی دانی پەیدا بوونی شتێ چاکەی تێدا بێ و ئاشتەوایی پەیداکردنی نێـوان دانیشـتوان گەورەترن لەنوێژ و ڕۆژ وو کە هەر سودی تایبەتیان تێدایە .

﴿ ولا تشركوا به شيئاً ﴾ وەئێوە هیچ شتێ مەکەن بە هاوبەش بۆ خوا لەپەرستندا وەك بت و جگەی بت ، باوەڕ نەبوون بەبونی خوا بێ ئاینیە و پێی ناوترێ هاوبەشدانان ، بـەڵام هاوبەش دانان بۆ خوا دوو جۆرە :

١) هاوبەشدانان لەخوایەتیدا ، وەك ئـەوەی کەسـێ بـڕوای وابـێ دروسـت کـەری بونەوەران و ڕۆزدەریان لەیەك کەس زۆرترن ، لەو جۆرەیانە بڕوابوون بەمەی خوا شـالیار و ڕاوێژکار و هاوبەشی لەپەرستندا هەیە .

٢) جۆرێکە لەهاوبەشدانان خۆشەویسـتی دادوەر و کاربەدەسـتی تاوانبـار و هـەموو کەسانی تر شایانی ئەوە نەبن فەرمان ڕەوای ئادەمیزادبن .

﴿ وبالوالدين احساناً ﴾ وەئێوە چاکە بکەن لەگەڵ باوك و دایکتانا ، خوای مەزن چاکە کردنی لەگەڵ باوك و دایکا بەرانبەری کردووە لەگەڵ پەرستنی خۆیا لەزۆر ئایەتەکانی قورئاندا ، ئەوەیش ئەوە ئەگەیەنێ باوك و دایك پلەی باڵایان هەیە لای خوا بۆ چاکە کردن لەگەڵیان .

﴿ وبذي القربى واليتامى والمساكين ﴾ وەئێوە چاکە بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەی خاوەنی خزمایەتی نزیکن لەبراو مامەکانتان ، سەریان لێ بدەن و هاتوچۆیان بکەن و ، چاکە بکەن لەگەڵ هەتیوان و یارمەتیان بدن و چاکە بکەن لەگەڵ هەژاران و بێ کاران و پەك کەوتوان و دەست گیرۆییان بکەن ، بەڵام ئەو کەسانەی توانای کارکردنیان هەیە و بەتەمەڵی دائەنیشن تاوانە یارمەتی دانیان و هانیان بدەن بۆ کارکردن .

﴿ والجار ذي القربى والجار الجنب ﴾ وەئێوە چاکە بکەن لەگەڵ دراوسێ نزیکەکان ، ئیتر هاوئاینتان بن یان نە ، چاکە بکەن لەگەڵ دراوسێ دوورەکانتان . زانایان ئەڵێن چل خانوو لەهەر چوارلاوە بەدراوسێ دائەنرێن .

﴿ والصاحب بالجنب وابن السبيل وما ملكت أيمانكم ﴾ وەئێوە چاکەبکەن لەگەڵ هاوڕێ و هاوکارتان لەهاوڕێی خوێندتان لەکاروان و لەجگەی کارواندا ، چاکە بکەن لەگەڵ کەسانێ لەکارواندان و دەستیان ناگاتە سامانی خۆیان ، یا هەرسامانیان نیە بەهۆی خوێندنەوە و ، چاکە بکەن لەگەڵ ئەوانەی کردونتان بەدارایی خۆتان لەکۆیلەکان نێر بن یان مێ ، سوپاس بۆ خوا ئێستا بەندە و کۆیلە نەماون ، چاکەکردن لەگەڵ ئەوانەی پێشوو تەنها هەر بەدارایی نیە ، بەڵکو نەرم ونیانی لەگەڵیان و ڕێز گرتنیان و هەوڵدان بۆ جێبەجێ کردنی کاریان و ئامۆژگاری کردنیان و پرس پێکردنیان و چاو داخستن لەئاستی ناموسیان و بڵاو نەکردنەوەی خراپەبان ئەوانە هەمویان ئەگەڕێتەوە بۆلای چاکە کردن .

﴿ إن الله لا يحب من كان مختالاً فخوراً ﴾ بەڕاستی خوا خۆشی ناوێ هەرکەسێ خۆی بەگەورە بگرێ بەرانبەر خزم و دراوسێ و چاودێریان نەکا ، کەسێ خۆی هەڵکێشێ و

پلە و پایەی خۆی بژمێرێ و چاکەی خۆی باس بکـا ، چونکـە ئـەو شـتانە بـێ سوپاسـی خوان.

خوای مەزن لەئایەتی پێشوودا باسی فەرماندانی بەچاکەکردن کرد لەم ئایەتەی دواییـدا باسی ئەو کەسانە ئەکا ئەو شتانەی خوا پێویستی کـردوە لەسـەریان نایگەیـەنن بەجێگـەی خۆیان وئەفەرموێ :

ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَهُۥ قَرِينٗا فَسَآءَ قَرِينٗا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيۡهِمۡ لَوۡ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمۡ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾

﴿ الذين يبخلون ويأمرون الناس بالبخل ﴾ ئەو کەسانەی خۆ هەڵئەکێشـن کەسـانێکی ئەوتۆن ڕژدن و نابەخشن بەدانیشـتوان ئـەو شـتانەی خـوا پێویسـتی کـردووە لەسـەریان لەزەکات و جگەی زەکات و ، فەرمان ئەدەن بەئادەمیزاد بەرژدی و نەدانی پێویسـتیەکان وەك خۆیان نایدەن بەهەژاران .

﴿ ویکتمون ما آتـاهم الله مـن فضلـه ﴾ وەئەشـارنەوە شـتێ خـوا بەخشـیوێتی بـەوان لەچاکەی خۆی ، وەك دارایی و زانایاری و دارایی خۆیان نادەن بە هەژاران و دانیشـتوان فێری زانیاری ڕاستیان ناکەن ، بێگومان شاردنەوەی دارایی و زانسـت قەدەغـەن و ئـەبێ بڵاو بکرێنەوە بەنێو ئادەمیزادا .

﴿ وأعتدنا للكافرين عذاباً مهيناً ﴾ وەئێمە ئامادەمان کردووەبۆ بـێ بـاوەڕان سـزایەکی بێنرخ کەریان ، ئەو کەسانەی باسکران وێنەیان ئێستا زۆرن لـەنێوموسوڵمانانەدا .

ئەو کەسانەی هاوبەشی موسوڵمانان ناکەن لـەکاتی جەنگدا و بەجۆرێ سود بگەیەنن بە گەل و بەکۆمەڵی ئیسلام و پیتاك نادەن بەکۆمەڵگای چاکەویستان و یارمـەتیان نـادەن بـۆ دروست کردنی مزگەوت و نەخۆشخانە و پەیمانگا و کڕینی پاپۆڕ و چەك وێنـەیان زۆرن ، بەوانەیشەوە ناوەستن ، بەڵکو پڕوپاگەندەیش بـڵاو ئەکەنـەوە لـەنێوان ئـادەمیزاد لـەدژی موسوڵمانان هەتا یارمەتیان نەدرێ ، ئەو کەسانەی سامان و زانیاری خۆیان ئەشارنەوە کـە خوا بەگەورەیی خۆی بەوانی بەخشیوە بەڕاستی شایستەی سەرزەنشت و تاوانن .

﴿ والذين ينفقون اموالهم رئاءَ الناس ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆش ئەیبەخشن دارایی خۆیـان لەبەرئەوەی ئادەمیزاد ببینن ، ئەو شتەی ئەیبەخشن خۆیـانی پێـوە هەڵکێشـن و مەبەسـتی تریان نیە ، ئەو کەسانە لـەم ڕۆژەدا وێنەیان زۆرە کاتێ ویستیان شتی ببەخشن داوا ئەکـەن ناویان لـەگۆڤار و ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلـەفزیۆندا بڵاو بکرێتەوە . مزگەوت و نەخۆشـخانە و خوێندنگا و پردێ دروست ناکەن هەتا ناویان لـەسەر دەرگاکانیان نەنوسرێ بەو بۆنـەوە سامانی زۆردائەنێن کەچی خزمەکانیان وە دراوسێ و هەژارەکان ڕووت و برسین .

بگرە خێزان و منداڵەکانیان ئەوپەڕی پێویستیان بەو سامانە هەیـە و نایـان دەنـێ چونکـە کەس ناویان نابا و باسیان ناکرێ ، بۆیە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ ولا يؤمنون بالله ولا باليوم الآخر ﴾ وە باوەڕیش بەخوا ناهێننو بڕوایش بەپاداشـت و سزای پاشەڕۆژ ناهێنن ، ئەگەر ئەو کەسانە باوەڕ بەخوا و بەپاشەڕۆژ بهێنن مەبەستیان هـەر

خوا ئەبو ، بەڵام ئەوان مەبەستیان ئەوە بوو جگـەی خـوا بیاندیبایـە ئـەوەی ئەیبەخشـن و خۆیانی پێوەهەڵئەکێشن ، بێگومان ئەو کەسانە بڕوا بەخوا و ڕۆژی دوایی نـاهێنن دۆسـت و هاوڕێی شەیتانن .

﴿ ومن يكن الشيطان له قريباً فساء قريناً ﴾ وە هەرکەسێ شەیتان هاوڕێی ئەوبێ دوایی ئەو هاوڕێتیەی شەیتانە خراپە بۆیان ڕێگەی خراپەیان بۆ خۆش ئەکا .

هەمو کەسی ڕێگە و کردەوەی خراپ بڕازێنێتەوە و هانی دانیشتوان بدا بۆ لای خراپـە و گومڕایی تۆ بۆت هەیە ناوی ببەی بەشەیتان ، لەبەرئەوە زۆر کەس هەن زۆر شت ئەکەن و ئەیلێن بە سروشی شەیتانەوە ، وائەزانن خوا بۆیان ئەکا ، خراپترین کەسە ئەوەیـە خـۆی بەپیرۆز بزانێ و خۆی نەناسێ و بەرگی پیاوچاکان بکاتە بەری خۆی .

شەیتان تاقمی زۆرن و هەریەکەیان کارێکی پێ سپاردووە هەیانە هانیان ئەدا بۆ ڕژاندنی خوێنی ئادەمیزادانی بێ تاوان ، هەیانە هانیان ئەدا بۆ کردنی گوناە و داوێن پیسی ، هەیانـە هانیان ئەدا بەرگی پیاو چاکان بپۆشن و مرۆڤی ساویلکە بەوان ڕاو بکـا . ئەگـەر شـەیتان پیاو چاکانی بۆ نەخەڵەتا بەوە ڕازی ئەبێ لەوان گفتوگۆیە بکەن لەسـەر داوای شـەیتان ، ئەگێڕنەوە شەیتان ووتی بەعیسا : تۆ بڵێ ﴿ لا إله إلا الله ﴾ عیسا فـەرموی : مـن ئـەیلێم نەك بەفەرمانی تۆ ، بەڵام لەبەرئەوەی ڕاستە ، شەیتان سەر شۆڕ بوو .

﴿ وماذا عليهم لو آمنوا بالله واليوم الآخر وانفقوا مما رزقهم الله وكان الله بهم عليماً ﴾ وە چ شتێکی زیان بەخشە توشی ئەوان ئەبێ و لەسەر بێ باوەڕان ئەکـەوێ ئەگـەر ئـەوان باوەڕیان بەخوا و بەڕۆژی دوایی بهێنایە و ئەوان بیاندایە بەهەژاران لەشتێ خوا بەخشیبوی بەوان .

خوای مەزن پەیوەستی کردووە بەخشینی دارایی بـەباوەڕ بـەخوا و بـەڕۆژی دوایـی ، چونکە لە ئایەتی پێشوودا فەرموی : مرۆڤـی ڕژد بـاوەڕی بـەخوا و ڕۆژی دوایـی نیـە و بەخشین بەڵگەیە لەسەر باوەڕ بـەخوا و ، خـوا ئـەزانێ بـەکاروکردەوەی ئـەو کەسـانەی دارایی خۆیان بۆ بەرچاوی ئەبەخشن و پاداشتیان ئەداتەوە بەسزای خۆی .

پاش ئەوەی خوا فەرمانی دا بەپەرستنی خۆی و بەچاکەکردن لەگەڵ باوك و دایك و ئەوانەی تر باسیان کرا ، باسی ئەوانەی کرد خۆیان هەڵئەکێشن و بۆ بەرچاو دارایی ئەبەخشن و باسی ئەو کەسانەی کرد چاکەی خوا ئەشارنەوە ، باسی ئەمەیشمان بۆ ئەکا پاداشتی ئادەمیزاد کەم بونەوەی تێدا ناکرێ و ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا ﴿٤٢﴾

﴿ إن الله لا يظلم مثقال ذرة ﴾ بەڕاستی خوا ستەم ناکا لەهیچ کەسێ کێشانە و قورسایی ئەو شتەی دەرئەکەوێ لەکاتی ڕوناکیدا لەکلاو ڕۆچنەوە ، کێشانەی ئەو شتە بەتەرازوی ئاسایی ئێمە دەرناکەوێ . هەندێ لەزانایان ئەڵێن : ووشەی (ذرة) بەمانا مێرولەی سوری زۆر بچوکە .

﴿ إن تك حسنة يضاعفها ﴾ ئەگەر ئەندازەی کێشانەی ئەو زەڕەیە چاکە هەبێ لەناو نامەی کرداردا ، خوا پاداشتەکەی دوو پات ئەکاتەوە بەچەندین ئەندازەی خۆی .

﴿ ویؤتِ من لدنه أجراً عظیماً ﴾ وەخوا ئەبەخشێ بە خاوەنی ئەو چاکەیــە پاداشـتێکی گەورە لـەلایەن خۆیەوە کە بریتیە لـەشتێ هەر خوا ئەندازەی ئــەزانێ .ئـەو ئایەتـە بەڵگەیـە لـەسەر ئەوەی نەبەخشینی پاداشت و کەم کردنەوەی قەدەغەیە ، بەڵگەیشە لـەسەر ئــەوەی خوا توانای هەیە بەسەر ستەم کردندا و نایکـا ، بۆیـە شایسـتەی سـوپاس کردنـی زۆرە ، پاداشتی چاکەکەی خوا تەنها هەر بەهۆی چاکەکردنی خوایە و لـەسەری پێویست نی‌یە .

کاتێ خوای مەزن ڕونی کردەوە بۆمان لەڕۆژی دواییدا ستەم لـەکەس نــاکرێ و بـەبێ گومان پاداشتی چاکەکەران ئەداتەوە بەزۆرتر لـەبەشی خۆیان ، لـەم ئایەتەی دواییدا بۆمــان ڕوون ئەکاتەوە ئەو بەهرە گەورە و پاداشـتە دێـت و ئـەڕوا و ئـەدرێ بـەئادەمیزا بـەهۆی شایەتی‌دانی پێغەمەرانەوە کەبەڵگەی خوان لـەسەر بونەوەران هەتا بەو بۆنــەوە بـێ باوەڕان زۆر تر توشی خەفـەت بـبن ،بـاوەڕدارانیش زۆر دڵخـۆش بـبن بۆیـە بـەو بۆنەیـەوە خـوا ئەفەرموێ :

﴿ فکیف إذا جئنا من کل أمةٍ بشهیدٍ ﴾ دوایی ئەبێ چۆنبــێ بەسـەرهاتی بێ‌بـاوەڕان و ستەم کاران کاتێ ئێمە بهێنین لـەهەموو نەتەوەی پێغەمران شــایەتێ لـەپێغەمـەرانی خۆیـان ، شایەتی بدەن لـەسەر کار و کردەوە و گفتوگۆیان لـەبارەی باوەڕی پوچی بێ باوەڕان .

﴿ وجئنا بك علی هؤلاء شهیداً ﴾ وەئێمە تۆ بهێنین لـەسەر ئەو نەتەوانە شــایەتی بـدەی چ لایەکیان باوەڕدارن و کامەیان بێ باوەڕن ، دەری بخـەی بۆیـان پێغەمـەرەکانیان ڕاسـتن لـەبەجێ هێنانی گەیاندنی فەرمانەکانی خوا ، لـەباسی ماناکردنی ئایەتی (١٤٣) لـەسـورەتی ئەلبەقەرەدا باسی ئەوەمان کردوە کەزانایانی ئیســلام شـایەتی ئـەدەن کەپێغەمـەر فـەرمانی خوای گەیاندووە ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ شایەتی ئەدا زانایانی ئیسلام بەو جۆرە پێویستبێ پـەیامی ئیسلامیان ڕاگەیاندووە .

﴿ یومئذٍ یود الذین کفروا وعصوا الرسول ﴾ ئەو ڕۆژە کـەڕۆژی دواییـە و پێغەمـەران شایەتی تێدا ئەدەن ئاوات ئەخوازن و داوائەکەن کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نـەهێناوە وەبـێ فەرمانی فروستادەی خوایان کردوە لـەو شتانەی فەرمانی داوە بەوان .

﴿ لو تسوى بهم الأرض ولا يكتمون الله حديثاً ﴾ بخرانایە نێو زەوی و تـەخت بکرایـە بەوا زیندو نەکرانایەوە توشـی ئـەم نەگبەتی‌یـە نەبونایـە و ئـەوان ناشـارنەوە لـەخوا هیـچ ڕوداوێ پەیدا بووە لەخۆیان و لـەتوانایان نیـە شـاردنەوەی هیـچ شـتێ لـەخوا و هـەموو ئەندامەکانیان شایەتیان لێ ئەدەن جگە لەشایەتی دانی پێغەمەران .

کاتێ خوای مەزن لەئایەتە پێشووەکاندا فەرمانی دا بەپەرستنی خوا ، ئێستا لەم ئایەتـەی دواییدا فەرمان ئەدا بەگـەورەترین پەرسـتن کـە بریتیـە لـەنوێژ بـەوجۆرەی باسـی ئـەکا ، بەڕێکەوت عەبدولڕەحمانی کوڕی عـەوف بـانگی هـەندێ لەگـەورە پیـاوانی هاوڕێکـانی پێغەمەری کرد بۆ نان خواردن ، لەوکاتەدا مەی خواردنەوە قەدەغە نەکرابوو ، خواردیـان و خواردیانەوە سەرخۆش یوون ، کاتی نوێژ هات یەکێکیان بوو بە پێشـەوای نوێـژ ، ئـەو کەسە بەسەرخۆشیەوە ئاگای لەخۆی نەبوو لەجیاتی ئەوەی بلێ : ﴿ لاأعبد ما تعبـدون ﴾ ووتی ﴿ أعبد ماتعبدون ﴾ ، بۆ قەدەغە کردنی ئەو جۆرە کارانە خوا فەرمووی :

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾

﴿ یاأیها الذین آمنوا لاتقربوا الصلاة وأنتم سكاری ﴾ ئەی كەسانێكی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئێوە نزیكی نوێژ كردن مەكەون و ، ئێوەلەو كاتەدا سەرخۆش بن بەهۆی هەر شتێكەوە بێ .

﴿ حتی تعلموا ما تقولون ﴾ هەتا ئێوە ئەزانن بەشتێ ئێوە ئەیلێین لەقورئان و لەجگەی قورئان و ئەزانن بەماناكانیان .

﴿ ولاجنوبا إلاّ عابري سبیل حتی تغتسلوا ﴾ وەئێوە نزیكی نوێژ كردن مەمكەون لەكاتی لەش پیسیتانا لە هەموو كاتێكا مەگەر ئێوە كاروانی بن و بەڕێگە دا بڕۆن هەتا ئێوە خۆتان ئەشۆرن بەگوێرەی یاسای دیاری كراو .

هەندێ لەزانایان مانای ڕستەی ﴿ ولاجنوبا إلاّ عابري سبیل ﴾ بەم جۆرە كردوە :

ئێوەنزیكی نوێژ كردن مەكەون لەكاتێكا لەشتان پیسبێ دانیشتوبن و لەكاروانا نەبن .

بۆ زانین : هەندێ لەزانایان مانای ووشەی (عابری سبیل) بەجێگەی نوێژ كردوە یانێ ئێوە نزیكی جێگە نوێژ كردن مەكەون مەگەر تێپەڕ بكەن و نەوەستن بەگوێرەی فەرمودەی شافیعی . بەلاّم لای ئەبو حەنیفە ڕۆیشتن بەمزگەوتا دروست نی‌یە بۆ كەسانێ لەش پیس بن مەگەر ئاو لەنێو مزگەوتا بێ یا ڕێگەی هاتوچۆ بەنێو مزگەوتابێ . خوای مەزن لەم ڕستانەی دواییدا باسی چوار هۆمان بۆ ئەكا ئەگەر ئاومان دەست نەكەوت ئێمە تەیەموم بكەین :

١- ﴿ وإن كنتم مرضی ﴾ وەئەگەر ئێوە نەخۆش بوون ، بەبەكارهێنانی ئاو ئێوە ئەمردن لەكاتی تووشبونتان بەهەندێ نەخۆشی وەك ئاولەیە برینەكانی گەورە بی ، یا توشی ئازارێ ئەبون یا نەخۆشیەكەتان درێژەی ئەكێشا یا ئەترسان تووشی ناشیرینی ببن بەگوێرەی ئامۆژگاری پزیشكی تایبەتی .

٢- ﴿ أو علی سفر ﴾ یا ئێوە لەسەر ڕۆیشتن بوون لەكارواندا بوون ، ئیتر ماوەی كاروانی درێژ بێ یا كورت و ئاوتان دەست نەئەكەوت .

٣- ﴿ أو جاء أحد منكم من الْغائِطْ ﴾ یایاکێ لەئێوە هاتەدەرەوە لەئەدەبخانە و بێ دەست نوێژ بوو بوو بەهۆی هاتنە دەرەوەی شتێ لەپاشەوە یا لەپێشەوە مەبەست لەووشەی (الغائط) جێگەیەکی نزمە ئامادەبکرێ بۆ جێبەجێ کردنی پێویستی .

٤- ﴿ أو لامستم النساء ﴾ یا ئێوە بەرِوتی و بەبی پەردە لەشتان کەوت لەلەشی ژنانی بێگانە زانایان لەمەبەستی مانای رِستەی ( لامستم ) بیریان جیاوازە : هەندێکیان ئەڵێن بە مانای چونە لای ژنانە ، هەندێ تریان ئەڵێن بەمانای لەیەکدانی لەشی ژن و پیاوانی بێگانەیە ئیتر بەچونە لای ژن بێ یان نا ؟

﴿ فلم تجدوا ماءً فتيمموا صعيداً طيباً ﴾ دوایی ئەو چوارهۆیانە ئێوە ئاوتان دەست نەکەوت و یا ئاو هەبو . بەڵام نەتان ئەتوانی و نەئەگونجا بەکاری بهێنن لەبەر نەخۆشی یاپێویستان بەو ئاوە هەبو بۆ خواردنەوەی خۆتان و ئەو گیان لەبەرەی لەگەڵتانە ، دوایی ئێوە تەیەموم بکەن بەخاکێکی پاك . یانی ئێوە نیازی خاکێکی پاك بکەن و دستی لێ بدەن .

﴿ فأمسحوا به وجوهكم وايديكم ﴾ دوایی ئێوە دەستی خۆڵاوی بهێنن بەرِومەتو بەهەردوو دەستەکانتان هەتا ئەگاتە هەردو ئانیشکتان .

﴿ إن الله كان عفواً غفوراً ﴾ بەراستی خوا لێبوردنی زۆرە و ئاسان کەری کار و فرمانتانە ، خۆش ئەبێ لەهەڵە و ناتەواویتان .

ئەگەر کەسێ رِەوەند بوو نەخۆش نەبوو ، بەڵام ئاوی دەست نەئەکەوت نوێژەکانی بکا ئایا ئەو کەسە تەیەموم بکا بۆ کردنی نوێژەکانی ، یا لەبنەرِەتا نوێژی لەسەر هەڵئەگیرێ ؟

هەموو پێشەوایان جگە لەپێشەوا حەنەفی لایان وایە تەیەموم بکا و نوێژەکانی بکا لەبەر رِێزی کاتی نوێژ ، لەدواییدا ئاوی دەست کەوت نوێژەکانی بکاتەوە ، بەڵام پێشەوا حەنەفی لای وایە لەبنەرِەتا نوێژی لەسەر هەڵئەگیرێ .

وەك باسمان کرد هەر شتێ لەپاشەوە و لەپێشەوە بێتە خوارەوە دەست نوێژ ئەشکێ جگەی شاوەت ، ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت پێویستە تەیەموم بکا و نوێژەکانی بکا ،

بەلأم شاوەت لەش پیس ئەکا و پێویستە خۆی بشۆرێ و دەست نوێژی هەیە بەمەرجێ بەشتێ تر دست نوێژی نەشکابێ .

لەشی ژن و پیاو لەیەك کەوتن و بێگانەبوون لەیەکتری دەست نوێژیان ئەشکێ ، ئیتر دەست لێدەربێ یا دەست لێدراو ، بەلأم پێشەوایان مالیك و ئەحمەد لایان وایە دەست لێدان بەبێ ئارەزو دەست نوێژ ناشکێنێ . بەلای پێشەوا حەنەفی‌یەوە بەلەیەکدانی شەرمگەی ژن و پیاو نەبی دەست نوێژ ناشکێ ، بەهەرچۆنێ بی ئەگەر ئاویان دەست نەکەوت پێویستە لەسەریان تەیەموم بکەن بۆ بی دەست نوێژی و دەرکردنی لەش پیسی دوایی نوێژەکانیان بکەن .

چۆنیەتی تەیەموم کردن و مەرجەکانی تەیەموم پیچنج شتن :

(١) پەیدا نەبوونی ئاو بەهۆی کاروانەوە یا نەگونجێ بەکارهێنانی ئاو لەبەر نەخۆشی و پێویستی تر .

(٢) هاتنی کاتی نوێژ .

(٣) داواکردن و گەڕان بەشوێنی ئاودا لەکاتی نوێژدا .

(٤) نەتوانری ئاو بەکار بهێنرێ لەبەر ئەو هۆیانەی باسکران .

(٥) خاکێکی پاك و خاوەن تۆز . نەك بەگەچ و بەرد و شوشە و زێڕ و زیو .

مالیکەکان لایان وایە بەهەرشتێ بەرز بێتەوە لەزەوی تەیەمومی پێ دروستە ، وەك خاك و لم و بەرد ،نەك بەردی سوتا و زێڕ و زیو لەکانگاکانیانا بن . لای حەنەفیەکان هەرشتێ لەڕەگەزی زەوی بێ تەیەمومی پێ دروستە جگەی شوشە لۆلۆ و گەچ و پوش درەخت و باوەکو بەردێکی لوسبی . لای حەنبەلیەکان ئەبی تەیەموم بەخاکێ بکری تۆزەکەی بلکێ بەدەستەوە .

پێویستەکانی تەیەموم چوار شتن :

(١) نیازی تەیەموم کردن بەو خاکە و بەرەوا کردنی نوێژ .

(٢) هاوردنی تۆوزی ئەو خاکە بەڕومەتا بۆیەکەم جار بۆی هەلگرێ .

(٣) دووهەم جار تۆز هەڵبگرێ و بیهێنێ بەهەردوو دەستیا هەتاکۆتایی هەردوو ئانیشکی.

(٤) یەك لەدوای یەك بەو جۆرە باسکران ، یانی یەکەم جار نیاز ، دووهەم جار ڕومەت ، سێهەم جار هەردوو دەست بەگوێرەی فەرمودەی شافیعەکان و ئەحمەدی‌یەکان ، لای جگەی ئەوان تەرتیب و ڕێز مەرج نیە .

بەلای ئەوکەسانەوە تەرتیب لایان پێویستە نابێ بەر لەتەواوی شۆردنی ئەندامی یا تەیەموم کردنی بچێ بۆلای ئەندامێ تر ، یانی ئەگەر جێگەیە لەڕوومەت برینـدار بوو ، ئەوەی ساغە بشۆرێ ، پاش وشك کردنەوەی تەیەمومی بۆ بکرێ ، دوایی دەست بکری بەشۆردن و تەیەمومی ئەندامێ تر .

ئەو شتانەی تەیەموم پوچ ئەکەنەوە سێ شتن :

(١) ئەو شتانەی دەست نوێژ پوچ ئەکەنەوە .

(٢) چاوپێکەوتنی ئاو بەر لەدەست کردن بەنوێژ .

(٣) لەئاینی ئیسلام وەرگەڕان .

ئەوکەسەی تەختـەی نابێتە سەر ئەندامێکی تەیەموم لەبەر شکان وەك ڕومەت و دەستەکان ئەوەی ساغە بیشۆرێ و دەستی تەڕ بەسەر تەختەکەدا بهێنرێ ئەگەر نەئەگونجا تەختەکە لابری لەبەر ترسی زیان و ئازار ، پاش ئەوانە تەیەموم بکـا و ئەندامەکانی تری بشۆرێ ونوێژەکانی بکا و نەیان کاتەوە ، ئەگەر تەختەکە لەسەرپاکی دانرابو دوای دەست نوێژ ، ئەگینا ئەبێ نوێژەکانی بکاتەوە .

هەرکاتێ لەبەر بێ ئاوی تەیەموم کراو کاروانی نەبو ، ئەگەر بەگوێرەی تاقی کردنـەوە بە زۆری ئاو لەو جێگەیە پەیدا نەئەبوو ، نوێژەکانیـان بکـەن و نـەیان گێڕنـەوە ، ئەگـەر بەزۆری ئاوی تێدا دەست ئەکەوت بەوێنەی ناو شار و ناو دێهات نوێژەکانیـان بگێڕنـەوە بەیەك تەیەموم دوو نوێژی فەرز ناکرێ ، کەواتە بۆ هەموو نوێژێ ئەبێ تەیەمومێ بکرێ .

ئەو شتانەی ئەبنە هۆی لەش پیسی شەش شتن :

(١)چونە ناو جێگەی خەتەنەی ژن و پیاو بۆ ناویەکتری .

(٢)هاتنە خوارەوەی شاوات بەهەر جۆرێ بێ .

(٣)مردن .

(٤)خوێنی حەیز.

(٥)خوێنی پاش منالّ .

(٦)منالّبونی ژنان .

پێویستەکانی لەش پیسی دەرکردن سێ شتن :

(١)نیازی دەرکردنی لەش پیسی .

(٢)لابردنی پیسی بەسەر لەشەوە ئەگەر هەبوو بەر لەنیاز .

(٣)گەیشتنی ئاو بەهەموو لەشدا بەگۆشت و موویشەوە .

قەدەغەیە لەسەر لەش پیسی چوار شت :

(١)نوێژ کردن بۆ ژن و بۆپیاو و ڕۆژو گرتن بۆ ژنانی خاوەن خوێنی حەیز و پاش منالّ .

(٢)خوێندنی قورئان و دەست لێدانی و هەلّگرتنی .

(٣)گەڕان بەدەوری کەعبەدا .

(٤)وەستان لەمزگەوتا .

قەدەغەیە لەسەر بێ دەست نوێژی سێ شت :

(١)نوێژ کردن .

(٢)گەڕان بەدەوری کەعبەدا .

(٣)دەست لێدانی قورئان و هەلّگرتنی .

کاتێ خوای مەزن باسی ئەو فەرمانانەی فەرموو پێویستە کردنیان ، پاشان هەڕەشە لەو کەسانە ئەکا بۆ دژی ئەو فەرمانانە بانگی دانیشتوان ئەکەن و ئەفەرموێ :

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾

﴿ ألم تر إلى الذين أوتوا نصيباً من الكتاب ﴾ ئایا تۆ هەواڵت پێ نەدراوە و نەتڕوانیوە بۆ لای کەسانێکی ئەوتۆ بەخشراوە بەوان بەشێ لەزانینی نامەکەیان لەتەورات و فێربوونی

ئەو شتانە لەسەر پێغەمەرایەتی و وێنە و ڕەنگی تۆ .

﴿ یشترون الضلالة ﴾ ئەو کەسانە گومڕایی ئەکڕن بەشارەزایی و تۆ بەدرۆ ئەخەنەوە و بۆ خۆیانی هەڵئەبژێرن ، ئەو شتەی دەری ئەبڕن لەژێرەوە و لەدەرونیاندا ئەوەیان مەبەست نیە ، بەڵکو مەبەستیان جنێو دان و گاڵتە کردنە بەتۆ لای هاوڕێکانی خۆیان ، ئـەیان ووت بۆچی ئێوە نازانن ئێمە جنێو و گاڵتەمان مەبەستە بەوڕستانە ئێمــە ئـەیڵێین . خـوای مـەزن مەبەستەکانیان بۆ پێغەمەرو دەرئەخا وئاگاداری ئەکا:

﴿ ویریدون أن تضلوا السبیل ﴾ وەئەیانەوێ کە ئێوەی موســوڵمان لابـدەن لەڕێگـەی ڕاست بەو جۆرەی خۆیان لایانداوە ، ئەو ڕێگەیە ئێوە ئەگەیەنێ بەڕاستی و ڕێگە نومایی .

﴿ واللە اعلم بأعدائکم وکفی باللە ولیـاً وکفـی بـاللە نصـیراً ﴾ وەخـوا زانـاترە لـەئێوە بەدوژمنەکانتان و بۆتانی ڕوون کردۆتەوە و هەواڵی پێداون بـۆ ئـەوەی ئێـوە خۆتانیـان لێ بپارێزن و ، بەسە خوا بۆ دۆستایەتی و سەرداری ئێوە و بەسە خوا یاریدەرتانبێ و سـەرتان بخا بەسەر دوژمنانی خۆتان و نرخ بۆبێ باوەڕان دامەنێن .

دوای ئەوانەی پێشوو خوا ڕونی ئەکاتەوە ڕەوشتەکانیان و ئەفەرموێ:

﴿ منَ الذینَ هادُوا یُحَرِفُونَ الْکَلَمَ عَنْ مَواضِعِهِ ﴾ هەندێ کۆمەڵ هـەن لـە کەسـانێکی ئەوتۆ خاوەنی ئایینی جولەکەکان ئەگۆڕن فەرموودەکانی خواو لایان ئەبەن ئەوەی خۆیـان بیانەوێ ئەیخەنە جێگەکانیان، مانایان ئەکەن بە گوێرەی ئارەزۆی خۆیان.

﴿ وَیَقُلُونَ سَمِعْنا وَعَصَیْنا ﴾وە ئەو کەسانە ئەڵێن: ئێمە گفتوگۆی تۆ ئەبیسـین و، ئێمـە بێ فەرمانی تۆ ئەکەین و باوەڕت پێ ناهێنین.

﴿ وَأسْمَعْ غَیْرَ مُسْـمَعٍ وراعنـا لیـاً بِألْسِـنَتِهِمْ وَطَعناً في الدیـن ﴾ وەئـەیان ووت: تـۆ گفتوگۆی ئێمە ببیسە، بە جۆرێ ولآمـت نەدرێتـەوە بـە چاکـە و، چـاودێری ئێمـە بکـە، ئەوانەیان ئەووت: لەبەر ئەوەی بە زمانی خراپی خۆیان ڕاستی لابدەن بۆلای کـاری پـوچ و، لەبەر ئەوەی تانەیدەن لە ئاین.

زانایان ئەڵێن: جولەکەکان مەبەستی نهێنیان لە ڕستەی (راعنا) جنێودانبوو پێغەمبەر چونکە لە زمانی عیبریدا بە مانا نەفام و ئەحمەقە. ئەو شتانەیان ئەووت لەبەر ئەوەی بە زمانی خۆیان ئەم لاولای پێ بکەن و ڕاستی بشارنەوە، ئەوەی دەریان ئەبڕی کە گوایا چاودێری کردنیان مەبەستە لە دەرونیانا ئەوە نەبوو بەڵکو مەبەستیان نەفامی، و ئەو شتانەیان ئەووت لەبەر ئەوەی تانە بدەن لە ئایینی ئیسلام و سوکایێتی پێ بکەن.

بۆ زانین: خاوەنی تەفسیری ئەلمەنار ئەفەرموێ: زانایان دەریان خستوە گۆڕینی نامەکانی پەیمانی کۆن و پەیمانی تازە بە چەندین بەڵگەی زۆر...... لە نامەی (إظهار الحق) دانراوی شێخ ڕەحمە تولای هیندی سەد بەڵگەی لەسەر گۆڕینیان هێناوە بە ووشەو بە مانایانەوە. شێخ جەوادی بەلاغی نامەیەکی بە نرخی لە بارەی گۆڕینیانەوە داناوە ناوی ناوە (الرّحلة المدرسّية).

﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَانْظُرْنَا لَكَانَ خَيْراً لَهُمْ وَأَقْوَمَ ﴾ وە ئەگەر جولەکەکان بیان ووتایە ئێمە فەرمودە تۆ ئەبیستن و پەیڕەویت ئەکەین و، بیان ووتایە تۆ چاوەڕووانی ئێمە بکە، لە باتی ئەوەی هەر ووشەی (وَاْسْمَعْ) یان بووتایە بەبێ (غير مُسْمَعٍ) بە ڕاستی ئەمانە چاکتر بۆ ئەوان و ڕاستر و شایستە تر بۆیان لەوانەی پێشویان.

﴿ وَلَكِنْ لَعَنَهُمْ اللهُ بِكُفْرِهِمْ ﴾ وەبەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان هەر ئەو ڕستانەیان ئەووت خۆیان مەبەستیان بوو، بەردەوامبوون لەسەری خوا ئەوانی دورخستەوە لە بەزەیی و میهرەبانی خۆی بە هۆی بێ باوەڕی خۆیانەوە.

﴿ فَلا يُؤْمِنونَ إِلاَّ قَلِيلاً ﴾ دوایی ئەو کارانە ئەوان باوەڕ ناهێنن مەگەر کەمێ لەوان باوەڕ ئەهێنن، وەك عەبدولای کوڕی سەلام و هاوڕێکانی.

ئەو ڕستەیە بۆمان دابین ئەکا جولەکەکان کەمێکیان باوەڕ ئەهێنن لەمەوبەرو لەمەو دووایش. بەڵام جگەی ئەوان لە کۆن و لە تازەدا هەموو نەتەوەو خاوەن ئایینەکان پۆل پۆل ئەهاتن و ئەیشدێن باوەڕ ئەهێنن، ئەوەیش هەواڵێکی نهێنیيە خوا هەواڵی پێداوە. بەداخەوە کار بەدەستان بەبێ جیاوازی دوژمنی خۆیان ناناسن یا خۆیانی لێ گێل ئەکەن لە پاش ئەو

کردارەی جولەکەکان، خوا ڕوئەکاتەوە بۆلای خاوەن نامەکان و هەڕەشەیان لێ ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ يأأيها الذينَ أوتُوا الكِتابَ أمنوا بِما نَزَلنا مَصَدِقاً لِما مَعَكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ بەخشراوە بە ئێوە نامەی خواکە تەوراتە ئێوە باوەڕبهێنن بەشتێ ئێمە ناردومانە بۆ سەر موحەمەد کە بریتیە لە قورئان بە ڕاست گێڕە لە بۆشتێ‌لەگەڵ ئێوەدایە کە تەوراتە، ناوەڕۆکیان یەکە لە سەرچاوەدا لە چیرۆکە مێژوەکاندا لە هەڕەشەکردن و موژدەداندا بە ئادەمیزاد هەردوکیان یەکێتی تەنهایی خوا بلاو ئەکەنەوە، داوای دادپەروەری ئەکەن لەنێو ئادەمیزادا، لە قەدەغەکردنی گوناهەکان. ئەگەر جیاوازیان هەبێ لە هەندێ یاسادا لەبەر بەرژەوەندی سوودی ئادەمیزادەبە گوێرەی کات و جێگە، ئەوەیش بەشێکە لە میهرەبانی خوا بۆیان بەلام لە بیروباوەڕی بنچینەکاندا جیاوازیان نیە.

قورئانی پیرۆز لە سەرەتای ئیسلامەوە هەتا ڕۆژی دوایی بانگی هەموو ئادەمیزاد ئەکا بەبێ جیاوازی بە تایبەتی خاوەن نامەکان بە باوەڕ هێنان بە ئایینی پاکی ئیسلام کە ڕاستەو لەلایەن خواوە هاتووە. بە دەیان بەلگەی ڕون جار لە دوای جار بۆیانی دوپات ئەکاتەوە، بەلام بێ باوەڕان لە ڕاستیەوە دوورن. ئەوان جگە لە قازانجی تایبەتی و کۆکردنەوەی دارایی بڕوایان بە هیچ شتێ تر نیە، لە ئاینی ئیسلامدا ئەو قازانجەیان بۆ دەست نادا، ئەو جۆرە کەسانە جگە لە تالان و دەست بڕین مەبەستی تریان نیە، لەم سەردەمەدا بەکرێ گیراوی زۆریان هەیە. ئەی ئەو کەسانەی خاوەنی نامەن ئێوە باوەڕ بهێنن بە قورئان کە ڕاست گێری نامەکانتانە.

﴿ مِنْ قَبْلَ أنْ نَطْمِسَ وُجُوهاً فَنَرُدَّها عَلى أدْبارها ﴾ لە پێش ئەوەی کە ئێمە نەخشەو نیشانەی ڕومەتەکان بگۆڕین و چاوودەم و و برۆو گوێچکە و لوتیان نەیەلێن، دوایی ئێمە ڕومەتەکان بگێڕین لەسەر وێنەی پشتەوەیان، چۆن لە پشتەوە هیچ نابینن، لە پێشەوەیش هیچ شتێ نابینن.زانایان مانای جیاوازی زۆریان کردووە بۆ ئەو ڕستانە لە هەموویان بەهێزترە بەم جۆرەیە... یانێ ئێوە باوەڕ بە قورئان بهێنن لە پێش ئەوەی ئێمە ڕێگەتان لێ

وون بکەین بە جۆرێ نەتوانن ڕو بکەن بۆلای نیازو مەبەستەکانی خۆتـان، بـە وێنـەی ئـەو کەسانەی بەرەو پاش بڕۆن هەموو کاتێ بیانەوێ بەرەو پێش بڕۆن ئەکەون بەدەما.

﴿ أو نَلْعَنَهُمْ كما لعنا أصْحابَ السبت وَكانَ أمْرُ اللهِ مفْعُـولاً ﴾ یـا ئێمـە ئـەو خـاوەن نامانە دور ئەخەینەوە لـە بەزەیی و میهرەبانی خۆمان، وەك دورمان خســتەوە یـارانی ڕۆژی شەممە، یارانی ڕۆژی شەممە کەسانێ بوون لـە جولـەکەکان ئاییـنیان گـۆڕی و لــە سـنووری خوا دەرچوون خوا تۆڵەی لێ کردنەوە لـە جیهانداو کردنی بە مەیمون و بەراز، بەرگی بـێ نرخی ئەکەینە بەریان، گوێچکەیان کەڕ ئەکەین ڕاستی نەبیسن، چاویان کوێر ئەکەین ڕێگە نادۆزنەوە.

خوای مـەزن بـەو ئایەتـە جولـەکـەکان ئەترسـێنێ ئەگـەر واز نەیـەنن لــە گومڕایـی و گومڕاکردن چۆن پێشوەکانیان کران بە مەیمون ئەمانیش وەك ئەوان بێ هۆش و بێ گـۆش ئەکەین.

فەرمانی خوا بە سزادانیان کراوەو براوەتەوەو کەس ناتوانێ بەر هەڵستی فـەرمانی خـوا بکا.

ئەگێڕنەوە کە وەحشی و هاوڕێکانی هەمزەیان کوشت پەشـیمان بوونـەوە لەسـەر ئـەو کوشتنە، لـەو باوەڕەوە نامەیان بۆ پێغەمەر نوسی و پەشـیمان بونـەوەیان دەربـڕی، ووتیـان ئێمە بیستومانە لـە جەنابتەوە هەرکەسێ پیاو کوژبێ و هاوبەشی بۆ خوا دانابێ باوەڕهێنــانی لێ وەرناگیرێ، بەو بۆنەیەوە خوا فەرموی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ﴾

وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾

﴿ إن الله لا يَغفرِ أنَ يُشْرَكَ بهِ ويغفر ما دونَ ذلِكَ لِمَنْ يَشاءَ ﴾ بە ڕاستی خـوا خۆشـی نابێ لـە کەسێ هاوبەشی بۆ خوا دانابێ لـە پەرستنی ئەگەر بمـرێ باوەڕنەیـەری و پەشـیمان نەبێتەوە لـە هاوبەشدانان و، خوا خۆش ئەبێ لـە جگەی هاوبەشدانان لـە گوناهە گـەورەکان و لـە گوناهە بچوکەکان، بە میهرەبانی خۆی پەشیمان بونەوە وەرئـەگرێ. بـەڵام نـەك بـۆ هەموو کەس. بەڵکو بۆ کەسێ ئارەزۆی هەبێ بە هۆی پەرستنی خواوە ئەو لێـی خۆشـبونە وا ئەبێ بەر لـە سزادانەو وائەبێ دوای سزادانی گوناهەکانە، وایش ئەبێ بە هۆی پاڕانەوەی دوستێکی خوا ئەبێ، وا ئەبێ بە هۆی پەشیمان بوونەوە ئەبێ بە تەنها، وا ئەبێ خـوا خـۆش بێ بە مەرجێ باوەڕی ڕاستی لـە بەندەوە پەیدا بێ.

مەبەست لـە هاوبەشدانان لـەو ئایەتەدا بریتییە لـەوە بڕوای وابێ چەند خوابـێ هـەن، یـا هەر بڕوای بە بوونی خوا نەبێ.

﴿ ومَنْ يُشْرِكْ بِالله فَترِ أفْترى إثما عظيمـاً ﴾ وە هەرکەسـێ هاوبـەش بـۆ خـوا دابنـێ، دوایی بە ڕاستی ئەو کەسە هەڵی بەستووە گوناهێکی گەورە، هەموو درۆیێ بەرانبـەر ئـەو درۆیە بچوك و لاوازە، چونکە ئەو کەسە باوەڕی بەشتێ هەیە نەبووەو نایشبێ.

بەهێزترین بەڵگە لـەسەر یەکێتی خوا ئەمەیە: ئەگەر لـە ئاسما ن زەوی‌دا جگەی خوا خوا تر ببوایە ئاسمان و زەوی ڕانەئەوەستان و خۆیان و ئەو شتانەی بەسەریانەوەن و ئـەوەی لـە ناویانا پوچ ئەبوون و نە ئەمان و هیچ کارێ ساختەی نەئەهات، ئەو کارەیەش زۆر ڕاسـتە، چونکە ئەگەر دوو خوا هەبێ ئەبێ هەردووکیان خاوەن توانابن، بە گوێرەی توانای خۆیـان یەکێ لـەو خوایانە ئەیەوێ شتێ ببێ دژی ئەو شتەبێ ئەویی تریان ویستوێتی یانێ یـەکێکیان

بیەوێ شتێ دروست بکا، ئەوی تریان بیەوێ دروستی نەکا، ئەگەر هەردوو ویستە کە بێتە دیی بە یەکەوە لەیەك کاتا بوون و نەبوون کۆ ئەبنەوە بەیەکەوە، ئەوەیش نابێ و ناگونجێ، ئەگەر خوا ستی یەکێکیان بێتە دیی، ئەبێ ئەوی تریان بێ توانای ئەبێ، بێگومان بێ توانابێ بۆ خوا نابێ، ئەگەر ویستی هەردووکیان نەیەنەدیی ئەبێ هەردووکیان بێ توانابن. ئەوەی باسکرا پوختەی فەرمودەی (لَوْكَانَ فِيهِا آلِهَةٌ إلاّ اللهُ لَفَقَدَنا).

پرسیار/ ئەگەر ببێژرێ: خوا یەکە. بەڵام سێ ئوقنومە: باوك. کوڕ. روحولقودس. ئایا ئەو ووشانە چۆن مانا ئەکرێن؟ ئایا لەو بابەتەیە ببێژرێ خوا یەکە یا لەو بابەتەیە ژمارەی خوا زۆربن؟

وەڵام/ ئەبێ پرسیار لە بوێژەکەی بکرێی مەبەستی چ شتێکە؟ ئەگەر مەبەستی لەو ئوقنومانە چەندین شێوەبن بۆشتێ. وێنەی (الرّحمن الرّحيم الغفار) ئەوە لەو بابەتەیە ببێژرێ خوا یەکە، ئەگەر مەبەستی سێ کەسی سەربەخۆ یاسێ بنچینە ئەمەیان لەو بابەتەیە ببێژرێ هاوبەش دانانە بۆ خوا. بەڵام بەکارهێنانی کوڕو باوك ئەوەمان پیشان ئەدا لەیەك جوێی بن... ئەوە لەلایەوە لەلایی ترەوە ئوقنوم بە مانا ئەسڵەبا بە مانا کەسێکە، ئەوەیش ئەوە ئەگەیەنێ خوا زۆربن، سەرەڕای ئەوانە هەڵواسینی وێنەی مەریەمە لە پەرست کاناو چەندین وێنەی ترو هەڵگرتنی مەریەمە منالێ کە ئاماژە بۆ عیسا ئەکا ئەومان پیشان ئەدا خوا زۆربن...

پاپای ئەم سەردەمەی ساڵی (١٩٨٧) زایینی لە گفتوێکی ساڵانەیدا بە بۆنەی سەری ساڵیانەوە ووتی: ئێمەو موسڵمانان ئاینەکەمان یەك سەرچاوەیان هەیە. بەڵام بە داخەوە موسڵمانان ناڵێن: عیسا کوڕی خوایە، ئەو وتەی پاپایە ئەوە ئەگەیەنێ خوا لای ئەوان زۆربن.

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الذِينَ يُزَكُّونَ أنْفُسَهُمْ بَلِ اللهِ يُزكـيّ مَـنْ يَشـاءُ ﴾ ئایا تۆ هەواڵت پێ نەدراوەو نەنراو نیوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان ئەپاڵێون و خۆیان بە چاك ئەزانن و ئەڵێن پەرستن و خۆ پارێزیمان لە خراپە زۆرن ئەو داوایەی ئەوان بڕوای پێ ناکرێ، بەڵکو

خوا پاك ئەكاو ئـەپاڵێوێ کەسـێ ئارەزۆی هـەبێ و شـایانی ئـەوەبێ پـاکی بکاتـەوە لـە گوناه.جولـەکەکان خۆیانیان پاك ئەکردەوە لـە خراپەو ئەیان ووت ئێمە گەلی هــەڵبژاردەی خواین و خوا هەر خوای ئێمەیە بە تەنها، ئادەمیزاد هەموویان بەندەی ئێمەن. چـەند ڕۆژێ ئەچینە دۆزەخ. سـەرەڕای ئەوانـەبێ شـەرمانە ئـەیان ووت: خـوا هـەژارەو ئێمـە خـاوەن سامانین. خۆ بەچاك زانین بەو جۆرەی باسکرا زۆر خراپە. بەڵام ئەگـەر کەسـێ بـە نیـازی پاکەوە بڵێ: من باوەڕدارم ئەوە بە خراپ دانانرێ، بگرە هەواڵدانە بەو شتەی خوا بــەوی داوە، جۆرە سوپاسێکە بۆ خوا.

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە ئـەوەبوو، هـەندێ لـە پیاوەکـانی جولەکـە بـە منداڵەکانیانەوە هاتنە خزمەت پێغەمەر ووتیان: ئایا ئەم منالاّنە کوناهبارن پێغەمەر فـەرمووی: گوناهبارنین. ووتیان: بەخوا سـوێند ئـەخۆین ئێمـە وەك ئـەو منالاّنـە بـێ گونـاهین، ئـەو گوناهەی بەڕۆژا ئەیکەن لە شەودا خوا لەسەرمان هەڵدەگرێ، ئەوەی بە شەو بیکــەن لـە ڕۆژدا لێمان ئەبورێ، خوای مەزن بەو ئایەتە وەڵامی درۆکانیانی دایەوە.

﴿ وَلا يُظْلَمُونَ فَتِيلاً ﴾ وە ئەو کەسانەی بە نارەوا خۆیان بەبێ گوناه دائـەنێن سـتەمیان لێ ناکرێ بـە ئـەندازەی ئەدەزولـەیـە لــە نێـو چـالاّیی دەنکـە خورمادایـە، هـەروەها ئـەو کەسانەیش خوا پاکیان ئەکاتەوە ستەمیان لێ ناکرێ.

ئەو ئایەتە هەرچەندە دەربارەی جولەکەکان هاتوەتـە خـوارەوە. بـەڵام هـەموو کەسـێ ئەگرێتەوە خۆی بەبێ گوناه دابنێ. تاقی کردنەوە بۆمانی دەرخستووە هەرکەسـێ چاکـەی خۆی بڵێ هۆی نەزانین و لێی تێك چوونێتی، یا خراپەیـەکی تێدایـە ئەیـەوێ بـە درۆ ئـەو خراپەیە بشارێتەوە.

﴿ أنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللهِ الْكَـذِبَ وَكَفَـى بِـهِ إِثْمـاً ﴾ تـۆ تەماشـا بکـە چـۆن ئـەو جولەکانە درۆو بوختان دروست ئەکەن و ئەیدەنە بەسـەر خـوادا ئـەڵێن: ئێمـە لای خـوا پاکین و گەلی هەڵبژاردەی خواین و کوڕو خۆشەویسـتی خوایـن و، بەسـە ئـەو گومـان و بەختانانە لەلایەن گوناهەوە هیچ گوناهێ لەو گوناهە گەورەترنیە.

جولەکەکان زۆر جاران دەستیان ئەکرد بە خراپە ووتن دەربارەی ئایینی ئیسلام کە بە گورجی پەرەی سەندبوو، بە جۆرێکی ناپەسەند ڕێزی پت پەرستیان ئەدا بەسەر پەرستنی خواداو ئەیشیان زانی درۆ ئەکەن، بۆ نموونە کەعبی کوڕی ئەشرەف لەگەڵ کۆمەڵێ لە جولەکەکان چون بۆ مەکە بۆ ئەوەی بن بە هاوسوێندی قوڕەیشیەکان لەدژی پێغەمەرو هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، لەگەڵیان جەنگ بکەن لە دژی موسڵمانان، لە کاتی سوێندخواردندا قوڕێشیەکان ووتیان: ئێوە کە خاوەنی نامەن لە موحەممەدەوە نزیکترن، لە فێڵی ئێوە ئاسودە نین، بۆ ئەوەی ئێمە بڕواتان پێ بکەین ئەبێ کوڕنوش بۆ پتەکان ببەن، جولەکەکان کوڕنوشیان بردە بەر بتەکانیان کە یەکێ لەو بتانە ناوی (جبت) بوە کاتێ ئەبو سوفیان ووتی: ئێمە ئاژەڵەکانمان سەر ئەبڕین و گۆشتەکانیان دەرخواردی میوانی ئەم خانەی خوایەی ئەدەین و میوان ڕائەگرین و دەست گیرۆیی هەژاران ئەکەین و سەر لە خزمانمان ئەدەین، خانەی خوا تازە ئەکەینەوەو بە دەوریا ئەسوڕێینەوە، ئێمە خێزانی ئەم خانە پیرۆزەین، موحەممەد وازی لە ئاینی باو باپیرانی خۆی هێناوە، وازی لە سەردانی خزمانی خۆی هێناوە، خانەی خوای بەجێ هێشتوە، ئاینی ئێمە کۆنەو ئاینی موحەممەد تازەیە، کەعبی کوڕی ئەشرەف ووتی: بەخوا سوێند ئەخۆم ڕێگەی ئێوە ڕانمویی ترە لەوەی موحەممەد لەسەریێتی. خوا لە وەڵامی ئەواندا فەرموی:

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلی الذِینَ أوتُوا نَصِیبا مِنَ الْكِتابِ یُؤمِنُون بِالْجِبْتِ ﴾ تۆ هەواڵت پێ نەدراوە نەتڕوانیوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ بەخشراوە بەوان بەشی لە نامەی خوا کە تەوارتە باوەڕ ئەهێنن بە بتەکان و بە هەموو شتێ بپەرسترێ لە جگەی خواو باوەڕ ئەهێنن بەو بتانە قورەیشیەکان ئەیان پەرستن.

﴿ وَالطاغُوتِ ﴾ و باوەڕ ئەهێنن بە هەموو پەرستراوێکی پوچ و بڕوا ئەهێنن بە شەیتان. ئەو کەسانە ئەو پەڕیان گرتووە لەبێ فەرمانی خواداو یاریدەی قورەیشیەکان ئەدەن لە دژی ئایننی خوا، ئەبنە هاوکاریان لە پەرستنی ئەو شتە پوچانەو کوڕنوشیان بۆ ئەبەن، هەر لەبەر دڵی بت پەرستان و ئەیشزانن پوچ و بێ نرخن.

﴿ وَیَقُولونَ للذِینَ كَفَرُوا هؤلاء أهْدی مِنَ الذینَ آمَنُوا سَبیلاً ﴾ وە جولەکەکان ئەڵێن بە کەسانێ باوەڕیان نەهێناوە لە قورێشیەکان: ئەو بت پەرستانەی قوریش دانیشتوی مەکەن شارەزاو ڕانموییی ترن بۆ ڕاستی لەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە بە موحەمەد لەلاین دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست.

﴿ أوْلئِكَ الذیْنَ لَعَنَهُمُ الله ﴾ ئەو جولەکانەی ئەوتۆ بە دووڕوی بڕوایان هێنا بە بتەکان هەر لەبەر دوژمنایێتی موسڵمانان کەسانێکی ئەوتۆن خوا بێ بەشی کردون لە بەزەیی و میهرەبانی و ڕیسوای کردوون.

﴿ وَمَنْ یَلْعَنِ الله فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبیلاً ﴾ وەهەر کەسێ خوا دووری بخاتەوە لە بەزەیی خۆی دوایی دەستی ناکەوێ بۆ خۆی هیچ ڕێگەیە بۆ ڕزگارکردنی لە سزای خوا.

خوای مەزن لە ئایەتی (٤٤) دا باسی جولەکەکانی بە گومڕای و بە گومڕاکردنی ئادەمیزاد کردووە، لە ئایەتی (٤٥)دا باسی کردن بە دوژمنایێتی کردنی موسڵمانان. لە ئایەتی (٤٦)دا باسی کردن بە گۆڕینی نامەکان و پێچدانی زمانیان بەم لاوبەولادا. لە ئایەتی (٤٩)دا باسی کردن بەوە خۆیان پاك ئەکردەوە لە گوناە. لە ئایەتی پەنجادا باسی کردن بە هەڵبەستنی بوحنان. لە ئایەتی (٥١)دا باسی کردن بەوە ڕێزی بت پەرستیان ئەدا بەسەر خواپەرستیدا.

لەم ئایەتی دواییدا باسیان ئەکا بەوەی تەماشای پێغەمــەرو هاورێکـانی پێغەمـەر ئەکـەن بەدڵ پیسی و ڕقەوە ئاواتیان ئەخواست ئەو کارە چاکەی دراوە بە پێغەمەر بدرایـە بـەوان، ئەیان ووت: ئێمە شایستەترین بۆ پێغەمەرایــەتی، بۆیـە خـوای مـەزن وەڵامیـان ئەداتـەوەو ئەفەرموێ:

أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَىٰ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۖ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾ فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾

﴿ أمْ لَهُمْ نَصيبٌ مِنَ الْمُلْكِ ﴾ ئایا چـۆن ئـەبێ بـۆ ئـەو جولـەکانـە هـەبێ بەشـێ لـە پاشایەتی و سامان لـە جیهاندا. ئەو فــەرمودەی خوایـی لــەوەوە هـاتووە جولـەکان ئـەیان ووت: ئێمە شایستەترین بە پاشایێتی و پێغەمەرائێتی، ئێمە پەیڕەویی موحەمەد ناکەین:

﴿ فَأذا ألاّ یُؤْتُونَ النّاسَ نَقيراً ﴾ دوایی ئەگەر بۆ ئەوان هەبێ پاشایێتی و سامان ئەو کاتـە نایدەن بە هیچ کەسێ لـە ئادەمیزاد بە ئەندازەی قوڵای پشتی دەنکێ خورما کە ئەو جێگەیە خورمای لێ ئەڕوێ. ئەو ئاواتەیان بهاتایەتەدی موسڵمانانیان لەناو ئەبردو نــەیان ئەهێشـت ئاینی ئیسلام پەرە بسێنێ. کارێکی تری خراپی جولـەکەکان ئەمەیە کە خوا ئەفەرموێ:

﴿ أمْ یَحْسُدُونَ النّاسَ على ما أتاهُمْ اللهُ مِنْ فَضْلِهِ ﴾ بەڵکو جولـەکان حەسـادەت ئـەبن بە ئــادەمیزاد لەسـەر شـتێ خـوا بەخشـیویەتی بـەوان لــە گـەورەیی خۆیـی و بەخشـینی

پێغەمەرایێتی بە موحەممەدو پەرەسەندنی ئایینی ڕاست و موسڵمانان، ئەیان ووت: چۆن ئەبێ موحەممەد نۆ ژنی هەبێ ئەگەر پێغەمەربێ فەرمانی خوا وازی پێ ئەهێنا لە ژنان و خەریك نەئەبوو بەکاری ژنانەوە. خوای مەزن وەڵامییان ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ فَقَدْ آتَيْنا آلَ إبْراهِيمَ الْكِتابَ وَالنُبُوة ﴾ دوایی ئێمە بە ڕاستی بەخشیومان بە منالەکانی ئیبراهیم نامەی خوا کە تەوراتە بۆ موساو زەبوورە بۆ داود، وە پێمان بەخشیون پێغەمبەرایەتی.

﴿ وآتَيْناهُمْ مُلْكاً عَظِيماً ﴾ وە ئێمە پێمان بەخشیون پاشایەتی و سامانی زۆر بە وێنەی داودو سولەیمان و یوسوف، ئەوانە بەو دەسەڵاتە زۆرەوە لەکاری پێغەمەرایەتی ئەوانی کەم نەکردەوە. ئیتر بۆ ئەبێ ئێوە بە دووری بزانن پێغەمەرایێتی و ژن هێنان دژی یەکتری بن.

پاش ئەوەی وڵامی جولەکەکان و درایەوە بەوانەی پێشوو، خوای گەورە باسی ئەمەیشمان بۆ ئەکا جولەکەکان و هەموو نەتەوەی پێغەمەرەکان ئەبن بە دوو بەشەوە:

﴿ فَمِنْهُمْ مَنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ صَدَ عَنْهُ وكَفى بِجَهَنَمَ سَبيراً ﴾ دوایی هەندێ لە جولەکەکان و لە پەیڕەوانی پێغەمەرەکانی تر باوەڕیان هێناوە بە موحەممەدو بە پێغەمەرەکانی ترو، هەیانە وازیان هێناوە لە پێغەمەرو لە پێغەمەرانی ترو باوەڕیان پێ ناهێنن و، بەسە دۆزەخ بە ئاگرێکی سوتێنەرو گڕدار کە سزای ئەوانەی پێ بدرێ باوەڕ بە موحەممەدو پێغەمەرانی تر نایەنن.

بۆزانین: موسڵمانان دەسەڵاتیان پەیدا کرد. بەسەدان ساڵ درێژەی کێشاو بڵاوبوویەوە بە ڕۆژهەڵات و بە ڕۆژئاوادا. جولەکەکان هەندێ بوون لەژێر دەستەی موسڵمانان، لەو کاتەدا دادپەروەری باڵی کێشا بوو بەسەریانا و ئەوپەڕی چاودێری ئەکران ئەوان و خاوەن نامەکانی تریش بە جۆرێ زانایانی خاوەن ویژدان بە زەقی باسی ئەو مەبەستەیان کردووە (غوستاف لوبون) زاناو مامۆستای کۆمەڵایەتی فەرەنساوی ئەڵێ: هیچ نەتەوەیەکی سەرکەوتوم نەناسیوە میهرەبانترو خاوەن بەزەیی تربێ لە موسڵمانان بۆ ژێر دەستەی خۆیان. جگەی ئەو زانای زۆرتر هەن ئەو شایەتیە بدەن.

لەمەوبەر، باسی باوەڕداران و بێ باوەڕان کرا ئێستایش موژدەو هەڕەشەکردن بۆ باوەڕداران و بێ باوەڕان ڕون ئەکرێنەوە، یەکەم جار باسی بێ باوەڕان و جۆری سزاکانیان ئەکاو ئەفەرموێ:

إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۖ لَّهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾

﴿ إن الذينَ كَفَرُوا بآياتِنا سوفَ نُصْلِيهِمْ ناراً ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بە نیشانەو بەڵگەکانی ئێمە لەسەر یەکێتی ئێمەو ڕاستی قورئان و پێغەمەرو بوونی فریشتەکان و دۆزەخ و بەهەشت و بە پێویست بوونی نوێژو ڕۆژو و زەکات و لەسەر قەدەغەکردنی داوێن پیسی و مەی خواردن و بێ فەرمانیەکانی تر ئێمە ئەیان خەینە نێو ئاگرو ئەیان بژێنین بەو ئاگرە، بەڵام چۆن ئاگرو سزایە؟.

﴿ كُلَما نُضْجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَلْنا جُلوداً غَيْرَها لِيَذُوقُوا الْعَذابَ ﴾ هەموو کاتێ پێستەکانیان سوتاو دارزاو توایەوەو وایان لێ هات نیشانەیان نەما ئێمە ئەگۆڕین بۆ ئەو کەسانە چەندین پێستی تر جگەی پێسە سوتاوەکانیان و لەشەکانیان هەروەك خۆیان ماونەتەوە لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە بچێژن سزاو ئازاری ئەو ئاگرە بە سەختی و بە گرانی.

﴿ إنَّ اللهَ كانَ عَزيزاً حَكِيماً ﴾ بەڕاستی خوا زۆر گەورە بەدەسەلاتە و کەس ناتوانێ ڕێگەی لێی بگرێ بۆ سزادانی بێ باوەڕان هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و شیاوی سزادانن.

ئەو جۆرە سزایانە لەو ئایەتەدا باسکرا بۆ ئەو کەسانەیە لایان وایە خوا هەرنیەو بۆ ئەو کەسانەیشە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن و ئادەمیزاد لە خراپەیان ئەترسن، خاوەن زاناکان ئەڵێن: ئەو کەسانەی ئەچنە دۆزەخ هەرگیز نایەنە دەرەوە شەش تاقمن:

١- ئەو کەسانەی داوای خوایێتی ئەکەن، وەك فیرعەون و نەمرود.

٢- ئەو کەسانەی باوەڕیان بە بوونی خوا نیە.

٣- ئەو کەسانەی هاوبەش بۆ خوا دائەنێن لە پەرستنیدا.

٤- ئەو کەسانەی دووڕون.

٥- ئەو کەسانەی بە ناڕەوای بێ تاوانان ئەکوژن و بە قەدەغەی نازانن (٦) ئەو کەسانەی بڕوایان بەو شتانەبێ خوا پێویستی کردوون یا قەدەغەی کردون وەکو نوێژو داوێن پیسی زۆر ڕوون ئاشکرایە ئەو کاسانەی دووڕوون لە هەموان خراپترن. هەروەها خراپتر لە هەمووان ئەو کەسانەن کە جەنگ ساز ئەکەن و دەستی دانیشتوانی پێوە ئەکەن بە بیانوی خراپی خۆیان ئاسایش ئەپارێزن کەچی لە ناوڕۆکا مەبەستیان ئەوەیە گەلان بکەن بە بەندەی خۆیان بە ناوی پاراستنی سەربەستی و سامان و دارایی ئەخۆن بە ناوی بوژانەوەی ڕادەی ژیانیان بەو ناوەو داوێن پیسی و بێ ناموسی بلاوئەکەنەوە بە گومانی ژەهراوی خۆیان پێش کەوتن و گەشەکردن و شارستانیەتە.

خوای مەزن لە پاش باسی بێ باوەڕان و ئاگری دۆزەخ باسی باوەڕداران و بەهەشتمان بۆ ئەکا ئەفەرموێ:

﴿ وَالذِين آمنُوا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بە قورئان و موحەمەد بەڵگە ڕونەکانی خوا، باوەڕیان بەو کارانە هەیە بە جگەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ناکرێن

و باوەڕیان بە هەموو پێغەمەران و نامەکانی خوا هێناوەوو کردەوە چاکەکانیان کردووە بە گوێرەی ئەو فەرمانەی پێیان سپێردراوە.

﴿ سَنُدْخِلُهُمْ جَناتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِها الأنْهارُ خالِدِينَ فيها أبَدا ﴾ ئێمە لەمەودوا لە ڕۆژی دوایدا ئەیان خەینە نێو چەندین بەهەشت ئەچێ بە ژێر درەختەکانی و ئەم لاو لای کۆشکەکانیدا چەندین ڕووباری ئاوبی شیرین و ڕون بەردەوامن لەنێو بەهەشتانەدا هەتا هەتایە و نایەنەدەرەوە.

﴿ لَهُمْ فِيها أزْواجٌ مُطَهَرَةٌ ﴾ بۆ ئەو باوەڕدارانە هەیە لەنێو ئەو بەهەشتانەدا چەندین هاوسەرو ژنانی پاکۆکراو لەو شتانەی بێزیان لێ ئەکرێتەوە، لە چلك و چەپەڵی و خوێنی حەیزو پاش منالّ و بۆنی ناخۆش و لە کینەو دڵ پیسی و هەوێی سازی و شتی خراپی تر.

﴿ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلاً ظَلِيلاً ﴾ وە ئێمە ئەو باوەڕدارانە ئەخەینە نێو سێبەرێکی چڕی بەردەوام خۆر لاینا باو گەرما ئازاریان نادا، باخانەکانی ئەو بەهەشتانە پڕن و لقەکانیان چوون بەناویەکاو بۆشیاییان تێدانیە و فێنك و خۆش، نەسەرمایان ئەبێ و نە گەرما، جگەی سێبەری بەهەشت هیچ سێبەرێ تر بەو جۆرە نین.

کاتێ پێغەمەرو هاورێکانی شاری مەکەیان گرت و چونە نێو حەوشی کەعبە عوسمانی کوڕی تەلحەی کوڕی عەبدولاّ قاپی کەعبەی لێی پێوەدان و کلیلی کەعبەی هەڵگرت، پێغەمەر داوای کلیلەکەی کردو نەیدایە ووتی: ئەگەر بم زانیایە فروستادەی خوای کلیکەکەم ئەدایتێ، عەلی کوڕی ئەبی تالب دەستی پێچ داو کلیلەکەی لێ سەند.

پێغەمەر چوە نێو کەعبەوەو دوو ڕکات نوێژی کرد، لەو کاتەدا عەباسی مامی پێغەمەر داوای لە پێغەمەر کرد کلیلەکەی بداتێ و ببێتە کلیلەوانی کەعبەو ئاوپێدانی حاجیەکان و ببێتە لێپرسراوی هەردووکیان. بەلاّم لە دواییدا خوای گەورە فەرمانی دابە پێغەمەر کلیلەکە بداتەوە بە عوسمانی کوڕی تەلحە. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی دابە عەلی بیداتەوە بە عوسمان و بیانوشی بۆ بهێنێتەوە، ئەو ڕووداوە بو بە هۆی باوەڕهێنانی عوسمان، خوای

گەورە پەیامی نارده خوارەوە کە زێوان و کلیل بەدەست و خزمەت کردنـی کەعبـە هـەتا هەتایە بەدەست عوسمان و نەتەوەکەیەوە بێ، هەتا ئەم کاتەی سەردەمی ئێمە هەر بەدەسـت ئەوانەوەیە، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾

﴿ إن الله يأمُرُكُمْ أنْ تَؤَدوا الأماناتِ إلى أهْلِها ﴾ بەڕاستی خوا فەرمان ئەدا بە ئێـوە کـە ئێوە بگێڕنەوە بۆلای خاوەنـەکانیان ئـەو شـتەی لاتـان دانـراوەو کەلیلەکـە بدەنـەوە بـە عوسمان.

بۆزانین: مەبەست لـە (الأمانات) لـەو ئایەتەدا بریتی نیە لـەو شتانە ئەبینرێن، وەك دارایـی و نامەو کلیلی دەرگا. بەڵکو هەموو شتێ ئەگرێتەوە پێویست کرابێ لەسەر ئادەمیزاد لــە سامان و ئەو کەسانەی خراونەتە ژێر چاودێری کـار بەدەسـتان و لەبـەش کردنـی دارایـی گەنجینەی ئیسلام بەسەر دانیشتواندا و لـە گەڕانـەوەی ئەوانـەی بەسـتەم داگـیرکراوە لــە

خەڵکی، دادپەروەری لە فەرماندانا، لە نوێژو ڕۆژو زەکات و هەموو پەرستنەکانی تر، ئەوانە هەموویان پێویستە جێبەجێبکرێن. زانین ئەمانە تەلای زانایان، مافی دراوسێ ئەمانەتە، مێردو ناموس ئەمانەتە لەلای ژن، ژن و خێزان ئەمانەتەن لەلای خێزان، قوتابی ئەمانەتە لەلای مامۆستایان نەخۆشەکان ئەمانەتن لای پزیشکەکان.

خوای گەورە فەرمان ئەدا کە دادپەروەربین لە فەرمان دەرکردندا بۆ نەهێشتنی گیرگرفتی نێوان ئادەمیزاد، بۆ وەڵامدانەوەیان لە هەموو پرسیارکردنیان لە هەموو ڕویەکەوە، بۆ ئەو مەبەستانە هەموویان خوا ئەفەرموێ:

﴿ وإذا حَكَمْتُمْ بَيْنَ الناسِ أنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ﴾ وەهەرکاتێ ئێوە فەرمانتان دابوو لە نێوان ئادەمیزادا بۆ نەهێشتنی کێشەو ئاژاوە یا وەڵامدانەوە پرسیار پێویستە کە ئێوە فەرمان بدەن بە دادپەروەری و یەکسانی و لایەنی هیچ لایەنێ نەگرن، ئیتر ئەو ئادەمیزادانە باوەڕداربن، یان بێباوەڕ، خزمبن یان بێگانە.

پێویست کردنی دادپەروەری تەنها بۆ دادوەران نی‌یە، بەڵکو کاربەدەستان بە گەورەو بچوکیانەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوە لە هەموو ڕوبێکی ژیانەوە لە تەندروستی و ڕۆشن بیری و گوزەران و سەربەستی بۆ هەموو گەل ئەگرێتەوە، بەر لە هەموو شتێ پێویستە لەسەر کار بەدەستان ڕێگە بگرن لە چاوچنۆکی ستەمکاران بێگانەبن یا خۆماڵی کە ڕێگەیە بگرن ببێتە هۆی ستەم و دەست درێژی لە دانیشتوان و گاڵتە بکەن بە هەست و نەستیان.

بێگومان ئەو کارەساتە نالەبارانە دیومانە بە خۆمانەوە بەسەرمان هاتووە هەموویان سەرچاوەکانیان لەلایەن کار بەدەستانەوە پەیدا بووە. ئەو هەمووە نەگبەتی و شین و هاوارەی بەسەرمان سەپاوە کە لەلایەن ئەو کۆمەڵە کاربەدەستە جەردانەوە توشمان بووە، سەرەتاو هێزی دەسەلاتیان بەهۆی داگیرکردن و ستەم و ئاگرەوە بووە، بە ناشایستە چونەتە پۆپەی دەستەلاتەوەو خۆیانیان کردووە بەکاربەدەست، وێنەی کاربەدەستانی ئەم سەردەمەی ئێمەی بە زۆری.

بۆ زانین: دادپەروەری دادوەرەکان بە مانای خوارەوە ئەبێ: بەیەك چاو تەماشای داواکارەکان بکا. هەموو مافێ بداتەوە بەدەست خاوەنەکانیانەوە، تەماشای ئاین و بڕواو خزم و دۆست و دوژمن و گەورەو بچوك نەکا...

ئەبێ ئەوەیش بزانین بە گوێرەی تاقیکردنەوو شایێتی دانی بێگانە و مێژوو هیچ یاسایێکی جیهان نەبینراوە کە دادوەرتربێ لەو دەستورە ئیسلام داینـاوە، چونکـە هەرەشـەی زۆری کردووە لە دادوەرەکان دەربارەی دادپەروەری و دانەبـەزینی دادپـەروەری. چاودێری و پشکنینی کاری دادوەران یەکجار توندو سەختە.

﴿ إن الله نِعّمِا يَعُضُكُمْ ﴾ بە ڕاستی خوا چاك شتێکی ئەوتۆیە ئامۆژگاری ئێوە ئەکا بەو شتە کە دانەوەی ئەو سپاردانەیە ئەبێ بیدەنەوە بە خاوەنەکانیان و، چاکە ئەو فەرمانەی خوا پێتانی ئەدا بە دادپەروەری فەرماندانتان بە نەهێشتنی ئاژاوە، قەدەغەکردنی ئەو شتانە نارەواو نا دروستێ لەسەرتان.

﴿ إن الله كانَ سَمِيعاً بَصيراً ﴾ بە ڕاستی خوا هەموو گفتوگۆیە ئەبیستێ. بەتایبەتی کە عوسمانی کوڕی تەلحە ووتی: ئەو کلیلە سپاردەو ئەمانەت بێ لەلاتان، هەموو شتێ ئەبینێ بە تایبەتی گەڕانەوەی کلیل بۆلای عوسمانی کوڕی تەلحە.

کاتێ خوای مەزن فەرمانیدا بەکاربەدەستان و هانی دان بۆ دانەوەی سپاردەو مافی ژێر دەستەکانیان و یەکسانی دانان لە نێو دانیشتوانا، فەرمانیش ئەدا بە گەل و ژێر دەستەکانیان و هانیان ئەدا بۆ گوێ گرتن و پەیڕەوی کاربەدەستان و پێشەواکانیان، هەرگیرو گرفتێ ڕووی تێ کردن پەنابین بۆلای کاربەدەستان بۆ چارەسەرکردنی.

بەم ئایەتەی دوایش بۆمان ڕون ئەکاتەوە کە سەرچاوەی یاساو دەستوری ئیسلام چوارشتن:

١- نامەی خوا (الکتاب) وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ يا أيُّها الذينَ أمنوُا أطيعُوا الله ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ بڕواتان هێناوە ئێوە فەرمان، بەرداری خوابن، یانێ ئەو شتانەی خوا پێویستی کردووە لە نامەی خۆیا لەسەرتان بە جێیان بهێنن، ئەوانەیش خوا قەدەغە کردوون لەسەرتان خۆتانی لێی دوربخەنەوەو مەیکەن.

٢- ﴿ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ﴾ و فەرمان بەرداری فروستادەی خوابن و هەر شتێ فـەرمانی پێ ئەدا پێویستە ئێوە بە گوێرەی فەرموودەکانی بەوانە هەڵسن لە هەموو ڕۆڵێکەوە.

٣- کۆبونەوەی موسڵمانان و بڕیاردانیان لەسەر شتێ بە هۆی ڕاوێژەوە لەو کەسانەی خاوەنی گرێ دان و کردنـەوەی کـاری موسـڵمانانن کـە پـێی ئـەوترێ (الأجماع) وەك ئەفەرموێ:

﴿ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ ﴾ وە فەرمانبەرداری کەسانێ بن خاوەنی فەرمان و کار بەدەسـتن لە ئێوەو لە خۆتانن و موسڵمانن، هەر شتێکتان پێ ئەڵێن ئەبێ ئێوە جێبەجێی بکەن، بـەو مەرجەی لە یاسای ئیسلام دەرنەچێ، ڕاست گۆو دادپەروەرو ئـایین و نیشـتمان پـەروەبن ووشە (منکم) بەڵگەی ئاشکرایە کاربەدەستانی موسڵمانان پێویستە موسڵمانبن و هـەرگیز دروست نی‌یە لە جگەی موسڵمانان بن.

٤- سەرچاوەی یاسای ئیسلام بەراوردکردنی هۆی کارێکە بۆ پـەیدابوونی ئـەو هۆیـە لەشتێ تردا کە پێی ئەوترێ: (القیاس) وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَإِنْ تَنازَعْتُمْ فِي شَيءٍ فَرُدُّوهُ إِلى اللهِ وَإِلى الرَّسُولِ ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە ئاژاوەتان بـوو لە شتێکا باسی هـۆی فـەرمان پێدانـی نـەکرابوو لـە نامـەی خـواداو لـە فـەرموودەکانی پێغەمەردا (الكتاب والسّنه) دوایی ئێوە زانینی ئـەو شـتە بگێڕنـەوە بـۆلای نامـەی خـواو فەرموودەی پێغەمەر. یانێ ئەگەر پێغەمەر لە ژیاندا بوو بچن بـۆلای بـۆ ڕوون کردنـەوەی ئەو کارە، ئەگەر کۆچی دوایی کردبـوو تەماشـای نامـەی خـوا بکـەن، دوایـی تەماشای فەرمودەی پێغەمەر بکەن و بەراوردی بکەن لەگـەڵ هـۆی فـەرمودەکانیان بـۆ شـتێ تـرو بیکەن بە یاسا بۆ خۆتان، بە گوێرەی بەراوردی خۆتان.

﴿ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الأخِرِ ﴾ ئەگەر ئێوە بـڕوا ئـەهێنن بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایی. بێگومان باوەڕ هێنان پێویستی ئەکا لەسەرتان هەرشتێ ئێوە ئاژاوەتـان لـەوا پـەیدا کرد بیگێڕنەوە بۆلای فەرمودەکانی خواو پێغەمەر (ﷺ).

﴿ ذٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً ﴾ گەڕانەوە بۆلای زانینی ئەو شتانە، بۆلای فـەرمودەکانی خواو پێغەمەر چاکترە بۆ ئێوەو شـیرین و چاکـترە ئەنجامەکـەی و ماناکـەی لـەوەی نـەی گێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمەر، شایستەترە بۆ ئێوەو توشی هەڵە نەبن.

بۆ زانین: ناوبردنی کاربەدەستان لە دوای فروستادەی خوا ئەمەمان پیشان ئەدا پێویستە کاربەدەستان دادپەروەربن و ستەم کارنەبن، چونکە ستەم کاران شایستەی ئـەوە نـین ببنـە سەرۆك و پێشەوای موسڵمانان، ئەگەر وابن ئەو ستەمکارانە بە زۆر خۆیانیـان سـەپاندووە بۆ سەرۆکایێتی دانیشتوان بەبێ ڕەزامـەندی ئـەوان هـاتوون، خۆینیـان ئـەمژن و سـامانیان فەرهوت ئەکەن.

کابەدەستان دوای ئەوەی ئەبێ موسڵمانبن و ستەم کار نەبن ئەمانە هـەموو ئەگرێتـەوە: سەرەك کۆمار و پاشا و شالیار و جێگەداری ئەوان لـە شـارو لـە دێـهات و لـە هـەموو جێگەکاندا، هەروەها دادوەران و زانایان و فەرماندەی لەشـکرو گـەورە پیـاوانی ئـایین و بەڕێوەبەران و هەڵسوڕێنەری کارو فەرمانی دانیشتوان ئەگرێتەوە. ئەگەر ئەوانە بە کۆمـەڵ بڕیارێکیان دەرکرد لەژێر ڕوناکی یاسای ئیسلامدا پێویسصتە جێبەجێ بکـرێ، بەمـەرجێ شیاوی ئـەوەبن سـپاردەو ئەمانـەتیان بخرێتـە سەرشـان و دژی فـەرمودەی خـواو پێغەمـەر هەڵنەسن و لـە فەرماندانـدا سەر بە خۆبن و کـەس زۆریـان لێ نـەکا، سـەرباری ئەوانـەیش ستەم کار نەبن.

بۆ زانین: کار بەدەستان بە تەنها بریتی نین لـە پێشەوایانی بێ گونـاه، بـەو جـۆرەی کـە ڕافزیەکان و تاقمی دووازدە پێشەوا پەرستەکان بە گومانی خۆیـان ئـەیلێن لەبـەر سـودی جیهانی خۆیان دروستیان کردووە، مەرج نیـیە بێ گوناه بن و ئەبێ بناسرێن و خۆیـان بـۆ دانیشتوان دەرخەن، لەبەر ئەمانەی خوارەوە:

١- پەیڕەویی و فەرمانبەرداری ئەوان کاتێ پێویستە ئەو پێشەوایانە بناسـرێن و بگونجـێ دانیشتوان بچنە لایان و خۆیان نەشارنەوە، وەك ڕافزیەکان دەربارەی موحەمـەدی کـوڕی عەلی ئەیلێن: کە خۆی پەنـهانداوە لـە کێـوی (رضویـة) و، دووازدە ئیمامیـەکان ئـەیلێن

دەربارەی ئیمامەکانیان بە تایبەتی بۆ ئیمامی دووازدەهەم، کە هەرگیز کەس نەی دیوە، چونکە ئەگەر نەناسرێن ناتوانن داوای پێشەوایی بکەن و نازانرێ چ کەسێ فەرمانیان بۆ دەرکاو دەنگیان بۆبدا. ئەگەر بش ناسرێن مەرج نیە هەر ئەوان پێشەوابن کە خۆیان بۆ خۆیانیان دیاری کردووە، خوای مەزن لەو ئایەتەدا ئەو فەرمانبەردارییەی نەبەستوە بە چەند کەسێکی تایبەتەوەو بە بەرەلایی باسی کاربەدەستانی کردووە.

٢- کار بەدەستان لەو ئایەتەدا بە کۆمەڵ باسی کردووە نەك بۆ تاکە کەسێ لە جێگەی پێغەمەر، کەچی لای ڕافزیەکان و دووازدە ئیمامیەکان پێویستە هەر یەك کەسێ بە دژی فەرموودەی خوا.

٣- خوای مەزن لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئەفەرموێ: ئەگەر ئاژاوەتان لێ پەیدا بوو لە کارێکا، زانینی ئەو کارە بگێڕنەوە بۆلای خواو فروستادەی خوا، لەو کاتەدا ئەگەر مەبەست لە خاوەن فەرمانەکان یەك کەس بوایە بە تەنها ئەبوایە ببێژرایە:

بیگێڕنەوە ئەو شتە بۆلای خواو فروستادەی خواو خاوەن فەرمان کەواتە مەرج نیە هەر تاکەکەسێ بێ و خۆی ئاشکرا نەکا...

پیاوی لە جوولەکەکان و پیاوێ تر لە دوو ڕووەکان کەوتنە ئاژاوە لە نێوان خۆیانا، لە دوایدا جوولەکە ووتی: ئەچین بۆلای موحەمەد، چونکە ئەیزانی پێغەمەر بەرتیل وەرناگرێ و ستەم ناکا لە فەرماندانیا، پیاوە دوو ڕوەکە ووتی: ئەچین بۆلای کەعبی کوڕی ئەشرەف کە جولەکە بوو، چونکە ئەیزانی بەرتیل ئەخوا، بۆیە خوا لەو ئایەتەدا باسی کار بەدەستانی کردووەو فەرمانی داوە بە دانیشتوان فەرمانبەرداریانین، دوای ئەوە باسی دوو ڕوەکان ئەکاو ئەفەرموێ:

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ

وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ أمنُوا بِما انْزِلَ إِلَيْكَ وَما أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ ﴾ ئایا تۆ هەواڵت پێ نەدراوەو نەتڕوانیوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ گومان ئەبەن کە ئەوان بە ڕاستی باوەڕیان هێناوە بە شتێ نێرراوەتە خوارەوە بۆلای تۆ بە وێنەی قورئان، گومانیان وایە باوەڕیان هێناوە بەشتێ نێرراوەتە خوارەوە لە پێش تۆو بۆلای پێغەمەرانی، وەك تەورات و زبور و ئینجیل، تۆ نازانی ئەو کەسانە چ شتێ ئەکەن.

﴿ يُرِيدُونَ أنْ يَتَحاكَمُوا إلى الطّاغُوتِ ﴾ ئەو کەسانە ئەیانەوێ لەگەڵ ئەوەیشدا ئەڵێن: باوەڕمان هێناوە کە داواکاری خۆیان ببن بۆلای یاخیەکان لە خوا لە کاتی ئاژاوەیانا بە

تایبەتی بۆلای کەعبی کوڕی ئەشرەف. تاغوت بریتیە لە هەموو پەرستراوێکی پوچ لە بت و لە ئادەمیزاد بە تایبەتی کار بەدەستانی ستەم کار.

﴿ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ ﴾ وە بە ڕاستی ئەو کەسانە فەرمانیان پێ دراوە کە باوەڕ بە تاغوت نەبەرن و یەخەیان لێ هەڵکێشن.

﴿ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلالاً بَعِيداً ﴾ وە شەیتان ئەیەوێ ئەو کەسانە لابدا لە ڕێگەی ڕاست وەریان گێڕێ بۆلای تاغوت بە گومڕاییێکی دوورو بەردەوامبێ هەتا کاتی مردنیان و نەگەڕێتەوە بۆلای ڕاستی.

ئەو ڕووداوانە کە قورئانی پیرۆز بۆمانی ئەگێڕێتەوە کە ڕووی داوە لە نێوان جولەکەو دوو ڕووەکاندا وانەیەکی زۆر گرنگمان فێرئەکا: ئەو جولەکەیە بڕوای بە پێغەمەر نەبوو کە ئەیووت بۆنەمانی ئاژاوە بچین بۆلای موحەمەد، دوو ڕوەکەیش بڕوای بە کەعبی کوڕی ئەشرەف نەبوو کەچی ئەیووت: بچین بۆلای کەعب. جا ئەو کارە گرنگە ئێمە لەو ڕووداوەدا ئێمە فێری ببین ئەمەیە: ئەو نهێنیە هەردوولایان پەنایان داوە سوودی تایبەتی خۆیانە، خۆیان بە خۆیان بە درۆ ئەخەنەوە، بۆیە پێویستە لەسەرمان هەر کەسێ بیەوێ سوودی تایبەتی خۆی بە هۆی ئایین و باوباپیرانەوە دەست بکەوێ جێگەی بڕواو متمانە نیە لە پڕوپاگندەی خۆیانانە بۆ خۆی و، نەبۆ ئایین و بیروباوەڕی هەتا نەی یالێویی و تاقی نەکرێتەوە.

بە ڕاستی زۆر کەس هەن و بە چاوی خۆمان ئەیان بینین بە دەیان کۆشك و بە هەزاران دینارو دۆلار ئەنێین بەیەکەوە بە هۆی ئایین و بیروباوەڕەوە، دانیشتوان بێ هۆش ئەکەن و خۆیان بە بەختیاری لەم ڕۆژەدا ئەژین، ئەو شتانەیان دەست نەکەوتووە بە جگە ئەوە نەبێت دانیشتوانی ساویلکە بە ئایین پەروەری و بە پیاو چاکی و بە نیشتمان پەروەریان دابنێن. دانیشتوانی ژیرو ئایین پەروەر ئەزانن، ئەو کەسە پارەو پول و چەکی زۆر لە دوژمنان وەرئەگرن بۆ کپ کردنەوەی هۆشی موسڵمانان، پارەکان بۆ خۆیان هەڵئەگرن و بە

چەکەکان دانیشتوانیان پێ ئەکوژن بە هۆی بە کرێ گیراوانی خۆیانەوە، بـە بیـانوی ئـەوە گوایە ئەوان دژی کاربەدەستانن هەرکەسێ لـە دانیشتوان بگوژرێ ئەندازەیە لەو پارەیە لـە کاربەدەستان وەرئەگرن ئەیدەن بەکەس و کاری کوژراوەکان. ئەو کەسانە زۆرن و ناویان بە ڕاویژکارو هەندێکیان ناوی خۆیانیان ناوە بە پیرانی تەریقەت، کۆشـکی گـران بـەهاوو ماشیننی یەکجار بە نرخ بۆ خۆیان ساز ئەکـەن، هـەموو کـەس بـە چـاوی خـۆی ئـەبینێ کوڕەکانیان پیاو کوژو مەی خۆرو قومارچی و داوێن پیسن و کچەکانیان ڕوت و بەرەڵاو بە مودێلی ڕۆژانەوە خەریکن لـە بەرگو خشڵ و بۆن و قژبڕین و شتی تریش.

﴿ وَإذا قِيْلَ لَهُمْ تَعالَوْا إلى ما أنْزَلَ اللهُ وَإلى الرَّسُولِ ﴾ وەهەر کاتێ ببێژرێ بەو کەسانە: وەرن بۆلای شتێ خوا ناردبێتەخوارەوەو فەرمانی پێداوە لـە نامەی خۆیاو، بۆلای پێغەمـەرو ئەو شتانەی ڕای ئەگەیەنێ بە ئادەمیزاد.

﴿ رَأيْتَ الْمُنافِقِيْنَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُوداً ﴾ تۆ ئەو دووڕوانە ئەبینی واز لـە تۆ ئـەهێنن و ڕوئەکەن بۆلای جگەی تۆ لـە دوژمنانی خوا بەوازهێنانی زۆر گەورە، ئەو کەسانە بڕوایـان بە هیچ شتێ جگە لـە سوودی خۆیان نییە، بەهەرجۆرێ بۆیان بلوێ سەریان پێوە نیەە.

﴿ فَكَيْفَ إذا أصابَتْهُمْ معية بِما قَدَّمَتْ أيْدِيهِمْ ﴾ دوایی چۆن ئـەبێ ژیانیـان و چ شـتێ ئەکەن ئەو دووڕووانە. کاتێ تووشی ئەوان ببێ سزاو، تاڵاوێ بە هـۆی شـتێکەوە خۆیـان پێشیان خستوە وازیان هێناوە لـە یاسا خواو چـوون بـۆلای تـاغوت وکـارە پوچـەکان بـۆ نەهێشتنی ئاژاوەکانیان.

گەورەترین تاڵاو تووشـی ئـەو دووڕوانـە ئـەبێ و ئابڕویـان بچـێ ئـەو کـارە خراپانـە دەرئەکەوێ بۆ دانیشتوان، دزی و نادروستی و درۆو فێڵ و ترسنۆکی و بێ تەباییان ڕوون ئەبێتەوە.

﴿ ثُمَ جاؤُكَ يَحْلِفونَ باللهِ إن أرَدْنا إلاّ إحْساناً وَتَوْفيقاً﴾ لـە پاشا دێن بۆلای تۆو زمـانی بیانو هێنانەوە درێژ ئەکەن و سەردائەخەن بە بۆنەی کـارە ناڕەواکانیانـەوە سـوێند ئـەخۆن

ئێمە هیچ شتێکمان مەبەست نەبووە لە بردنی ئەو ئاژاوەیە بۆلای جگە تۆ مەگەر چاکەکردن نەك خراپە کردن و، مەگەر پێك هاتنی ئاشتەوایمان و بەردەوامی خۆشی نێوانمان. خواو پێغەمەرو دانیشتوان ئەزانن ئەو دوڕانە درۆزنن.

﴿ أُولَئِكَ الَّذِيْنَ يَعْلَمُ اللهُ ما فِي قُلُوبِهِمْ فأعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ﴾ ئەو تاقمە دوو ڕوانە کە بە درۆ سوێند ئەخۆن و ئەڵێن: ئێمە چاکەکردنمان مەبەستەو ئەمانەوێ پێك بێین، کەسانێکی ئەوتۆن خوا ئەزانێ بە شتێ لە دڵیانا لە دوو ڕوویی لە سوێندنی بەدرۆخواردن، کەواتە ڕوویان لێ وەرگێڕە و بیانویان لێوەرمەگرە نەوەك بەکاری بهێنن لە سودی خۆیاناو، تۆ ئامۆژگاری ئەوان بکەو سزایان مەدە بۆ ئەوە واز لە خراپە بهێنن و با لەم ڕۆژەدا بژین.

﴿ وَقُلْ لَهُمْ فِي أنْفُسِهِمْ قَوْلاً بَلِيْغا﴾ وە تۆ بڵێ بەوان گفتۆێکی زۆر ڕەوان، کار بکاتە سەر دەرونیان و بیان ترسێنە لە سزای خواو لەوانەیە ئەوان لەسەر ئەو دوو ڕووییە بکوژرێن.

زانایان چەندین مانایان بۆ (البلاغە) کردوە: هاتوە بە مانای گەیاندنی، مانا بە شیرینترین جۆری ووشە. بە مانای شێوەی گفتوگۆ لەگەڵ ڕاستی ماناکەیدا. بە مانای کورتی ووشە بۆ گەیاندنی مانا بەبێ ئازارو ماندوکردنی گوێی گران. بە چەندین مانای تریش هاتووە.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بە جۆرێ ئامۆژگاری ئەکردن شەرمەزار ئەبوون و خۆیان هەستیان بە درۆی خۆیان ئەکرد، ئەوان ئەبوایە هەوڵیان بدایە دەرونی خۆیانیان پاك بکردایەوەو پەشیمان بونایەتەوەو ئەو دوو ڕوییە لە دەرونیانا نەمایە. ئەو جۆرە سەرچاوەیە بۆ ئامۆژگاری کردن لە پێغەمەرەوە بینراوە سەرچاوەی یاسای ئیسلامە بەرانبەر هەموو تاوانبارێ و نابێ کوتوپڕ سزایان بدرێ. بەڵکو هەموو ڕێگەیە بەکاربهێنرێ بۆ چاك کردنیان.

دوای ئەوەی ئەو دووڕوانە ئەو کارانەیان کرد خوای مەزن سەرزەنشتیان ئەکاو تانەیان لێ ئەدا لەسەر ئەوەی فەرمانی خواو پێغەمەریان واز لێی هێنا، ڕوونی ئەکاتەوە مەبەست لە ناردنی پێغەمەران فەرمانبەرداری و پەیڕەوی کردنی ئەوانە و ئەفەرموێ:

وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ ٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ أَوِ ٱخْرُجُوا۟ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا۟ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّءَاتَيْنَٰهُم مِّن لَّدُنَّآ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَٰهُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ

أُولَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾

﴿ وَما أرْسَلْنا مِنْ رَسُولٍ إلا لِيُطاعَ بِأذْنِ اللهِ ﴾ وە ئێمە ڕەوانەمان نەکردووە هیچ فروستادیە لە فرودستادەکان بۆلای بەندەکانی ئێمە مەگەر بۆ ئەوە کەپەیڕەویی بکرێن و فەرمانبەرداربن بە هۆی، دەستورو فەرمانی خواو فەرمانی پێ داون، ئادەمیزاد پەیڕەویان بکەن و گۆیان لێ بگرن. بەو ڕستەیە بۆمان دەرئەکوێ ئەو کەسەی بە فەرمانی خوا ڕازی نەبێ با باوەڕیش بهێنێ ئەو کەسە هەر بێ باوەڕەو شایستەی کوشتنە، چونکە مەبەست لە ناردنی پێغەمەران پەیڕەویی کردنە بە جۆرێ بە فەرمانی خوا ڕازی بن لە هەموو ڕوێکەوە.

﴿ وَلَو أنَهُمْ ظَلَمُوا أنْفُسَهُمْ ﴾ وەئەگەر بە ڕاستی ئەو دووڕوانە کاتێ ستەمیان کرد لە گیان و لەشی خۆیان بە دژایَتی کردنی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ چونیان بۆلای تاغوت و بێ باوەڕان خۆیانیان کرد بە نیشانە بۆ لەناوچوون بە هۆی گوناە کردنیانەوە، دڵ و دەرون و دەمیان وەك یەك نەبوون.

﴿ جاؤُكَ فأسْتَغْفِرَوا اللهَ وَأسْتَغْفَرَ لَهُمْ الرّسُولُ لَوَجَدُوا واللهُ تَواباً رَحِيماً ﴾ هاتن بۆلای تۆ بۆ ئەوەی لە دووڕوی خۆیان پەشیمان ببنەوەو بە ڕاستی باوەڕیان بەتۆ هێنا، دوایی داوای لێی خۆشبوونیان کرد بو لە خواو، فروستادەی خوایش داوای لەخوا کردبوو لەوان خۆش بێ و بیانوی ئەوانی پەسەند کرد، ئیتر با تاوانەکانیان گەورەبێ بەڕاستی خوایان دەست ئەکەوێ بە وەرگرتنی پەشیمان بوونەوەیان، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە لەگەڵیان. خوا دەرگای پەشیمان بوونەوەی بۆ هەموو کەس کردوەتەوە.

پرسیار/ ئەگەر یەکێ بە دڵیا بێت ئەو ڕستەیە دژی بیروباوەڕی ئیسلامە کە ئادەمیزاد ئەتوانێ بەبێ وابەستەو میانجی‌گەری پەیوەندی بە خواوە بکا، ئیتر داوای لێ خۆشبوونی ناوێ لەلایەن هیچ کەسێکەوە.

وەڵام / زۆر ڕاستە میانجگەری پێویستە. بەڵام لە شتێکابێ پەیوەندی بە مافەکانی خواوە هەبێ و لە سنوری ئەو مافانە دەرچێ. بەڵام ئەو مافانە پەیوەندیان بە ئادەمیزادەوە بێ ئەبێ خۆیان لە مافی خۆیان خۆش ببن نەك جگەی خۆیان. بێگومان دووڕووەکان ئازاری پێغەمەریان داوەو دەست درێژیان کردووەتە سەر مافی پێغەمەر، بۆیە ئەبێ دوای پەشیمان بوونەوەیان داوای لێبوردنیش لە پێغەمەر بکەن و لە مافی خۆی خۆش ببێ.

زوبەیری پورزای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەگەڵ پیاوێکی یاریدەران کەوتنە ئاژاوە لەسەر ئاودانی باخەکانیان، بۆ ئەو مەبەستە چوونە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، پێغەمەر فەرمووی: بە زوبەیر، تۆ زەویەکەی خۆت ئاوبدەو لە پاشا ئاوەکە بەرەڵابکە بڕوا بۆ باخی دراوسێکەت، پیاوە یاریدەر کە ووتی بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾: من وات ئەبینم پورزاکەتت خۆش ئەوێ، پێغەمەر ڕەنگی گۆڕاو، ووتی بە زوبەیر باخەت ئاو بدەو، دوایی ئاوەکە بگرە هەتا ئەگاتە دیواری باخەکەت، بەو بۆنەوە خوا فەرموی:

﴿ فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤمِنُونَ حَتى الحِكَمُوكَ فيما شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾ دوایی ئەو کارە بەو جۆرە نی‌یە ئەوان گومانیان بردووە، بە پەروەردگاری تۆ سوێندبێ ئەو کەسانە بە ڕاستی باوەڕ ناهێنن هەتا تۆ نەکەن بە دادوەر لە شتێکا ئاژاوەی پەیدا کردووە لە نێوانیانا و لێیان تێك چووە.

﴿ ثُمَ لا يَجِدُوا في أنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِما قَضَيْتَ وَيُسَلِموا تَسْلِيما﴾ لەدوای فەرماندانی تۆ پەیدا نەکەن لە دەرونی خۆیانا دڵ تەنگی و دڵ گرانی لە شتێ تۆ فەرمانت پێ داوەو، خۆیان بدەن بە دەستەوە بۆ ئەو فەرماندانەی تۆ بە خۆو دەستانێکی بێ گومان و مل کەچ بن بۆی.

ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەو کەسانە فەرمانێ لە فەرمانەکانی خواو پێغەمەر وەرنەگرن و کاری پێ نەکەن ئەو کەسانە باوەڕدارنین و لە ئایینی ئیسلام وەرگەراون، ئیتر بە گومانەوەبێ یا بە وەرگەران لە ئایینی ئیسلام، پێویستە ئیسلام جەنگیان لەگەڵ بکا بە کوشتن و دیل کردنی خۆیان و خێزانیان.

ئەو کاربەدەستانەی ئێستا کە یاسای دەست کرد دائەنێن لەبەر سودی تایبەتی خۆیـان، کارو کردەوەو نەهێشتنی ئاژاوەیان بە قورئان نـەبێ پـەیوەندیان بـە ئیسـلامەوە نامێنـێ بـە گوێرەی فەرموودەی ئەو ئایەتەی پێشوو.

سابیتی کوڕی قەیس کوڕی شەماس لەگـەڵ جولەکەیـەکدا خۆیانیـان هەڵئەکێشـا لـە دووایدا جولەکە ووتی: خوا پێویستی کرد کە ئێمـە خۆمـان بکوژیـن، لـە وەڵامـدا ئێمـە دەستمان کرد بە کوشتنی خۆمان و ژمارەی زۆرمان لەیەك کوشت. سابیتی کوڕی قـەیس ووتی: ئەگەر خوا پێویستیشی بکا لەسەر ئێمە، ئێمەیش خۆمان ئەکوژین، بەو بۆنەوە خـوا ئەفەرموێ:

﴿ وَلَوْ أردنا كَتَبْنا عَلَيْهِمْ أنِ أقْتُلوا أنفُسَكُمْ ﴾ وەئەگەر ئێمە پێویستمان بکردایە لەسـەر ئەو دووڕوانە ئێوە خۆمان بکوژن، یانێ بچن بۆ جەنگ کردن هەتا بکوژرێن. وەك کوڕانی ئیسرائیل.

﴿ أو أخرُوا مِنْ يُارِكُمْ ما فَعَلُوهُ إلاّ قَلِيلً مِنْهُمْ ﴾ یا پێویستمان بکردایە کـە ئێـوە بچنـە دەرەوە لە نیشتمانی خۆتان بە ڕووتی، وەك پێویستمان کرد لەسەر گوێرە کە پەرسـتەکان ئەوانەیان نەئەکرد ، مەگەر کەمێ لەوانەیان نیاز پاکن بـە وێنـەی سـابیتی کـوڕی قـەیس، چونکە ئەوانە دوو ڕوون بەڕاستی ئایینی ئیسلام ئاسانەو چاکی ئەوێ، داوای شتێ ناکا لـە تواناداا نەبێ و سوودی هەردوو جیهانی تێـدا نـەبێ، ئـەو شـتانە خـوا داوای لـە کوڕانـی ئیسرائیل کرد شایستە بو بۆ کوشتنیان.

﴿ وَلَوْ أنهُمْ فَعَلُوا ما يُوعَظُونَ بِهِ لكان خَيْراً لَهُمْ ﴾ وەئەگەر بە ڕاستی ئـەو دوو ڕوانـە بیان کردایـە شتێ ئامۆژگـاری ئـەوانی پـێ کرابـوو لـە پـەیڕەوی کردنـی فروسـتادەی خوابەخوایشتی خۆمان، بە ڕاستی کردنی ئەو شتە چاکترە بۆ ئەوان لە هەردوو جیهاندا.

﴿ وأشَدُ تِثْبيتاً ﴾ توندترو نزیکتر بوو بـۆ ڕاوەسـتانیان لەسـەر بـەردەوامی باوەڕیـان و دورتر ئەبوو لە خشانی باوەڕیان. ئایا ئەگەر ڕاوەستانایە چ شتێ بۆ ئەوان ئەبوو.

﴿ وَإِذا إِلاّ تَبْناهُمْ مِنْ لَدُنّا أَجْراً عَظِيماً ﴾ وە ئەو کاتە ئێمە ئەمانبەخشی بەوان لەلایـەن خۆمانەوە پاداشتێکی گەورەو فراوان و بێ کۆتایی.

﴿ وَلَهَدَيْناهُمْ صِراطاً مُسْتَقِيماً ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە ڕانموویی ئەو کەسـانەمان ئـەکرد بـۆ ڕێگەیەکی ڕاست کە بە ئاواتی خۆیانیانی ئەگەیان.

خوای مەزن فەرمانی دا بە پەیڕەوکردنی خواو فروستادەی خوا لەمەوبـەر، لـە دوایـدا پوچی کردەوە ڕێ ڕەوی ئەو کەسانە کە تاغوت ئەکـەن بـە فـەرمان ڕەوایـی خۆیـان، بـە ئایەتی (٦٠-٦١) پاش ئەوانە پەیڕەوی کردنی فروستادەی خوا دووپات کردەوە بە ئایەتی (٦٤)، ئەو پەیڕەوی کردنەی خواو پێغەمەرەی بەهێزترکرد بەم ئایەتەی خوارەوە:

ئەگێڕنەوە لە کۆمەڵی لە زانایانەوە کە سەوبانی بـەندەی ئـازادکراویی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ پێغەمەری زۆر خۆش ئەویست، بـەبێ بینینـی پێغەمـەرئارامی نـەبوو، جـارێ هـات بـۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕەنگی تێك چوبوو، لەشی لاوازو بـێ هـێز، بـە جـۆرێ خەفـەت، لـەنێو چاوانیا دەرئەکەوت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پرسیاری لێ کرد بۆچی وات لێ هاتوە؟ ووتی: کە تـۆ بینم ئارامم لێ ئەبڕێ و بیری ڕۆژی دوایی ئەکەمەوە ئەگەر من بە هەشتی بم، پایـەو پلـەی من پلەو پایەی پێغەمەر کەمترە لەوانەیە نەت بینم، ئەگەر نەچمە بە هەشتەوە ئەوا هـەرنات بینم بەو بۆنەوە خوا فەرمووی:

﴿ وَمَنَ يُطِعِ اللهَ وَالرَسُولَ فَأُوْلَئِكَ مَعَ الذينَ أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِمْ ﴾ وەهەرکەسـێ پـەیڕەوی خواو نێرراوی خوا بکاو فەرمانەکانیان جێبەجێ بکـا و مـل کـەچی ئـەوانبێ لـە هـەموو ڕوێکەوە دوایی ئەو کەسانە لە بەهەشتا لەگەڵ کەسـانێکی ئـەوتۆن خـوا چاکـەی خـۆی ڕژاندوە بەسەریانا کە گەورەترینی دروست کراوانی خوان و پلەیان زۆر گەورەیە.

﴿ مِنَ النَبيّينَ وَالصدنين ﴾ لە پێغەمەران. پێغەمەران ئەو کەسانەن خاوەنی گەیشـتنن بـە هەموو چاکەیە بە هۆی تەواوی زانین و ڕەوشتی چاکیانەوە ئەو پـەریان گرتـووە لـە پلـەو پایەی بەرزدا بۆ بەختیاری و ئاسودەیی ئادەمیزاد بە گشتی و، لـە ڕاسـت وێـژان: ڕاسـتو ێژان ئەو کەسانەن گیانی پاکیان گەشـەی کـردووە بـە جـۆرێ ڕاسـت و خـراپ جویـێ ئەکەنەوە تەنها یەکەم جـار ڕابگەیـەنرێن بەسـەریانا، بـەر لـە هـەموو کـەس باوەڕیـان بـە

پێغەمەران هێناوە، دەرونیان بەرزبۆتەوە بۆلای ئایین بە گفتوگۆو بەکارو کردەوە یان بە پاکی و بە ڕاستی.

﴿ والشُهَداءِ وَالصّالِحِينَ وَحَسُنَ أولئِكَ رَفِعاً ﴾ وە لە شەهیدان: شەهیدان ئەو کەسانەن لە ڕێگەی خوادا گیانی خۆیانیان بەخت کردووە بە نیازی پاکەوە، خوا ئەوانی گەیاندووە بە پلەو پایەیە بوون بە خاوەن دادپەروەری و لای ڕاستی ئەگرن، شایەتی ئەدەن لەسەر گوناهباران و، لە پیاوچاکان: پیاو چاکان ئەو کەسانەن تەمەنی خۆیانیان کۆتایی پێ هێناوە لە پەرستنی خوادا، سامانی خۆیانیان داناوە بۆ ڕەزامەندی خواو بەرزی ئایین، بیروباوەڕو نیازیان پاکەو، شیرین و چاکە ئەوانە لەلایەن هاوڕێتی و تێکەڵاوی کردنیانەوە.

﴿ ذلِكَ الفضْلُ مِنَ اللهِ وَكَفى باللهِ عَلِيماً ﴾ ئەو هاوڕێتەی پێغەمەران و ڕاست گۆیان و شەهیدان بە خیباری و ڕێزێکە بۆیان لەلایەن خواوە ئەدرێ بەوان و، بەسە خوا بزانێ بە مەبەست و نیازی ئەو کەسانە و پاداشتی پەرستنیان بداتەوە.

خوای مەزن پاش هاندانی ئادەمیزاد بۆ فەرمانداری خواو پێغەمەرو پەرستنی خوا دووبارە فەرمان ئەدا بە دانانی گیانیان لە ڕێگەی خوادا کە گرنگترین پەرستن و گەورەترینفرمانە بۆ پتەوکردنی ئایین و بانگ کردن و تاقی کردنەوەی هەموو ئادەمیزاد، بۆ ئەومەبەستە خوا ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعٗا ﴿٧٠﴾ وَإِنَّ مِنكُمۡ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنۡ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَالَ قَدۡ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيَّ إِذۡ لَمۡ أَكُن مَّعَهُمۡ شَهِيدٗا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنۡ أَصَٰبَكُمۡ فَضۡلٞ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن

لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾

﴿ يا أيها الذينَ أمنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە هۆشیارو ئامادەبن بۆ پاراستنی خۆتان لە دوژمنانتان، چەك و تفاقی جەنگ وەرگرن و پەلاماری بێ باوەڕان بدەن بە باوەڕی تەواوی خۆتانەوە.

﴿ فانْفِرو ثُباتٍ أو انْفِرُوا جَميعاً ﴾ دوایی ئێوە بچنە دەرەوە بۆ جەنگ کردن تاقم لە دووایی تاقم و لە هەموو لایەکەوە بەبێ جیاوازی، یا ئێوە بڕۆنە دەرەوە هەمووتان لەگەڵ پێغەمەر بەیەك باوەڕەوە، پاشە کێشی مەکەن و خۆتان مەشارنەوە نەوەك سامتان نەمێنێ لەو کاتانەدا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەچێتە دەرەوە بۆ جەنگ کردن.

ئەو ئایەتە هەرچەندە هاتوەتە خوارەوە دەربارەی جەنگی بێ باوەڕان. بەڵام پەلاماردان بۆ هەموو کارێکی چاکە ئەگرێتەوە بەهەر جۆرێ بگونجێ، هەر ئەو ئایەتە یەکێکە لەو ئایەتانە هانمان ئەدا بۆ جەنگی بێ باوەڕان، چەندین ئایەتی تر لەمەو بەرو لەمەو پاشیش هانی داوین و هانیشمان ئەدەن بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە. بەڵام ئەو ئایەتە جگەی هاندانیش پێویستی کردووە دەرچون بە گشتی بۆ جەنگ کردن. بە کوردی (ڕەش بگیر). ئەگەر ئەو ئایەتە بەڵگەیەبێ لەسەر شتێ بەڵگەیە لەسەر ئەمەو بۆمان ڕون ئەکاتەوە ئیسلام دوژمنی زۆرە، بەدەیان دوژمن خۆیان مەڵاس داوەو دانراون بۆ ئەوە موسڵمانان لادەن لە ئایینی خۆیان، هەتا ئێستاو ئەم ڕۆیش ئیسلام و موسڵمانان دوژمنانی بێ باوەڕی زۆربوون. کەواتە ئێمە پێویستە ئاگامان لەخۆمانبێ، زۆر ڕاست و سروشتیە و بەجێیە خوای مەزن هەموو کاتێ موسڵمانان هان بدا بۆ خۆئامادەکردن و چەك هەڵگرتن زۆر بە هۆشیاریەوە، هانیشمان ئەدا بۆ ناسین و دیاری کردنی هێزی دوژمنان و ئەندازەی جۆری چەکەکانیان هەتا لەسەر ئەو ڕۆشناییە چەکی زۆرترو بە تواناتر پەیدا بکەن.

بۆ ئاگاداری: جەنگی لەمەوپێش بە پیاوان و سەربازو ڕەش بگیر بووە. بەڵام زانیاری ئەمرۆ پەرەی سەندووە لە هەموو ڕوییەکەوە، بە جۆرێ شمشێرو ڕم و تیروکەوان و ئەسپ و جگەی ئەوانیش گۆڕراون بە ساروخی دوورهاوێژو فڕۆکەی بۆنبا فڕێدەرو ژێر دەریا و ئۆتۆم و دەبابەو قەیاخی تیژڕەو هەڵگرانی فڕۆکە و گازی ژەهراویی، ڕۆژبەڕۆژ هێنراوی تازەی سەر سوڕهێنەرو دروست کردنی ئامێر بۆ بشکنینی ژێر دەریاو ناویی هەواو وشکایی سەر زەویی و چون بۆ سەر ئەستێرە دوورەکان، چەند چەکی تری لەمەودوا بۆ ڕوخاندن و کاول کردنی شارستانیەت، خوا ئەزانێ چ شتی تریش پەیدا ئەبێ، ئێستا لەم ڕۆژەدا زۆرتر لە چل مانگی دەست کرد بەم لاولای زەویدا ئەسوڕێنەوە، تەنها بۆ تاقی کردنەوەی بۆشایی.

بەتەنها ئەمەریکا (٣٠) کەشتی هەوایی هەیە بۆ جاسوسی لەگەڵ دوو هەزار ئیزگەی لەسەر زەویی هەر بۆ ئەو مەبەستە، ئیتر جگە لە ڕوسیاو فەرەنساو چین و وولاتەکانی تر وێنەی ئەڵمانیا، بگرە لەوانەیش زۆرتر هەن.

بازرگانانی جەنگ بەوانەی پێشەوە ناوەستن، ئەیانەوێ بە هەزاران میکرۆبی نا لەبارو سەر لێ شێواوی بڵاوبکەنەوە بۆ لادانی موسڵمانان لە باوەڕی خۆیان. بەسەدان ترس و بیم ئەخەنە دەرونی باوەڕداران بە پڕوپاکەندەی ژەهراویی پاراو. بەوبۆنەوە بێ ڕەوشتی وداوێن پیسی و شتی تری بێزلێ کراو بەنجیان ئەکاو بیر لە خۆیان ناکەنەوە کەچی بێ باوەڕان لە ئایین و ئەفسانەی پڕوپوچی خۆیان وازنایەنن کەچی موسڵمانان واز لەو ئایینە پاك و بەرێزەی خۆیا ئەهێنن و ئەی فرۆشن بە مەیی و قومار و داوێن پیسی و بچوکی کردنی دوژمنانی خۆیان، ئەو هەموو چەك و پڕو پاگەندەیە بۆ ئەوەیە گەلانی هەژار داگیر بکەن و پیت و سامانیان بخۆن، بە تایبەتی موسڵمانان.

ئەوانەی ناومان بردن لەو چەکانەی دوژمنانمان جەنگی پێ ئەکەن لەگەڵمان، ئایا ئێمە چ شتێکمان بۆ ئامادەکردوون و بە چ شتێ بەرانبەریان بکەین، ئایا بە جنێودان و بە گریان و خەفەت خواردن و دەمەقاڵە قیرەقیرو ناکۆکی نێوان خۆمان کە بەوان چاکتر لاوازو بێ هێز ئەبین؟

پێویستە بەر لە هەموو شتێ ئێمە دوژمنانی ناوخۆو تابوری پێنچەمی دوژمنانی دەرەوەی خۆمان بناسین و بزانین توانایان هەتا چ ئەندازەیەکە، بەو بۆنەوە کوێرانـە هـەنگاو نـەنێن و ڕێزی لە کیس چوویی خۆمان و نیشتمانی داگیرکراویی خۆمان لە چنگـی پیسـی بـەکرێ گیراوان دەربهێنین، بە هەموو سەر زەوی بناسێنین کە کاربەدەستانمان لە ئەڵقـە لـە گوێـی دوژمنانی ئیسلامدا بوون، بۆیە ئێمە ئەو تالاّوەمان چێشـتوە. کەواتـە بەیـەك لـەش و یـەك دەست پەلاماری دوژمنان بدەین، هەوڵی زانین و زانیاری و چەك دروست کـردن بدەیـن، ئەبێ بشزانین چەکی خواناسین گەورەترین و تیژترین و بەهێزترین چەکن بۆ:

دۆزینـەوەی زانیـاری تـازەو پـەیداکردنی ئامیـاری ئێسـتا، ئـەبێ بزانـین بـێ توانـایی موسڵمانانی ئێستا هۆی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان خۆیانـە، بۆیـە پارچـە پارچـەبوون و ڕژێمی زۆریان لێ پەیدا بووە، بە خۆیانەوەو بۆ سوودی تایبەتی خۆیان خـەریکن، دوژمنـی خۆیانیان لەبیرچۆتەوە، هەریەکەیان لە گیای بانێ ئەلەوەرێن.

خوای مەزن ڕوئەکاتــە لەشـکرەکەی پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ بـە بـاوەڕدارو دووڕوەکـان و ڕاراکەرانیاوە ئەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَنْ لَيُبَطِئَنْ ﴾ وە بە ڕاستی هەندێکە لە ئێوە کەسـێ بـە ڕاسـتی تەمـەڵی ئەکا لە چونە دەرەوە بۆ جەنگ و خۆی دوا ئەخاو سستی ئەکاو سوێند ئەخوا کە بیـانوی هەبووە، ئەو کەسانە ئەوانەبوون کە کوڕەکەی ئوبەی پەشیمانی کردنەوەو کـە چـوون بـۆ جەنگی ئوحود لەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾.

﴿ فَأنْ أصابَتْكُمْ مُصِبَةٌ قالَ قَدْ أنعَمَ اللهُ عَلَى إذْ لَـمْ أكُـنْ مَعَـهُمْ شَـهِيْداً ﴾ لـە دوایيـدا ئەگەر توشی ئێوە ببوایە ئازارێ لە کوشتن و ڕوخـان ئـەڵێ ئـەو کەسـەی تەمـەڵی کـردو نەچووە دەرەوە بە ڕاستی خوا چاکەی بەسەرمندا ڕژاندا کە نەچوومە دەرەوە تووشی ئـازا ببم، چونکە من لەگەڵ ئەوانە نەبووم چوبوونە دەرەوە.

پرسیار/ ئەو کەسە کە ئەڵێ: خوا چاکەی بەسـەردا ڕێـژام ئـەوە ئەگەیـەنێ بـڕوای بـە بوونی خوا هەیە، بۆ ئەبێ لە ڕیزی دووڕواندا بژمێردرێ؟

وەلام/ ئەو کەسە دووڕووە بە دوڕوی باوەڕی بە ئیسلام و بە موحەممەد ﴿ ﷺ ﴾ دەبڕی بوو لە دڵیا بێ باوەڕ بووە، ئەوەیش دژی ئەوە نیە بڕوای بەخوا هەبێ، وا ئەبێ بە زۆری کەسانێ باوەڕیان بە خوا بێ و باوەڕیان بە پێغەمەر نەبێ.

﴿ وَلَئِنْ أصابَتْكُمْ فَضلٌ مِنَ الله لِيَقُولَنَ كَأنَ لَمّ يَكُنْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَةٌ ﴾ وە ئەگەر تووشی ئێوە ببوایە چاکەیەکی بەرێز لە تالآن و سەرکەوتن لەلایەن خواوە ئەو کەسەی نەچووە بۆ جەنگ بە خەفەتەوە ئەڵێ وەك نەبوبێ لە نێوان ئێوەو لە نێوان ئەو کەسەدا دۆستایی و ناسراویی، بە جۆرێ ئەیلێ‌نە ئێوە ئەوتان بینیبێ و وە نەئەو ئێوەی بینیبێ.

﴿ يالَيْتَني كُنْتْ مَعَهُمْ فأفَوْزَ فَوْزاً عَظِيماً ﴾ خۆزگایە من لەگەڵ موسڵمانانندا بومایە لەو جەنگەداو منیش بەشداربومایە دوایی پیرۆزی تالآنی گەورە ئەبوو بە بەشم و وەرم ئەگرت ئەو کەسانەی وێنەی ئەو دووڕوانەن لە کاتی ناخۆشی و تەنگانەدا لەگەڵ موسڵماناندا نەبن، لەکاتی ئاسایش و خۆشیدا لەگەڵیا نابن، ئەو کەسانە فڕیان بە ئیسلامەوە نیە، ئەگەر موسڵمان بن وەك خۆیان ئەیلێن ئەبوایە لە هەموو کاتێکا لەگەڵیانا بونایە لە ناخۆشی و لە خۆشیدا.

خوای مەزن لە ئایەتی پێشودا باسی ئەو تاقمانەی کرد لە جەنگدا دووا ئەکەون و ڕاڕان، هەیشیان بوو نەیان ئەهێشت هەندێ کەس بچنە دەرەوە، دڵی موسڵمانانیشی سارد ئەکردەوە بە پڕوپاگەندە، بەم ئایەتەی دوا هانی موسڵمانانی پاك ئەدا بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕانداو ئەفەرموێ:

فَلْيُقَٰتِلْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَٰتِلْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ ۖ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾

﴿ فَلْيُقاتِلُ فِي سَبِيلِ اللهِ الذيْنَ يَشْرونَ الْحَياةَ الدُنْيا بِالأَخِرَةِ﴾ دوای پێویسە باوەڕداران جەنگ بکەن لە ڕێگەی پەرستنی خوادا لەگەڵ کەسانێکی ئەوتۆی دوژمنانی ئیسلام ژیانی بڕاوەی جیهان بە بەهاو پاداشتی نەبڕاوەی پاشەڕۆژ ئەکڕن.

ئەو ڕستانەی پێشوو گەورەترین بەڵگەی بێگومانن لەسەر ئەوەی ئیسلام جەنگ ناکا بۆ داگیرکردنی زەوی، بۆ خوێن مژینی دانیشتوان و چەوسانەوەیان. جەنگ ناکا بۆ پەیدا کردنی کەرەسەی خاو بۆ خستنەگەڕی کارخانەی پیشەسازی، بۆ فراوان کردنی بازاڕو بۆ زۆرکردنی دەست کەوت، یا بۆ ئەوەی موسڵمانان ببنە سەرمایەدارو بەکارهێنانی مایەکانیان بۆ داگیرکردنی هەرێمەکان و خواردنی سامانیان، یا بۆ داگیرکردنی هەندێ لە وولاتانی تر بۆ نیمچە داگیرکردنیان، وەك ئێستا کە ڕێژێمە گەورە بێ باوەڕەکان وولاتانی ئیسلامیان داگیر کردووە پیت و فەڕیان ئەخۆن کەچی کاربەدەستە بەگرێ گیراوەکانیان بێ شەرمانە بڵاوی ئەکەنەوە کەسەربەخۆن، هەر بۆ خەڵەتاندنی دانیشتوان.

بە ڕاستی موسڵمانان جەنگ ناکەن بۆ خۆشی و ڕابواردنی تاکە کەسێ یا خۆشی خێزانێ یا چینێ یا کیشوەرێ یا نەتەوەیە. بەڵکو ئیسلام جەنگ ئەکا لە ڕێگەی پەرستنی خوادا بە تەنها، بۆ بەرزکردنەوەی فەرموودەی خوا لەسەرانسەری جیهاندا، بۆ جێگە گرتنی بیروباوەڕی یاسای خواداو بەکارهێنانی لە گۆڕانی ڕۆژانەی ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی بەبێ ترس مرۆڤایەتی دابەزێ و بە خۆشی بژین لەژێر ئالأی بیروباوەڕداو دادپەروەری لە نێوان دانیشتوانی سەر زەویی بە گشتی، بۆ ئەوی هەموو کەس سەربەستبێ بتوانێ بیروباوەڕێ بۆ خۆیان هەڵبژێرن، بە ئازادانە بە ئارەزووی خۆیان بگەن و یاسای قورئان جێگەی خۆی دیاری بکا.

﴿ وَمَنْ يُقاتِلْ فِي سَبِيْلِ اللهِ فَيُقْتَلْ أوْ يَغْلِبْ ﴾ وەهەرکەسێ جەنگ بکا لە ڕێگەی پەرستنی خوادا، دوایی بکوژرێ و بە پلەی شەهادەت بگا، یا سەرکەوێ بەسەر دوژمناندا پیرۆزی وەردەگرێ.

﴿ فَسَوْفَ نُؤتِهِ أجراً عَظِيماً ﴾دوایی ئێمە ئەبەخشین بەو کەسە پاداشتێکی زۆر گەورەی بێ ئەندازە، مەگەر خوا بیزانێ ئەندازەی.

مێژوو ناسانی سەر زەوی بە گشتی هەر بیرو باوەڕێکیان بوبێ پێك هاتوون لەسەر ئەوەی کە هۆی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام ئەوە بووە بیروباوەڕێکی یەکجار پاکیان هەبووە، وایان بڕیارداوە بۆخۆیان هەرجۆرێ بن خاوەنی قازانج و سوودن، ئەگەر بکوژرێن پاشەڕۆژیان بەرەو بەهەشتە، ئەگەر بکوژن ووشەی ڕاستی و دادپەروەری لە ڕوی زەویدا بڵاوئەبێتەوە، هەر لایێکیان بە بەشبێ ئاوات و مەبەستیان هاتۆتە دی، باوەڕیشیانو ایە تەمەنی ئادەمیزاد کاتی دیاری کراویی لەلایەن خواوە بۆ دیاری کراوە، پاش و پێشی نابێ بە چرکەی کات ژمێرێ.

﴿ وَمالَكُمْ لا تُقاتِلُونَ فِي سَبِيلَ اللهِ والْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِجّالِ وَالْنِساءِ وَالْوِلْدانِ ﴾ وە چ شتێکە بۆ ئێوەی موسڵمانان و بیانوتان چیە ئێوە جەنگ نەکەن لەگەڵ دانیشتوانی مەکە

لە ڕێگەی پەرستنی خواداو پەرەپێدانی ئایینی خواو، بۆ ڕزگارکردنی بێ چارەو بێ هـێزان گیریان خواردوە بە دەست بێ باوەڕانی مەکەوە کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان نەکردوە بـۆ مەدینە و ڕێگەیان لێی بەستراوە لە پیاوان وەك سەلمەی کوڕی هیشـام و وەلیـدی کـوڕی وەلیدو عەباسی کوڕی ئەبی ڕەبیعەو ئەبی جەندەو جگەی ئەوانیش و، لە ژنان بـە وێنـەی ئومو شورەبك و جگە ئەویش و، لە منالان وەك عەبدولای کوڕی عەباسی ئامۆزای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە مەکەوە کۆچی کـرد بـۆ مەدینـە لەگـەڵ هـەندێ موسـڵمانان کـە خاوەنی توانابوون، ئەوانەیان توانایان نەبوو لە پیاوان و ژنان و منالان لە مەکە مانەوە، پت پەرستان زۆریان ئازار ئەدان و توانای بەرگریان لــە خۆیـان نـەبوو، یـاریدەرو پیشـتوانیان نەبوو، کاتێ دەستیان لە هەموو شتێ بڕابوو، پەنایان برد بۆلای خوا بە کزۆڵییەوە لە خوا پاڕانەوە، خوای مەزن بەم ئایەتە وەڵامی دانەوە ئەفەرموێ:

﴿ الَّذِيْنَ يَقُولُونَ رَبَنا أَخْرِجْنا مِنْ هذِهِ القَرْيَةِ الظّالِمِ أَهْلُها ﴾ ئـەو هەژارانـە کەسـانێکی ئەوتۆن کە بە زمانی پاڕانە ئەڵێن: ئەی پەروەردەکەری ئێمە تۆئێمە دەربکەو ڕزگارمان بکە لەم گوندە دانیشتوانەکەی ستەمکارن کە مەکەیە، ئـازاری زۆری ئێمـە ئـەدەن، ئـەم پـت پەرستانەی دانیشتووی ئەو جێگەیەن.

﴿ وَأجْعَلْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ وَلَيا وَّاجْعَلْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيراً ﴾ وەتۆ بسازێنە بۆ ئێمە لەلایەن خۆتەوە سەردارێ سەرپەرشتیمان بکاو ڕزگارمان بکا لە دوژمنان و، سـاختەبێنی بـۆ ئێمـە یاریدەرێ یارمەتیمان بداو ڕزگارمان بکا لەم ستەم و تالاوە.

خوای مەزن پاش پاڕانەوەی ئەو بـێ چارانـە وەڵامـی پاڕانـەوەکانی دایـەوە، دەرفـەتی کردەوە هەندێکیان هۆی چونە دەروەیان بۆ ڕەخسا، ئەوانەیان لە مەکە مانەوەخوای مـەزن سەردارێکی وەك پێغەمەری بۆ ناردن لە ڕۆژی گرتنی مەکەدا، دڵنـەوایی زۆری کـردن و کەسێ لە خۆیانی هەژاری بۆ کردن بە سەرۆك و پارێزەریـان کـە نـاوی عەتابـەی کـوڕی ئوسەید بوو کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کردی بە فەرمانداری مەکە.

خوای مەزن لە ئایەتی (٧١)ی ئەم سورەتە فەرمانی دا بە تاقمێ بە دەرچوونیان بە تەنها یا بەدەرچونی هەموویان بۆ جەنگ کردن، لە ئایەتی (٧٤)دا فەرمانی دا بە جەنگ کردن لە ڕێگەی ئایینی خوادا، لە ئایەتی (٧٥)دا فەرمانی بە هاندانی موسڵمانان بۆ ڕزگارکردنی بێ چارەو هەژاران لە مەکە، لەم ئایەتەی دواییدا ئادەمیزاد ئەکا بە دوو تاقم:

تاقمێکیان جەنگ ئەکەن لەبەر خواو دادپەروەری و ڕاستی. تاقمێ تریان بێ باوەڕن و جەنگ ئەکەن بۆ تالاّن کردن و چەوسانەوەی دانیشتوان و ئەفەرموێ:

﴿ الَّذِيْنَ أمنُوا يُقاتِلُونَ فِي سَبِيْلِ اللهِ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان هێناوە بە خواو بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ جەنگ ئەکەن لە ڕێگەی ئایین و پەرستنی خواو بۆ دادپەروەری هەتا بگەن بە ڕەزامەندی خوا.

﴿ والَّذِيْنَ كَفَرُوا يُقاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ ﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە جەنگ ئەکەن لە ڕێگەی پەی ڕەوی شەیتان و یاخی بووان لە خوا.

خوای مەزن فەرمان ئەدا بە باوەڕداران جەنگ بکەن لەگەڵ بێ باوەڕاندا، چونکە جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕان، ئەبێتە هۆی چاکەو خۆشی بۆ مرۆڤایەتی، دۆستایەتی بێ باوەڕان ئەبێتە هۆی خراپە بلاّوکردنەوەی خراپە. بە کورتی پێویستە موسڵمانان توندو تیژو خۆڕاگربن بەرانبەر بە نەهێشتنی ستەمی بێ باوەڕان کە ئەیانەوێ دانیشتوان بچەوسێننەوە، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَقاتِلُوا أوْلِياءَ الشَّيْطانِ إنَ كَيْدَ الشَّيْطانِ كأنَ ضَعيفاً ﴾ دوایی ئێوە دۆستانی خوا پێویستە جەنگ بکەن لەگەڵ دۆستانی شەیتان، لە فێڵ و تەڵەکەی ئەوان مەترسن.

بەڕاستی فێڵی شەیتان و پەیداکردنی دوودڵی شەیتان لاوازو بێ هێزەو پراگەندە ئەبێ پێویستە فریویی بێ نەخۆن و پاشەڕۆژی پوچە.

پرسیار / ئەو ئایەتە وا ئەگەیەنێ خاوەن ڕاستی‌یەکان و باوەڕ داران هەموو کاتێ سەر ئەکەون کەچی زۆرجاران پێچەوانەکەی ئەبینرێ، ئەبێ هۆی چ ستێ بێ؟.

وەڵام/ گومانی تێدانیەیە چرو̡جانەوەری ژهراویی پیس ناژی و پەرەناسێنێ بەبێ پیسایی و چڵك و شیاکەو شتی تری بۆگەن. شەیتانیش جێگە بۆ فێڵ و تەڵەکەی خۆی دەست ناکەوێ و نایدۆزێتەوە مەگەر لەلای ئەو کەسە خراپەو دوو دڵی بلاوئەکەنەوە، لەوانەوە فێڵەکانی چاو ئەتروکێنێ و گەشە ئەکەن، دوایی خراپی خۆی لەوانەوە پڕ ئەکا.

لەم سەردەمەی ئێمەدا دۆستان و تاقمی شەیتان زۆرن، خاوەنی هێزن. فێل و فریان بلاوبۆتەوە، خۆیانیان چەقاندووە، نێچیری خۆیانیان دۆزیوەتەوە، داوی خراپی خۆیانیان داناوەو ڕاوی موسڵمانانی پێ ئەکەن، داوەکەشیان داوەتە دەست کارەبەدەستانی بە ناو موسڵمان، جگە لە هەندێکیان ئەوانیش جێگای مەترسین.

لەم سەردەمەدا دەبینین هەزاران پشتیان شکاوە بە دەست ستەمکارانەوە، ساماندارانی سوپاسی خوا ناکەن و بێ سوپاسان زۆرن، چاوبرسیەکانیش بەرانبەر بە مافی پێویست کراوانی خوا لە ئەوپەڕی چاوبرسیدان و بەشی هەزاران نادەن. هەر لە ئاین وەرگەڕاوەکان ئەبینرێن و گوێچکەیان وەك پڕبوبێ لە قورقوشم هیچ چاکەیە نابیسن.

هەندێ لە باوەڕداران بەر لەوەی کۆچ بکەن بۆ مەدینە سکالایان بردە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە مەکە، وتیان بە پێغەمەر: پت پەرستان بەبێ بیانوو ئازاری زۆرمان ئەدەن، فەرمانمان پێ بدە جەنگیان لەگەڵ بکەین، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: جارێ من فەرمانم پێ نەدراوە لەلایەن خواوە، واز بهێنن نوێژەکانتان بکەن و زەکاتەکانتان بدەن، ئەو کەسانە داوایان لە پێغەمەر کرد، دوای کۆچ کردنیان بۆ مەدینە کە فەرمانی جەنگ کردن هاتە خوارەوە هەندێکیان چونە دەرەوەیان بۆ جەنگ کردن لاگرانبوو بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا فەرمووی:

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ

مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾

﴿ الَمْ تَرَ إلى الذيْنَ قِيلَ لَهُمْ كفُوا أيْدِيكُمْ ﴾ ئایا تۆ هەواڵت پێ نەدراوەو نەتڕوانیوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ پەلەیان ئەکرد بۆ جەنگ کردن لە مەکە بێژرا بەوان: ئێوە دەستی خۆتان بگرن بۆ جەنگ کردن و خۆتان ڕاگرن هەتا خوا فەرمان ئەدا بە جەنگ کردن.

﴿ وَأقِمُوا الصَّلاَةَ وَآتوُا الزّكاةَ ﴾ وە ئێوە نوێژەکان پیادە بکەن و ڕایان بگرن و، ئێوە زەکاتەکان بدەن بە هەژاران. خۆتان خەریك مەکەن بە شتێکەوە فەرمانتان پێ نەدراوە. ئێوە هەتا ئێستا فەرمانتان بە نوێژکردن و بە زەکاتدان پێ دراوە.

﴿ فَلَما كُتِبَ عَلَيْهُمْ القِتالُ إذا فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَخْشَوْنَ النّاسَ ﴾ دوایی کاتێ پێویست کرا لەسەریان جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕان کوتوپڕ تاقمێ لەو کەسانە داوای جەنگ کردنیان کرد ئەترسن لە جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕان وابت پەرستان ئەترسن لەوەی بکوژرێن، بەڵام نەك بە جۆرێ گومان پەیدا بکەن لە ئایندا، باسی ترسی گیانی خۆیانیان هەبوو.

﴿ كَخَشْيَةِ اللهِ أوْ أشَدُّ خَشْيَةً ﴾ ئەترسان لە بت پەرستان بە وێنەی ترسان لە خواو لە سزای خوا بەڵکو زۆرترو سەخت تر لە ترسان بۆخوا.

﴿ وَقالُوا ربَنا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنا الْقِتالَ ﴾ وە ئەو کەسانە وتیان: ئەی پەروەردەکەری ئێمە بۆچی تۆ پێویستت کرد لەسەر ئێمە جەنگ کردن لەم کاتەدا.

﴿ لَوْلا أخَرْتنا إلى أجَل قَرِيب ﴾ بۆ تۆ ئێمەت دووانەخست بۆلای ماوەیکی نزیك بۆلای ئەو کاتەی دیاری کرابو بۆ مردنمان، ئەو کەسانە بریتی بوو لە دوو ڕوەکان و شایستەی باوەڕداران نیە ئەو داوایە بکەن.

خوای مەزن وولاَمی دانەوە فەرمووی: هەرچەندە ژیانی جیهان سودی زۆرە لە هەندێ لاوە بەلاَم زۆر کەمە بەرانبەر بە ژیانی پاشەڕۆژی دوایی. فەرمووی:

﴿ قُلْ مَتاعَ الدُنيا قَلِيلٌ وَالأخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنَ أتقى وَلا تُظْلَمُونَ فَتِيلاً ﴾ تۆ بلێ ئەو کەسانە ئەترسن و دلّیان بە جیهانەوە بەستراوە سودو ڕابواردنی جیهان کەمەو زۆر ئەبڕێتەوەو کۆتایی پێ دێ و، پاداشت و خۆشی پاشەڕۆژ چاکترە بۆ کەسێ واز لە بت پەرستی بهێنێ و لە خوابترسێ، بە تایبەتی بۆ ئەوکەسانە جەنگ ئەکەن لەگەلّ بێ باوەڕان. کەواتە ئەو کەسەی ژیربێ ئەو شتە هەلّئەبژێرێ بۆخۆی بەردامبێ و پاداشتی زۆر بێ بانەختێ دڕۆیشبێ، ئەو شتەی کۆتایی پێ بێنایکا بەبەشی خۆی با ئێستایش وەری گرێ و، ئێوە سەتمتان لێ ناکرێ بە ئەندازەی ئەو تالّە تەنکەی ڕاکشاوە بەسەر دەنکە خورمادا، هیچ لە پاداشتی ئێوە کەم نابێتەوە، بە تایبەتی پاداشتی کوشتنتان لە جەنگی بێ باوەڕاندا.

لە دوای ئەو باسانەی پێشوو خوای مەزن هانی جەنگاوەران ئەدا بۆ جەنگ کردن لەگەلّ بێ باوەڕان و ئەفەرموێ:

أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِكَ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللَّهِ فَمَالِ هَٰؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾

﴿ أَيْنَ ما تَكُونُوا أَيْدْرِكْكُمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنْتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ ﴾ ئێوە لەهەر جێگەیە بن مردنتان پێ ئەگا لە مەکەبن یا لە مەدینە و لە جێگەیە تربێ و، با ئێوە لە نێو چەندین کۆشك و قلاّی سەخت و بەرزدابن. لە ئایەتی (١٤٥)ی سورەتی ئالی عمیراندا لەسەر ئەو باسە ڕۆیشتووین کە مردنی ئادەمیزاد بەستراوە بە کاتی دیاری کراوی خۆیەوە، هیچ پەیوەندیکی بە جەنگ و بە شتی ترەوە نیە، پەیوەندی بە جێگەی سەخت و نزم و بەرزو ئاسانەوە نیە، جەنگ لە تەمن کورت ناکاتەوە، ئاستی تەمەن درێژ ناکا. بەڵکو مردن پەیوەستە بەو کاتەوە بۆی دانراوە ئاوات خواستن بۆ دووا خستنی جەنگ و ترسان لە کوشتن جێگەی خۆی نیەو بێ مانایە.

﴿ وإنْ تُعبُهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هذِهِ مِنْ عِنْدِ اللهِ ﴾ وەئەگەر تووشی دوو ڕوەکان ببوایە لە هەرزانی و سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بە وێنەی جەنگی بەدر ئەڵێن: ئەو چاکەیە لەلایەن خواوەیە، ئەیدەنە پاڵ خوا.

﴿ وإنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هذِهِ مِنْ عِنْدِكَ ﴾ وەئەگەر تووشی ئەوان بێ خراپەیە لە گرانی و تەنگانەو کوشتن بە وێنەی جەنگی ئوحود: ئەڵێن: ئەوخراپە لەلایەن تۆویێ موحەمەد هەر شتێ ئادەمیزاد بە لایانەوە چاکبێ بە چاکەی دائەنێن، هەر شتێ لایان خراپێ بەلایانەو خراپە، بە گوێرەی بیروباوەڕی خۆیان، ئیتر با ئەنجامەکەی بە گوێرەی سروشت پێچەوانەی بیروباوەڕە یانێ چاکە وائەبێ هەموو کەس ئەگرێتەوە، وائەبێ یەك کەس ئەگرێتەوە، وێنەی بەختیاری مرۆڤ لە نێو خێزانی خۆیدا، وێنەی هەرزانی بۆ هەموو کەسەو بۆ هەموانە و بەختیاری نێو خێزان تایبەتیە، هەروەها گرانی بۆ هەموو کەسەو گیر خواردن بە دەست خێزانی خراپ تایبەتیە، مەبەست لە چاکەو لە خراپە لەو ئایەتەدا بریتیە لە چاکەو خراپەی سروشت کە هەمووان ئەگرێتە وەك باران لافاو هەزارنی و گرانی.

دووڕوەکان بە وێنەی جولەکەکانن: چاکەیان ئەدایە پاڵ خواو، خراپەیان ئەدایە پاڵ پێغەمەرەکانیان، بە مانەی خوارەوە مەبەستی دووڕوەکان ڕون ئەبێتوە:

١-ئەیان ووت: پێغەمەر نەگبەتە، بۆیە بارانمان بۆنابارێنێ و گرانی یەخەمان پێ ئـەگرێ. بە پێچەوانەوە ئەگەر ئاسودەیی و خۆشی توشیان ببوایە ئەیان ووت: ئەو چاکەیە خوا ئـەی نێرێ.

٢-ئەو دوو روانە هەر بە دەستیان قەس ئەیان ویست پێشەوایی پێغەمبەر (د.خ) بریندار بکەن لەو شتانەی پێغەمەر فەرمانی پێ ئەدان، بە تایبەتی لە کاتی جەنگ کردندا لـە بریتـی ئەوەی بیان ووتایە: ئێمە خۆمان ترسنۆکین ئەو گفتوگۆ خراپانەیان ئەووت کە باسکران.

٣- ئەو دوورِوانە بەو جۆرە پێویست بوایە بیریان لە فەرمودەی خواو پێغەمەرو کـاری سروشتی نەئەکردەوە، بیریان لە پرِوپاگەندەی خراپی خۆیان ئـەکردەوە، زۆر بـە نـارِەوایی بیریان لەبەسەرهاتی ئادەمیزاد و کارەساتی سورشتیان نەئەکردەوە.

﴿ قُلْ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللهِ ﴾ تۆ بلێ: هـەموو شـتێ لەلایـەن خـواوە دێـی وەرگرتـنەوەی بەروبووم و پەرەپێدانی خۆشی گوزەران و هەرزانی و گرانـی و بـێ سامانی و کوشـتن و ئاسایش و هەژاری هەموویان خوا ئەیکا.

﴿ فَما لِهؤُلاءِ الْقَوْمِ لايكادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثاً ﴾ دوایی چ شتێکەو چ رِوداوێکە بۆ ئـەو تاقمەی جولەکەو دوورِوەکان نزیك نیـە لـە هیـچ کفتوگـۆو رِوداوی بگـەن و بیـانزانن، چونکە ئەگەر تێگەیشتوبونایە و لـە مانای قورئان وردبونایە وە بە رِاسـتی ئـەیانزانی هـەموو شتێ لەلایەن خواوە پەیدا ئەبێ، بۆیان دەرئەکەوت کە گرانی و بومەلـەرزەو کانگاکـان و هەموو رِداوی سەر زەوی لـە نیشانەو پێویستی سروشتین، هەر خوایشە سروشتی دروسـت کردووەو هێناویێتیە بوونەوە. گەواتە ئەبێ هەموو شتێ بدەنە پاڵ خوا لـە چاکەو لـە خراپەی سروشت، پەیوندیان بە یغەمەرەوە نیە، پەیوندیان بە کەسی تریشەوە نیەو دەسەڵاتیان بەسەر رِووداوی سروشتەوە نییە. بۆ نموونە: کاتێ ئیبراهیمی کورِی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کۆچی دوایی کرد خۆر گیرا، فەرموی مانگ و خۆر نیشانەی خوان دێن دەرِۆن بە فـەرمانی خـواو مـل کەچن، لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێ ناگیرێن.

پرسیار / بۆچی خوا سروشتی بەبێ خرایە و ناخۆشی دروست نەکردووە، بە شێوەیە هەر چاکەو خۆشی تەنها بونایە، ئادەمیزاد بەبێ دەردە سەری بحەسانایەوە وە توشی ئەم هەموو چەرمەسەریە نەبونایە؟.

وەڵام / ئەو پرسیارە زۆر جاران لە زۆر کەسەوە کراوە، بە هەزاران ساڵە بوە بە گرێ کوێرەی زانایان، هەریەکەیان بە جۆرێ هەوڵیانداوە ئەو گرێ کوێرەیە بکەنەوە، لە ئەنجامدا زۆریان توشی هەڵەو هەڵخلیسکان بوون، بگرە هەندێکیان توشی ئەوەبوون هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، وتوویانە: خوای چاکەو خوای خراپە جیاوازن، ئەوەی ڕاستی بێ و گومانی تێدا نەبێ بە مانەی خوارەوە وولاَمیان ئەدرێتەوە:

خوای مەزن ئەم بونەوەرانەی دروست کردووە، پێکی هێناون لە چەندین ڕەگەزی دژی یەکتری، هەریەکێکیش لەوبونەوەرانە زۆر شتی دژی یەکتریان لەنێودایە، بە گوێرەی کارامەی خوا شان بەشانی یەکتری ئەڕۆن و دەست درێژی لە یەکتری ناکەن، ئەو ڕەگەزانە لە جم و جوڵێکی بەردەوامدان لە هاوردن و بردن و ڕاکێشان و پاڵ بە یەکەوە نان، لە کارکرندان لەگەڵ یەکتری، لەو کارانەیاندا چەندین ڕوداویی سروشتی پەیدا ئەبن لە هەورە گرمەو ڕەشەباو باران و بەفرو تەرزەو گەرماو سەرما، ئاسایش و ئازارو شتی تر لە چاك و لە خراپ بە گوێرەی بیری ئادەمیزاد بۆیە بەڵگەی زانایانی سروشت ناس ئەڵێن: هەموو بەشێك لە بەشەکانی سروشت گەورە وبچوکیان هێزێکی پەیداکەر (الموجبة) وە هێزی تری لەناوبەر (السالبة) لە ناویاندایە، بەمانایەکی تر گەرم ساردیان تێدایە.

ئەو کەسانە ئەڵێن: بۆچی خوا ئەم سروشتانەی بەبێ خراپەو زیان دروست نەکردوە؟

لەوێنەی ئەوەیە بڵێن: بۆچی خوا ئاگری بەبێ گەرمایی دروست نەکردووە؟ بەفری بەبێ ساردی و ئەقڵی بەبێ زانست و زیندەوەری بێ جم و جوڵ دروست نەکردون. کەواتە خوای مەزن بونەوەرانی دروست کردوە بە گوێرەی چاکەو خراپەو ئازارو ئاسایش و شتی تریان تێدایە بەلاَم لەگەڵ ئەوانەیشدا ئەقڵیشی دروست کردوەو بەخشیوێتی بە

ئادەمیزاد، بەهۆی ئەو ئەقڵەوە سروشت ئەگۆڕن بە چاکە و خزمەتی مرۆڤایەتی پێ ئەکەن، ڕێگەی دووری پێ نزیك ئەکەنەوە، گەرما ئەگۆڕن بۆلای فێنکی، سەرما ئەگۆڕن بۆلای گەرما، تاریکی ئەگۆڕن بۆلای ڕوناکی، بنەوان و ئاو بارەو پردو دروست ئەکەن بۆ مانەوەی ئاوی باران، لەلایە ترەوە بۆ بەرگری لە لافاو. بەڵام هەندێ کارەساتی سروشتی هەن لە توانای ئادەمیزادانین، نەبۆ بونیان و نەبۆ بەرگری کردنیان، وەك بومەلەرزەو پەیدابوونی کێوی ئاگرین و ڕاکێشانی زەویەکان، ئەوانە لە کاتی پەیدابونیانا بەزەییان بە هیچ کەسدا نایەتەوە لە پیرو منداڵ و لە لاو، لە موسڵمان و لە بێ باوەڕان، لە پاك و لە پیس. لەو بارەوە خوا هەر شتێ بکا پرسیاری لێ ناکرێ. کارو کرداری خوا بەرانبەر بە سودو ئاواتی ئادەمیزانیە.

بە کورتی نەپێغەمەران و نە کسی تر دەستیان لە هیچ شتێکی خراپەو چاکەدا نیە هیچ شێوەیە، لە توانایانا نیە بەرگری لە زۆرترین ڕوداوی سروشتیدا بکەن.

ئەو بێ باوەڕو دووڕوانە لە نەزانین و نەفامیدا وێنەی ئاژەڵەوان لە هیچ شتێ ناگەن بۆیە ئەڵێن:

﴿ ما أصابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللهِ وَما أصابَكَ مِن سيئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ ﴾ هەر شتێ تووشی تۆ بووە لەلایەن خواوەیە لە ساماندارى و لەسەرکەوتن بەسەر دوژمندا، هەرشتێ توشی تۆ ببێ لە خراپە لە خۆتەوەیە لە کوشتن و شکانی هاوڕێکانت ئەی موحەمەد.

هەندێ لە زانایان مانای ئەو ڕستانەی پێشوویان بەم جۆرەی خوارەوە کردووە:

هەرشتێ توشی تۆ بووە ئەی ئادەمیزاد لە چاکە لە خواوەیە بە هۆی گەورەی و میهرەبانی خۆیەوەو، هەر شتێ تووشی تۆ ببێ، ئادەمیزاد لە خراپە لە خۆتەوەیە لە خراپەو لە ڕوداوی ناڵەبارو بە هۆی گوناهی خۆتانەو توشتان ئەبێ، خوا بۆتانی دروست ئەکا.

کەواتە مانای ئەو ڕستانە بە هەر جۆرێ بێ نارێك و دژنین لەگەڵ مانای ڕستەکانی پێشودا کە خوا ئەفەرموێ لەوێدا (هەموو شتێ لەلایەن خواوەیە). نابێ بێژرێ: بە چ

جۆرێ مانای ئەو ڕستانەو مانای ڕستەکانی پێشەوە کۆئەبنەوە بەیەکەوە؟ مەبەست لە چاکەو لە خراپە لە ئایەتی پێشودا چاکەو خراپەی سروشتین زۆر بەجێییە هەردوولایان بدرێتە پاڵ خوا، چونکە دروست کراویی خوان. بەڵام مەبەست لە چاکەو لە خراپەیەکە توشی ئادەمیزاد ئەبن، سەرکەوتن توشبوونی چاکەیان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا لە کاری ئایینی و جیهانیدا ئەوانە بە دەستی خوان، توشبوونی خراپەو ژێرکەوتنیان بە هۆی خۆیان و گوناهیانەوەیە، ئەوانە ئادەمیزاد بە ئارەزوی خۆیان کردویانە بۆیە شیاوی سزادانن.

چاکەی خوا بەسەر ئادەمیزادەوە زۆرن و نامێژرێن، هەندێکیان بریتین لە ناردنی تۆ ئەی موحەمەد بۆلایان کە گەورەترین میهرەبانی خوایە بۆ ڕانمویی کردنی ئادەمیزاد، ئادەمیزادیش خراپەیان زۆرە لە هەموویان خراپتر دژایەتی کردنیانە لەگەڵ تۆو مل کەچ نەکردنیانە بۆ فەرمانی تۆ، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَاسِ رَسُولاً وَكَفَى بِاللهِ شَهِيداً ﴾ وە ئێمە تۆمان ڕوانە کردووە بۆلای ئادەمیزاد بە فروستادەو نێردراو بەوانی ڕابگەیەنی فەرمانەکانی ئێمە، بۆیان دەرنجەی چاکەو خراپەکانیان تەنها بە دەست خوایەو، بەسە خوا بۆتۆ بە ئاگاداری کە تۆ ڕاست ئەکەی و بەڵگەت داناوە بۆ ئەوەی بڕوات پێ بکەن.

لە پاش باس کردنی ئەو شتە گرنگانەی پێشوو خوا هانی ئادەمیزاد ئەدا بۆ فەرمان بەرداری کردنی پێغەمەر و مل کەچ کردن بۆ فەرمودەکانی، خوا ئەفەرموێ:

مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ

مَا يُبَيِّتُونَۖ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾

﴿ مَنْ يَطِعُ الرَسُولَ فَقَدْ أَطَـاعَ اللهَ ﴾ هەرکەسێ فەرمانبەرداری فروستادەی خوابێ بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردووە. یانێ پێغەمەر ڕاگەیانەری فەرمودەی خوایەو ئەو فەرمانی پێداوە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمە بووە: پێغەمەر فەرموی: هەر کەسێ منی خۆش ویستبێ بەڕاستی خوای خۆش ویستووە، هەرکەسێ فەرمانبەرداری من بێ بە ڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردووە، لەو کاتەدا دوڕوەکان ووتیان: بەڕاستی موحەمەد خۆی کردووە بە هاوبەشی خوا کەچی خۆیشی قەدەغەی ئەکا. ئەیەوێ بیکەن بە خوا بە وێنەی گاورەکان عیسایان کردوە بە خوای خۆیان، بەو بۆنەوە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە.

﴿ وَمَنْ تولى فَما أَرْسَلْناكَ عَلَيْهِمْ حَفِظاً﴾ وەهەرکەسێ پشت بکاتە فرمانی تۆو واز لە پەیڕەوی کردنی تۆ بهێنێ دوایی ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە پاسەوانبی بەسەر ئەوانەوەو پرسیار بکەی لەوان لەسەر کردارەکانیان.

بە ڕاستی پیشەی فروستادەو ووشەی فروستادە ماناکەی ڕون ئەکاتەوەو دیاری ئەکا بە وێنەی دیاری کردنی ووشەی خۆر بۆ مانای خۆر، واتە پیشەی پێغەمەر ڕاگەیاندنەو بەس، پرسیارو سزا پەیوەندی بەوەوە نی‌یە و پەیوەندی بە خواوە هەیە بە تەنها.

﴿ وَيَقُولُونَ طاعةٌ ﴾ وە ئەوان ئەڵێن: فرمان و کاری ئێمە پەیڕەوی کردنە لەلایەن ئێمەوە مل کەچ بین بۆ فەرمانەکانی تۆ، تۆیش فەرمان دەرکەر بە.

﴿ فَأذا بَرَزُوا مِنْ عِنْدِكَ بَيَّتَ طائِفَةٌ مِنْهُمْ غَيْرَ الذي تَقُـول ﴾ دووایـی هـەر کاتـێ ئـەو دووڕوانە چونە دەرەوە لەلای تۆ ئامادە ئەکـەن تاقمـێ لـەوان لـە شـەواو دەری ئەخـەن جگەی شتێکی ئەوتۆ تۆ ئەیلێ بەوان.

﴿ واللهُ يَكْتُبُ ما يُبَيِّتُونَ ﴾ وە خوا ئەینوسێ لە نامەی کرداریانا شتێ ئـەوان ئامادەیـان کردووە لە پەنهانیداو گۆڕیویانە و سزایان ئەدا لەسەر دووڕوی بوختان کردنیان.

﴿ فَأعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَلَ عَلَى اللهِ وَكَفى بِـاللهِ وَكيـلاً ﴾ دوایـی تـۆ واز لـەوان بهێنـەو لۆمەیان مەکە بە بۆنەی کردارەکانیانەوە کە بە ڕوالّەت ئـەوان ئـەڵێن: باوەڕمـان هێنـاوە، چونکە فەرمانی کوشتنیان نەهاتوەتە خوارەوە، تـۆ پشـت ببەسـتە لەسـەر خـوا بـە تایبـەتی دەربارەی کردەوەی ئەوان، ئیشی خۆت بکـەو گوێیـان مـەدەرێ، کـاری شـیاوی خـوا پێویستی کردووە لەسەر تۆ کە خراپەی ئـەوان ئاشـکرا نەکـەی و ناویـان نەبـەی، بـەڵام متمانیشیان پێ نەکەی، وەك متمانە بە موسڵمانە ڕاستەکان ئەکەی ڕۆژانی داهاتوو هـەموو کارێکیان دەرئەخا. لە باسی ماناکردنی ئایەتی (٣٦)ی ئەم سورەتەدا بۆ ئەم مەبەستە باسـی تریش کراوەو، بەسە خوا یاریدەرو پارێزەر بێ بۆتۆ، تۆڵەیش لەوان ئەسێنێ.

﴿ أفَلا يَتَدَبَّرُونَ القُرآنَ وَلَوْ كانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللهِ لَوَجَدُوا فيهِ أخْتِلافاً كَثيراً ﴾ ئایا دوایی بۆ ئەوان بیر ناکەنەوە لە مانای قورئان لەوکارە بەکەس نەکراوانە لە نێو قورئـاندان؟ هـەتا بۆیان ڕون ببێتەوە کە بە ڕاستی فەرمودەی خوایەو، ئەگـەر ئـەو قورئانـە لەلایـەن جگـەی خواوە بهاتایە بە ڕاستی دەستیان ئەکەوت لەو قورئانەدا جیاوازی زۆر لە نێوان ماناکـەیدا، بێگومان جیاوازیان دەست ناکەوێ کەواتە فەرمودەی خوایـە بـە تەنـها. لـە سـورەتی لـە ئەلبەقەرەدا لە باسی مانای ئایەتەکانی (٢٣) و ئایەتی (٢٤) ئـەو مەبەسـتە و کـاری پـەك خراوی قورئان باس کراوە وەك لەلای هەموو کەسێ ئاشکرایە زانایانی موسڵمان لەیەکەم کاتی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز هەتا ئەم سەردەمەی ئێستا نامەو پەرتوکی زۆریان پـڕ کردۆتەوە لەسەر باسی کردنی ئەو نهێنیانەی قورئان ڕونـی کردونەتـەوە، هەریەکـەیان بـە

گوێرەی زانیاری خۆیان و ڕێکەوتی کات ئەوەی لە توانایانا هەبوەو بۆی چوبون نهێنی قورئانیان دەرخستووە، هەروەچاخ و ڕۆژگاری داهاتوو ڕەگەزو نیشانەی بەکارن بۆ دەرخستنی مانای قورئان و نهێنیەکانی قورئان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بۆیە عەبدولای کوڕی عەباس ئەفەرموێ: لە قورئاندا چەندین مانا هەن لەمەو پاش کاتەکان ماناکانی ڕون ئەکەنەوە.

لە دوای نزیکەی سالّی (١٣٨١) خوای مەزن بە ئایەتی (٥٣) ئەم سورەتە لە قورئاندا نهێنی‌یەکی بۆ هەموو دانیشتوانی سەر زەویی دەرخستوە کە لەو ئایەتەدا ئەفەرموێ ئەگەر جولەکەکان ببنە خاوەنی دەستەلاّت و سامان لە جیهاندا نایبەخشن بەئادەمیزاد بە ئەندازەی قۆپتکەی سەری دەنکێ لە خورما. ئەو ئایەتە بەلّگەی بێگومانە لەسەر پێغەمەرایەتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەسەر ڕاستی ناردنی ئەو بۆ ڕانومای کردنی ئادەمیزاد، چونکە لە کاتێکا خوا ئەوەی فەرموە بە جولەکەکان پەرتەوازەی ڕوی زەوی بوون و بێ هێزو بێ جێگە بوون، خوا بۆمانی دەرخستووە کە جولەکەکان دوژمنی مرۆڤایەتین، بە تایبەتی بۆ موسلّمانان، نیشانەی خراپەکارین لەگەلّ مرۆڤایەتیدا، ئەوەتا ئێستا ڕژێمی نارەواو ستەمکاریان ئێستا لە خاکی پیرۆزی فەلەستینی موسلّماناندا پەیدا بووەو گەورەترین بەلّگەی ئەو مەبەستەیە.

زانایان تێکرا پێك هاتوون کە هەندێ کەس لە دانیشتوانی مەدینە هەوالّی ئاسایش و ترسیان ئەبیست کە پەیوەندی بە هێزی سەربازی موسلّمانانەوە هەبوو، ئەو هەوالاّنەیان بلاّوئەکردەوە، ئەو کەسانەیش لەوانە بوون باوەڕیان لاواز بوو بە ئایین، بە تایبەتی دووڕوەکان، هیچ شتێ لەوە خراپتر و خاوەن زیان نیە هەوالّ و باسی نهێنی سەربازی و جەنگ بلاّوبکرێتەوەو دوژمنان بیزانن: چونکە کار ئەکاتە سەر ئاسایشی نهێنی ناوخۆو دەرەوەی موسلّمانان، دوژمنان برەوی پێ ئەدەن و پڕوپاگەندەی پێوە ئەکەن و ئەبێتە هۆی زیانی گەورەو دوودلّی موسلّمانان بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَـٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾

﴿ وَإذا جاءَهُمْ أمْرٌ مِنَ الأمن أو الخَوْفِ أذاعُوابِهِ ﴾ وەهەر کاتێ بهاتایەو بگەیشتایە بەو کەسانە باوەڕیان لاوازبو کارێکی گرنگ لە کاری سەربازی و هەواڵی ناردنی ئەو تاقمانە ئەنێردران بۆ جەنگ. بە تایبەتی ئەوانەی پێغەمەر (د.خ) ئەیناردن بۆ وەرگرتن و هاوردنی دەنگ و باسی بێ باوەڕان و هەڵتەقاندنیان بەیەکا لەو کارانە ئەبونە هۆی ئاسایش و ئاسودەیی، وێنەی بڕیارێکی پێغەمەر (د.خ) بۆ سودی تاقمێ یا سەرکەوتنی موسڵمانان، یا کارێکی وا بووایە بە هۆی ترس و خەفەت، وەك کۆبونەوەی دوژمنان، یا توشبوونی زیانی ئەو تاقمانە ئەنێردران بۆ ڕونکردنەوە چۆنیەتی هێزی بێ باوەڕان ئەوان ئەو هەواڵانەیان بڵاوئەکردەوە، بێ ئەوەی بزانن ئەو کارەساتانە چۆن بووە؟

بەو بۆنەوە زیان و ترس لە نێو کۆمەڵانی موسڵماناندا پەیدا ئەبوون، چونکە ئەو هەواڵانە ئەگەر ڕاست بونایە ئەبون بە هۆی لاوازی موسڵمانان و ەپەرێشانیان و، ئەبونە هۆی ئامادەکردنی دوژمنان و خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ جەنگ، ئەگەر ئەو هەواڵانە، درۆ بونایە ئەبونە هۆی دوودڵی باوەڕداران و خەفەت خواردنیان.

﴿ وَلَوْ رَدُوهُ إلى ارسُولِ وأوْلِى الأمْرِ مِنْهُمْ ﴾ وەئەگەر ئەوان ئەو هەواڵانە گفتوگۆیان لێ ئەکرد بیان گێڕایەتەوە بۆلای نێرراوی خواو ئەو بڕیاری لەسەر بدایەو، بۆلای هەندی لە

خاوەن فەرمانەکانی هاورێکانی پێغەمەر لە خۆیان، ئەگەر بیانزانیبایە بڵاوکردنەوەی خاوەن سودە فەرمانیان ئەدا بە بڵاوکردنەوەی، ئەگەر بیان زانیبایە زیا بەخشە بڵاویان نەئەکردەوە، هەرچۆنێ بێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بە چاکی بیزانیبایە ئەی‌کردو موسڵمانان توشی ناخۆشی نەئەبوون.

﴿ لَعَلِمَهُ الذينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ ﴾ بە ڕاستی ئەو هەواڵەیان ئەزانی چۆن باسی بکەن کەسانێکی ئەوتۆ دەری بخەن ئەو هەواڵەو ئەنجامەکەی بۆ پاشەڕۆژ، چونکە ئەو کەسانە خاوەن زانست و زیرەك و کارامەن و خاوەن تاقی‌کردنەوەن بە کاروباری سەربازی پێویستی جەنگ کردن.

چاکترین کار ئەوە بوو ئەو کەسانە ئەو شتەی ئەیان بیست لە هەواڵی سەربازی بڵاویان نەکردایەتەوەو خۆیانیان بگرتایەو ڕایان گەیاندا بەسەر پێغەمەرو پیاوە گەورەکانی سەربازی کە ئەوان باشتر هەواڵ و پێویستی سەربازیان ئەناسی.

﴿ وَلَوْ لا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لا تَبَعْتُمُ الشَّيْطانَ إلاّ قَلِيلاً ﴾ وەئەگەر مەزنی خوا نەبوایە بەسەر ئێوەوە کە پێغەمەری بۆ ناردون لێتان بورو، بەزەیی و میهرەبانی خوایش نەبوایە قورئانی بۆ ناردون و فێری خوناسینی کردن بە ڕاستی ئێوە پەیڕەوی شەیتانتان ئەکردو گومڕای ئەکردن مەگەر کەمێ دوای شەیتان نەکەوتنایە، خوا پاراستنی لەپەژادو دوودڵی شەیتان بە هۆی ژیری خۆیانەوە، ئەو کەسانەیش وێنەی قەسی کوڕی ساعیدە. وەرەقەی کوڕی نەوفەل. زیدی کوڕی عەمر بو حەیرای ڕاهیب. سەیفی کوڕی زی‌بەزن. کەسانی تری وێنەی ئەوان کە باوەڕیان بە یەکێتی خواو ناردنی پێغەمەر هەبوو بەر لەڕوانە کردنی بۆ سەر ئادەمیزاد.

پاش جەنگی ئوحود ئەبو سوفیان بە پێغەمەری ووت: وادەمان کاتی جەنگی بەدربێ لەساڵی داهاتوودا جەنگێ تر ئەکەینەوە. کە ساڵ کۆتایی پێ هات و وادە کەهات و کەوتنەی مانگی زیلقە عیدە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دانیشتوانی بانك کرد بۆ چونە دەرەوەو جەنگ کردن، هەندێ لە دانیشتوان ئەو جەنگەیان لاگرانبوو. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:

ئەگەر خۆم بە تەنها چومەتە دەرەوە ئەڕۆم، لە پاشا خۆی و حەفتا کەس چوونە دەرەوەو گەیشتنە شوێنی دیاری کراو، توشی هیچ خوایە نەبوون، خوا بە گەورەیی خۆی و پاراستنی و بەبێ وەیی و بەسەر بەرزی گەڕانەوە بەبێ جەنگ، بۆ ئەو مەبەستە خوا فەرموی:

فَقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾

﴿ فَقاتِلْ فِي سَبِيْلِ الله لا تُكَلَفُ إلاّ نَفْسَكَ ﴾ دوایی تۆ جەنگ بکە لە ڕێگەی ئایینی خوادا ئەگەر بەتەنهایشبی و وازت لێ بهێنن، بۆ پاراستنی ڕاستی و مافی ئایین داوا لە تۆ ناکرێ مەگەر هەر خۆت بۆ جەنگ کردن و ئەو کەسانەی وولامی تۆ ئەدەنەوە بۆ چونە دەرەوە بۆ جەنگ کردن، تۆ واز لەو کەسانە بهێنە واز لەتۆ ئەهێنن، پرسیاری ئەوانت لێ ناکرێ، هەرخۆت پرسیار لێ کراوی.

﴿ وَحَرِضِ المُؤمِنِينْ ﴾ وەتۆ هانی باوەڕداران بدە بۆ جەنگ کردن، ئامۆژگاریان بکە بەوەی پاداشت و تۆڵەو سەرکەوتن و بە دەست هێنانی پلەو پایە بە پەیڕەوی کردنی تۆیە هەر ئەوانەت لە سەرەو بەس، توندو تیژی لەگەڵیان مەکە.

وەك باسمان کرد پاش ئەوەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هانی باوەڕدارانی دا خۆی و حەفتا کەس چونە دەروە بۆ جەنگ.

﴿ عَسى الله أنْ يَكُفَّ بَأسَ الذينَ كَفَرُوْا ﴾ بۆ ئەوەی شایستەبێ بۆ ئێوە کە خوا قەدەغە بکا هەڵمەت و ئازایی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوەو ترسی ئێوە بخاتە دڵیان.

هەروایشبو بت پەرستانی قورەیش ترس کەوتە دڵیان و لە کاتی دیاری کراودا نەهاتنە دەرەوە، پێغەمەرو هاوڕێکانی بەسەر بەرزی گەڕانەوە.

﴿ واللهُ أشَدُ بأساً وَأشَدُ تَنكيلاً ﴾ وە خوا هەڵمەتی گەورەترو سەخت ترە لە پت پەرستان وەسزای سەختەو گەورەترە بۆبێ باوەڕان.

لە پاش ئەوەی زانرا کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خوا هەر داوای لە خۆی کردو خۆی لێ پرسراویی خۆێتی، خوای گەورە بۆیشمان ڕون ئەکاتەوە کە بە ڕاستی بۆ پێغەمەر هەیە بەشێکی زۆر فراوان و زۆر لە پاداشت، بە هۆی خۆماندو کردنی لە هاندانی موسڵمانانانداا بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕان. ئەفەرموێ:

مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ سَيِّئَةٗ يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَاۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾

﴿ مَنْ يَشْفَعْ شَفاعَةَ حَسَنَةَ تِكُنْ لَهُ نَصِيبٌ مِنْها ﴾ هەر کەسێ یاریدەی کەسێ بدا، پێش نیاری چاك بکا بۆ ئەوەی مافێکی ڕەوا پێك بێت و کەسێ سوودی لێ وەربگرێ، یا بۆ ئەوەی زیان و ئازار هەڵگرێ، بۆ ئەو کەسە داخوازی کەرە ئەبێ بەشێکی گەورە لە پاداشتی ئەو پێش نیازەی بۆ ئەبێ.

﴿ وَمَنْ يَشْفَعْ شَفاعَةً سَيِّئَةً يَكُنْ لَهُ كُفْلٌ مِنْها﴾ وەهەرکەسێ پێشنیازێکی خراپ بکا بۆ ئەوی مافێکی ڕەوا لە دەست بچێ و زیان بە کەسێ بگا، بۆ ئەو کەسە ئەبێ بەشێ لە تۆڵەو سزای ئەویێش نیازە خراپەی کردوێتی.

﴿ وَكانَ اللهُ عَلى كُلِّ شَيءٍ مُقيتاً ﴾ وەخوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا هەیە، ئاگاداری هەموو شتێکە، پاداشتی چاکەی خاوەن چاکە ئەداتەوە، تۆڵە لە داواکەری خراپە ئەسێنێ.

ئەو ئایەتە هەرچەندە هاتۆتە خوارەوە دەربارەی هاندانی جەنگ کردن لە ڕێگەی خوادا بەڵام هەموو داواکاری و داخوازییە ئەگرێتەوە لە چاك و لە خراپ. ئایینی پیرۆزی ئیسلام پیرۆزبایی لە هەموو کارێکی چاکە ئەکا، ئیتر پەیڕەوی کردنی کارێکی چاکبێ با لە کەسێکی بێ باوەڕەوە دەرچێ. کەواتە ئەوەی گرنگبێ لای ئیسلام ئەمەیە ئەو شتە بە چاکە ناوببرێ لای ئیسلام و زیانی کەسی تێدا نەبێ، ئەبێ ئەمەیشمان لەبیر نەچێ چاکە بەهەر شێوەبێ و لەهەر کەسێکەوە دەرچێ، لە باوەڕدارێکەوە بێ یا بێ باوەڕێکەوە ئەو شتەی لەبەر ئەوەی چاکەو بەسوودە بە پەیڕەوەکانی ئیسلام دائەنرێ، هەروەها ئیسلام نەفرەت ئەکا لە هەموو خراپەو ستەمێ لەهەرکەسێکەوە ڕوبدا.

خوای مەزن پاش باس کردنی ئەو مەبەستانە فەرمان ئەدا بە داواکردن و پاڕانەوە بۆ پایەداری خۆشی و دۆستایەتی لە نێو ئادەمیزادا بە بڵاوکردنەوەی سڵاو لە یەکتری (التحية) وە بە وەڵامدانەوەی ئەو سڵاوە بە وێنەی خۆی یا بەزۆرتر لەو سڵاوە، وە ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْها أَوْرُدُّوها﴾ وە هەر کاتی ئێوە داوای ژیان و زیندویتان بۆ کرا بەهەر شتێ بێ، یانێ بە ئێوەیان ووت: خوا ژیان و مانەوەتان بداتێ، دووایی ئێوە لە وەڵامی ئەو کەسەدا ژیان و زیندویی لەوان بکەن بە شیرینتر لەو ژیان باشییەی ئەو یا ووڵامیان بدنەوە بە ئەندازەی وێنە ڕۆژ باشی ئەوان. واتە ئەگەر بێژرا بە

ئێوە. (السّلام علیك) ئێوەیش وەڵامی بدنەوەو بە شیرینتر لەوەی ئەوان و بلێن: (علیك السلام ورحمه الله) یا وولاّمیان بدنەوە بە ئەندازەی سلاّوی ئەوو بلێن: (علیك السلام).

بەو جۆرەی باس کرا مەبەست لەو ئایەتە سلاّوکردن و، ولاّمدانەوەیە. بەلاّم لای ئەو کەسانە سەر بە حەنەفیەکانن ئەڵێن: مەبەست لە (التحیة) دیاری بردنە بۆ یەکتری. یانێ ئەگەر کەسێ دیاری بۆ ئێوە هێنا، پێویستە دیاری بۆ بنێرنەوە بە ئەندازەی ئەو دیاریە یا زۆرتر لەو دیاریە.

ئادەمیزاد لە کاتی گەیشتن بە یەکتری مەرحەبایی یەکتری ئەکەن، هەر نەتەوەیە بە ڕستەیەو بە ووشەیەو بە شێوەیەکی تایبەتی مەرحەبایی ئەکەن، هەندێکیان بە زمان و بە ووشەی تایبەتی، هەندێ تریان بە کردارو بە جم وجوڵێکی تایبەتی.

عەرەبەکان ئەڵێن: (صباح الخیر، مساء الخیر، حیاك الله، أنعم صباحا، صبح الله بالخیر، مساك الله بالخیر، السلام علیك، مرحبا الله بالخیر) ئەوانە بە زمانن، هەندێکیان باوەش بە یەکتریدا و یەکتری ماچ ئەکەن، قاچی کەسێ ماچ ئەکەن. چەند شێوەیەتر. نەتەوەی کورد ئەڵێن: ڕۆژباش. مەرحەبا. السلام علیك. ئەم کاتەت باش. ئەوانە بە زمان ئەیڵێن. لەگەڵ ئەوانەیشدا وائەبێ باوەش ئەکەن بەیەکتریدا، هەندێ یەکتری ماچ ئەکەن، وایش ئەبێ دەستی یەکتری ماچ ئەکەن، بە تایبەتی بۆ زانایان و پیاوچاکان. قاچ ماچ کردن بۆ یەکێ تر، بە تایبەتی بۆ پیرانی تەریقەتیان لەلایەن پەیڕەوەکانیانەوە، هەندێ جاریش سەرشۆڕکردن.

هەروەها نەتەوەکانی تریش هەریەکەیان بە زمانی خۆیان، بە جۆری ڕستەی باوی نێو خۆیان ڕۆژباش لە یەکتری ئەکەن. بە تایبەتی نەتەوەیی فارس سەرشۆڕکردن. بۆ یەکتری. بە زۆری دەستی ئاخونەکانیان ماچ ئەکەن.

بەلاّم ئەوانەی پێشوو زۆربەیان پەسەندنین، بە تایبەتی سەرشۆڕکردن و قاچ ماچ کردن بۆ هەموو کەس و دەست ماچ کردنی پیاوانی ستەمکارو یەك ماچ کردن بە تایبەتی کوڕانی بێمو، ئەوانە هەمویان لای ئیسلام قەدەغەن.

ئیسلام هەروەك ڕستەی (لا إله إلا الله، محمد رسول الله)ی کردوه بە دروشمی ئایینی خۆی بە گوێرەی بیروباوەڕ، هەروەها (السلام علیك) ی کردوه بەمەرحەباو ڕۆژباش بۆخۆی لەگەڵ دەست گوشینی یەکتری لەبەر ئەمانەی خوارەوە:

(١) بۆ ئەوەی ڕونی بکاتەوە بۆ ئەوەی پرۆگرامی خۆی و بەو ڕستەیە بلاوبکاتەوە بە نێوو دانیشتوانا.

(٢) ئاشتی خوازیی و بەرگری لە دەست درێژی (٣) بۆئەوەی هەموو کاتێ ناوی خوا لەسەر زمانیانبێ، چونکە (السلام) ناوێکە لە ناوەکانی خوای مەزن.

﴿ إنّ الله عَلی کُلّ شَيْءٍ حَسِيباً ﴾ بە ڕاستی خوا پرسیارکەرە لەسەر هەموو شتێ بە تایبەتی سلاو کردن و وولامدانەوەی. کەواتە چاودێری باویی سلاو بکەن بەو جۆرەی ئیسلام فەرمانی پێداوە، وەخوا بەسە بۆ هەموو بونەوەران.

بۆ زانین: سلاوکردن چاکەی زۆرە بۆ پەرەپێدانی خۆشەویستی لە نێوان ئادەمیزاد، پێویست نەکراوە لەلایەن ئایینەوە، ئەگەر لەنێو کۆمەلێکدا یەکێکیان سلاویی کرد ئەو کەسانە هەمویان چاکەیان بۆ ئەنوسرێ، هەرچەندە چاکتر بۆ هەموویان ئەوەیە هەمویان سلاوبکەن، ووتنی سلاو بە دەنگی بەرز چاکترە. بەلام وولامدانەوەی سلاو پێویستەو وولام نەدانەوەی گوناهە، ئەگەر سلاو لە کۆمەلێ کرا یەکێکیان وولامی دایەوە گوناهبار نابن، هەرچەندە چاك وایە هەموویان وەلامی سلاو بدنەوە.

جۆری سلاوکردن لە یەکتری: کەسێ سواری شتێ بێ سلاو، لە پیادە بکا. ڕاوەستاو لە دانیشتوان ژمارەی کەم لە ژمارەی زۆر بچوك لە تەمەنی زۆرتر لە خۆی. قوتابی لە مامۆستا. زوربەی دانیشتوان لە زانایان :

ئەمانە چاك وایە سلاویان لێ نەکری. ئەو کەسانە دەست بە ئاو ئەگەیەنن. ئەو کەسانە خۆیان ئەشۆرن لە گەرماداو، لە خەوتوەکان ووەنەو زدەران، نوێژکەران و قورئان خوێنیان و بانگ دەرانی نوێژو ئامۆژگاری کەران، لەوانە ووتوەکان و خوتبە خوێنانی

هەینی.ئەوانە هەموویان وا چاکە پێش دەستی نـەکرێ لـە سـلاوکردن لێیـان، مەگـەر وا پێویستبێ سلاوبکرێ لەوان لەبەر هەندێ هۆی پێویستی، ئەگەر ئەوان لە پێشەو سلاویان کرد وولامدانەوەیان پێویست نیە.

﴿ اللهُ لا إله إلاّ هُوَ لَيَجْمَعَنَكُمْ إلى يَوْمَ الْقِيامَةِ ﴾ خوا کەسێکە هیچ خوایە نیـە پەرسـتنی بۆ بکرێ و شایانی پەرستنبێ مەگەر هەر ئەو خوایە تـاک و تەنهایـە بـە ڕاسـتی خـوا ئێـوە کۆئەکاتەوە بۆلای ڕۆژی هەڵسانەوەتان لە کورەکانتان و بۆلای پاشەڕۆژ.

﴿ لارَيْبَ فِيهِ وَمَنْ أصْدَقُ قَوْلاً مِنَ اللهِ ﴾ گومان لە هاتنی ئەو ڕۆژەدانیە کە ئێوەی تێدا کۆئەکرێتـەوە. بەڵگـە لەسـەر بونـی ڕۆژی دووایـی زۆرن لای ئـەو کەسـانەی ژێـرو دادپەروەرن ئەو کەسەی ئەم بونەوەرانەی دروسـت کـردووە لـە نەبوونـەوە. بـە تایبـەتی ئادەمیزاد بەبێ کەرەسەی پێشەکی، خاوەنی توانایە بـۆ جـارێکی تـر لـە پاشـا زیندوویـان بکاتەوە لەسەر ئەو کەرەسە پێشوانەو، چ کەسێکە ڕاست گۆتر لەخوا لەلایەن هـەواڵدان و موژدەدان و هەڕەشە کردنەوە. بێگومان فەرموودەو بەڵێنی خوا ڕاستە.

کۆمەڵێ لە عەرەبەکان هاتن بۆ مەدینەو باوەڕیان هێنابە سەرزارەکی، لە دووایـیـدا کـە گەڕانەوە بۆ مەکە بونەوە بە بت پەرست. لە پاشا چون بۆ وولاتـی یەمامـە بـۆ بازرگـانی، موسڵمانان لەو کاتەدا بون بە دووپارچە. هەندێکیان ووتیان: جەنگ لەگەڵ ئـەو کەسـانە ناکەین، چونکە باوەڕیان هێناوە، هەندێ تریان ووتیان: ئەو کەسـانە بوونـە تـەوە بـە بـت پەرست و ئەچین و جەنگیان لەگەڵ ئەکەین. خوای مەزن بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەسـتە ئەفەرموێ:

فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ

أَضَلَّ ٱللَّهُ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿٨٨﴾ وَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا۟ فَتَكُونُونَ سَوَآءً فَلَا تَتَّخِذُوا۟ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَلَا تَتَّخِذُوا۟ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَٰتِلُوا۟ قَوْمَهُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾

**﴿ فَما لَكُمْ فِي الْمُنافِقِينَ فِئَتَيْنِ ﴾** دوابی چ شتێ بۆ ئێوە پەیدابووە لە فرمان و کاری نێو دووڕووەکان ئێوە بوون بە دووتاقم: هەندێکیان لاتان وایە ئەوان موسڵمانن، هەندێ ترتـان لاتان وایە بێ باوەڕو دووڕون، پێویست و شایستە وایە، بـۆ ئێـوە ئەوەیـە لـە نێـو خۆتـان نەکەونە ئاژاوە. بەڵکو پێویستە لـەسەرتان یەك بیرو یەك باوەڕتـان هـەبێ و، وا بزانـن ئـەو کەسانە لە ئایین وەرگەڕاونەتەوە، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

**﴿ وَاللهُ أَرْكَسَهُمْ بِما كَسَبُوا ﴾** وەخوا فـەرماندانی ئـەو کەسـانەی گێڕاوەتـەوە بـۆلای فەرماندانی بێ باوەڕە جەنگ کەرەکان لەوەی دروستە کوشتنیان و دیل کردنیـان، لـەبـەر

ئەوەی وێنەی بێ باوەڕە جەنگ کەرەکانن یازیانیان زۆرترە بە هۆی ئەو شتەی کردویانە لە مانەوەیان لەنێو بت پەرستان و سودیان بۆ ئەوان هەیە بە تەنها.

﴿ أَتُرِيدُونَ أَنْ تَهْتَدُوْا مَنْ أَضَلَّ اللهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيْلاً ﴾ ئایا ئێوە ئەتانەوێ کە ئێوە ڕانموویی کەسێ بکەن خوا ڕێگەی ڕاستی لێ وون کردوەو، هەرکەسێ خوا ڕێگەی لێ وون بکا و لە ڕێگەی ڕاست لای بدا، دووایی تۆ دەستت ناکەوێ ڕێگەیە بۆ ڕانموویی کردنی و شارەزایی کردنی بۆلای ڕێگەی ڕاست.

پرسیار / لە ڕستەی پێشودا خوای مەزن فەرموی: خوا ئەو ڕووداوانەی گێڕاوەتەوە بۆلای بێ باوەڕی بە هۆی کردەوەی خۆیان و هەڵبژاردەی خراپی خۆیان کەچی لەم ڕستەیەدا ئەفەرموێ: خوا ڕێگەی لێ تێکداون، گومڕایی ئەوانی داوەتە پاڵ خۆی، دوای ئەوەی لە پێشەوەدا بویە پاڵ خۆیان، هۆی کۆبونەوەی ئەو دوو ڕستەیە چۆن ئەبێ؟

وەڵام / مەبەست لە گومڕای کردنی خوا ئەوەنیە خوا گومڕای لەواندا دروست ئەکا، چونکە خوا میهرەبانەو کاری وا لەگەڵ بەندەکانی خۆی ناکا. بەڵکو مەبەست ئەوەیە ئەو کەسانە لە ڕێگەی ڕاست و وەرگرتنی ڕانموویی لایانداوە بە ویستی خۆیان، ڕێگەی پوچیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە. بێگومان خوا وازیان لێ ئەهێنێ و کاری خۆیان، بە خۆیان ئەسپێرێ، ئەوەیش جۆرە خەشمێکی خوایە لەوان، بێگومان بە هەوەس و سەربەستی خۆیان جگە لە گومڕای شتێ تریان بۆخۆیان هەڵنەبژاردووە.

بە شێوەیە تری ڕوون ترو وڵامی ئەو پرسیارە ئەدرێتەوە: هەر کەسێ ڕێگەی ڕاستی گرت بە ویستی خۆی خوای مەزنیش میهرەبانی خۆی ئەڕێژێ بەسەریاو بێگومان بۆ سەرکەوتن چاودێری ئەکا، ئەو میهرەبانیەی خوا بەو شێوەیە پێی ئەبێژرێ ڕانموی سەرکەوتن و سەرداری خوای مەزن. هەرکەسێ بە ویستی خۆی ڕێگەی پوچی گرت بێگومان خوا وازی لێ دێنێ و، بە زۆرو تۆپزی نای گێڕێتەوە بۆلای ڕانموویی و هەموو ڕێگەیەکی تری لێ نابەستێ هەتا بگەڕێتەوە بۆلای ڕانموویی و ڕێگەی ڕاست. کەواتە خوا هیچ کەسێ گومڕاناکاو نەیشی کردوەو نایشی کا.

بۆ زانین: میهرەبانی خوا پێویستی ئەکا کە خاوەنی بەزەیی بێ بۆ بەندەی خۆی و وازی لێ نەهێنێ بە تەواوی، وێنەی دایك لەگەڵ منالّی خۆی، بگرە خوا میهرەبانی زۆرترە، مەگەر بەندەی خوا خۆی وا لێ بکا کە خوا میهرەبانی خۆی نەڕێژێ بەسەریا بە هۆی ئەو شتەی خۆی بۆ خۆی هەڵی بژاردوە لە نە پەرستنی خوا، بەو بۆنەوە خۆی ئەخاتە نێو گێچ داوی قوڵ و پانی گوناهەوە، دایکیش واز لە منالّی خۆی ئەهێنێ لەو کاتەدا دەست بدانە ئازاردانی دایکەکەی، ئەوەیش زۆر ڕونە لامان.

﴿ وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً ﴾ وە ئەو کەسانە وەرگەڕاون لە ئایین و بە ڕاستی باوەڕیان نەهێناوە پێیان خۆشەو ئاوات ئەخوازن بۆبێ باوەڕکردنی ئێوە بەو جۆرەی خۆیان باوەڕیان نەهێناوە، دوایی ئێوە یەکسان بن لەگەڵ ئەوان لە بێ باوەڕی و گومراییدا کەواتە ئەو کەسانەی بێ باوەڕی جگەی خۆی پێ خۆشبێ نیشانەی ئەوەیە خۆی لەژێرەوەو لە دڵیا بێ باوەڕە، ئیتر بە ڕواڵەت با باوەڕیش بهێنێ، ئەویش زۆر ڕاستە کە هەموو کەسێ لای چاکە هەموو ئادەمیزاد لەسەر شێوازی خۆی بێ لە بیروباوەڕدا پاش ئەوەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کۆچی کرد بۆ مەدینە پێویستی کرد لەسەر هەموو موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ مەدینە مەگەر توانای کرچیان نەبێ، یا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی مانەوەیان بدا لەبەر سودی گشتی موسڵمانان، کۆچ کردن لە مەکە بەردەوامبوو هەتا شاری مەکە لەلایەن موسڵمانانەوە وەگیرا. بۆیە ئەفەرموێ:

﴿ فَلا تَتخِذُوا مِنهُمْ أوْلِياءَ حَتى يهاجروا فِي سَبيلِ اللهِ ﴾ دوایی ئێوە وەرمەگرن ئەو دووڕوانە بە دۆستی خۆتان و داوای یارمەتی و کۆمەکیان لێ مەکەن بۆ هیچ شتێ هەتا ئەوان کۆچ ئەکەن لە ڕێگەی پەرستنی خواداو بەس، خۆیان وەك ئێوە لێ ئەکەن لە قازانج و زیاندا.

﴿ فَاِنْ تَوَلُوا فخذوهم وَأقْتُلُوهُمْ حِيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئەو کەسانە وازیان لە جێگەی بێ باوەڕان نەهێناو کۆچیان نەکرد بۆ مەدینەو باوەڕیان نەهێناو خۆیانیان

نەگەیاندە لای پێغەمەرو موسڵمانان، دوایی ئێوە پێویستە ئەوان بگرن و بیان گوژن لە هەر جێگەیە ئەوانتان دەست کەوت ئەگەر توانیتان لەمەکەی پیرۆزبێ لە مەدینەیا لە دەروبەری ئەوانبێ.

﴿ وَلا تَتَخِذُوا مِنْهُمْ وَلَياً وَلا نَصِيراً ﴾ وە ئێوە ئەو دووڕوانە وەرمەگرن بە دۆست و یاریدەری خۆتان، مەیشیان کەن بە هاوسوێندی خۆتان، بە تەواوی وازیان لێ بهێنن بە هەموو جۆرێ.

پرسیار / بێگومان ئایینی ئیسلام ئایینی سەربەستی و چاوپۆشی کردنە لەگەڵ هەموو خاوەن ئایین و خاوەن پەیڕەوانی تر، یاساو نەریتیان پارێزراوە لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەیاندا، خۆیان و مافیان و داراییان ئەپارێزرێ خاوەنی هەر بیرو باوەڕو ئایینی بن. ئەوە بۆچی لێرەدا خوا فەرمانی داوە بە دیل کردن و کوشتنی دوو ڕوەکان لەهەر جێگەیەبن؟

وەڵام/ هەموو تیرەو خاوەن ئایینەکان، بگرە ئەوانەیش بڕیاری نەبوونی خوا ئەدەن ئەتوانن بیرو باوەڕی خۆیان دەربڕن، بەو مەرجەی دژایێتی دانیشتوانی ئادەمیزاد نەکەن و زیانیان بۆ ڕەوانە بینن، فێڵ و فرنەسازێنن و یاریدەی کاری پوچ و ناڕەوا نەدەن و خۆیان بەبێ لایەن بگرن، ئەوانە ئەتوانن بەبێ جیاوازی وەك موسڵمانان بژین. بەڵام ئەو دووڕووانە بە ڕواڵەت باوەڕ دەرئەبڕن لەبەر پاراستنی خۆیان، لە وڵاتی بێ باوەڕاندا دائەنیشن و ئەیانەوێ فێڵ لە موسڵمانان بکەن و کاری خراپەیان بۆ بسازێنن و یاریدەی دوژمنانی ئیسلام بدەن، ئەو کەسانە پێویستە تۆڵەی خۆیان وەربگرن، فەرماندان بە گرتن و کوشتنیان لەبەر ئەو هۆیانەیە. کەواتە ئەو دووتاقمە هەریەکەیان پاداشتی کرداری خۆیان وەرئەگرن.

پرسیار / لە ئایەتی (٦٣) ئەم سورەتەدا ئەفەرموێ و فەرمان ئەدا بە چاو پۆشیی کردن لەگەڵ دوو ڕوەکاندا وێنەی تیرەو خاوەن بیروباوەڕەکانی تردا لەبێ باوەڕان کەچی لەم ئایەتەدا بڕیاری داوە بە گرتن و کوشتن و دیل کردنی بێ باوەڕە دووڕوەکان.

وەڵام / ئایەتی (٦٣) هاتوەتە خوارەوە دەربارەی ئەو دووڕووانە لەگەڵ پێغەمبەردابوون لە مەدینەو، توانای ئەوەیان نەبووە یارمەتی بت پەرستان ودوژمنانی پێغەمبەر بدەن لە بەردوری ئەو دووڕووانە لە وڵاتی بت پەرستان و نزیکیان لە پێغەمبەرو هێزی موسڵمانان.

بەڵام ئایەتی (٨٩) ی ئێرە هاتوەتە خوارەوە دەربارەی ئەو دووڕووانە لە وڵاتی بت پەرستانن و دورن لە پێغەمبەرەوە ئەتوانن فێڵ بکەن لەگەڵ موسڵمانانداو، ئەو کەسانە مافی دوژمنایێتی خۆیان وەرئەگرن. موسڵمانان بەر لەوەی خاوەنی توانابن فەرمانیان پێ درابوو بە ئارام گرتن لەگەڵ بێ باوەڕانی مەکەیش، وەك لە ئایەتی (٧٧) ی ئەم سورەتەدا فرمانیان پێ درابوو، ئێستا موسڵمانان خاوەنی هێزو توانان.

خوای مەزن پاش ئەوەی فەرمانی دا بە تۆڵە سەندن لەو دووڕووانە دوژمنی کاری گەری موسڵمانن، دوو تاقمی تر لەو دوو ڕووانەی دەرکرد، پێویستە چاوپۆشیان لێ بکرێ و وازیان لێ بهێنرێ.

١- ﴿ إلاّ الذينَ يَصِلُونَ إلى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِثاقٌ ﴾ مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ پەنا ببەنە لای تاقمێ و بچنە لایان کە لە نێوان ئێوەو لە نێوان ئەواندا پەیمانی جەنگ وەستان هەبێ وەك هۆزی خوزاعە. یا بەنی بەکرو بەنی سەلیم کە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بڕیاری دابوو هەرکەسێ پەناببات بۆلای ئەوان دەستی بۆ نەبرێ بە دیل کردن یا بە کوشتن، چونکە ئەو کەسە وازی لە دوژمنایێتی موسڵمانان هێناوە. ئەو ئایەتە موژدەیێکی زۆر گەورەیە بۆ باوەڕداران لە جێگەیە ئەو کەسانە پەنایان بردووە بۆلای ئەو کەسانە هاوسوێندی موسڵمانانن کە دیل و کوشتنیان لەسەر هەڵئەگرێ کەچی هەردوولایان بێ باوەڕن، ئەبێ چاکتر سزا لەسەر ئەو کەسانە هەڵگیرێ باوەڕداران و پەنا ئەبەن بۆلای خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە ڕۆژی دوواییدا.

٢- ﴿ أوْ جاءَكُمْ حَصِرَتْ صُدُرُهُمْ أن يُقاتِلُوكُمْ أوْيُقاتِلُوا قَوْمَهُمْ ﴾ یا مەگەر ئەو کەسانەی هاتوون بۆلای ئێوە دڵیان تەنگەولایان ناخۆشە کە جەنگ لەگەڵ ئێوە بکەن و

یاریدەی خزمانی بت پەرستانی خۆیان بدەن، یا جەنگ بکەن لەگەڵ ئێوەدا لە کاتی جەنگ کردنی ئێوە لەگەڵ خزمانی خۆیان، هاتونەتە لای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ داوایان کردووە لە پێغەمەر بەبێ لایەنی ئەوەستن نە لەگەڵ ئێوەبن و نەلەگەڵ دوژمنانی ئێوەبن، وەك هۆزی بەنی مەدلەج کە پەیمانیان دابوو بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نە جەنگ لەگەڵ ئەو بکەن، نەلەگەڵ خزمانی بێ باوەڕی خۆیان. ئەو دوو تاقمەیش کە ئاوابێ لایەنین پێویستە ئێوە وازیان لێ بهێنن و نەیان گرن و نەیان گوژن و دیل نەکرێن. ئەبێ لەبیرمانبێ چ شتێ بێ لەوە ڕونتر کە ئیسلام ئاشتی خوازە لەگەڵ ئاشتی خوازان، جەنگاوەرە لەگەڵ جەنگەران.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ ﴾ وە ئەگەر خوا ئارەزووی هەبوایە بە ڕاستی ئەوانی زاڵ ئەکرد بەسەر ئێوەدا، دڵی ئەوانی بەهێز ئەکردو ترسی ئێوە لە دڵیانا نەئەماو وازیان لە ئێوە نەئەهێنا، دوایی ئەوان بە ڕاستی جەنگیان ئەکرد لەگەڵ ئێوە. بەڵام خوا ئارەزووی نەکردبوو، بۆیە جەنگیان لەگەڵ ئێوە نەکرد.

﴿ فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقاتِلُوكُمْ وأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَم ﴾ دوایی ئەگەر ئەوان وازیان لە ئێوە هێناو جەنگیان لەگەڵ نەکرد، ئێوە ئەیشتانزانی ئەتوانن جەنگتان لەگەڵ بکەن و، فڕەیاندا بۆلای ئێوە ئاشتەوایی و بە ئێوەیان ڕاگەیاند خۆ بەدەستەوە دان و مل کەچی بۆ ئیسلام.

﴿ فَما جَعَلَ اللهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبيلاً ﴾ دوایی خوا نەی گێڕاوە بۆ ئێوە ڕێگەیە بۆلای جەنگ کردن لە گەڵیان، دەستوری نەداوە گرتن و دیل کردنیان و کوشتنیان.

ئەو ئایەتە پیرۆزەو چەندین ئایەتی تر نیشانەی ئاشکران کە ئایینی ئیسلام بانگی هەموو ئادەمیزاد ئەکا بۆلای بلاوکردنەوەی خۆشیویستی وئاشتی و برایێتی و یەکسانی و یارمەتیدانی یەکتری و بۆلای هەموو شتێ کە چاکەو سودی ئادەمیزادی تێدابێ لە هەمو وگۆشەو کەناری ئاوەدانیدا، لە هەموو شتێ دەرکەوتووتر ئەمەیە: ئیسلام کارکردن بە چەسپاندنی مرۆڤایێتی لە ناخی دڵییەوە هەڵقوڵاوەو بەشێکە لە بیروباوەڕی و یەکەمین

ڕێگەیە بۆ خواپەرستی، بە گوێرەی کات و شوێن و ڕامیاری گۆڕانی بونیەو هەمیشە پایەدارە.

لە دوای ئەوانەی پێشوو خوا بۆمانی ڕون ئەکاتەوە کە هۆزی ئەسەدو غەتفان و عەبدولدار نوێنەریان هاتن بۆ مەدینە، بە ڕواڵەت موسڵمان بوون و باوەڕیان هێنا هەتا لە هەڵمەتی موسڵمانان ڕزگاریان بێ، لە پاش گەڕانەوەیان بێ باوەڕ بوونەوە، هەرکاتێ خزمەکانیان داوایان بکردنایە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانان ووڵامیان ئەدانەوەو لەگەڵیان ئەچوون بۆ جەنگ لە دژی موسڵمانان.

بۆ ئاگادارکردنی موسڵمانا لەسەرکردەوەی خراپییان خوا ئەفەرموێت:

سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُواْ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوٓاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿٩١﴾

﴿ سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أنْ يُأمَنُوكُمْ وَيأمَنُوا قَوْمَهُمْ ﴾ لەمەو دوا ئێوە تاقمێ ترتان دەست ئەکەوێ ئەیانەوێ کەمترسیان لە ئێوە نەبێ و دڵنیابن بە هۆی ئەوەی بە دووڕی باوەڕ ئەهێنن هەتا خۆیان و سامانیان پارێزراوبێ و ترسیشیان لە خزمەکانی خۆیان نەبێ بەدەر برینی بێ باوەڕیش لای ئەوان، هەتا ئەوانیش پەلاماریان نەدەن.

﴿ کُلَما رُدُوا إلى الْفِتْنَةِ أرْكِسُوا فيها ﴾ هەموو کاتێ ئەو تاقمە بانگیان بکرایە بۆلای بت پەرستی ئەگەڕانەوە بۆلای بێ باوەڕی، یا بانگ بکرانایە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ

موسڵمانان سەریان پێوەنەبوو، ووڵامیان ئەدانەوە ئەگەڕانەوە بۆ ناو بێ باوەڕی. ئەو کەسانە زۆر خراپتڕن لە جارانی پێشوو، هەموو گفتوگۆیکی ناپەسەند بە موسڵمانان ئەڵێن.

ئایەتەکانی پێشوو چەندین وێنەی جۆربەجۆری خراپی ئەو کەسانە بۆ دەرخستین کە پێغەمەر توشی چەندین ڕەنگی فێڵ و فڕی هەڵگەڕانەوە یان لە ئاینی خوا لەوانەوە پەیدا ئەبوو. لەم ئایەتەیشدا چەندین جۆری خراپتر لە کردەوەی نالەباری ترمان بۆ ڕون ئەکاتەوە کە ژمارەو وێنە خراپەیان تەنها لەهەرکاتێ پێغەمەردا نەبووە، بەڵکو لە هەمو کات و جێگەیەکدا زۆربەی ئادەمیزاد خاوەنی ئەو کارە خراپانەن. مەبەستیش لەو تاقمە ئەو کەسانەن لەسەر یەکبارنین، هەموو ڕۆژێ خۆیان بە جۆرێ نیشان ئەدەن، باوەڕیان بە هیچ ڕەوشتێ نیە، کاتی وا هەیە خۆیان بە موسڵمان ئەنوێنن، زۆری پێ ناچێ خۆیان بە بیروباوەڕێ تر دەرئەخەن و پڕوپاگەندە لە دژی ئیسلام ئەکەن. هەرچەندە کاتی وا هەیە ڕوداوێکی تایبەتی پاڵ ئەنێ بە هەندێ کەسەوە لە شێوەیەکەوە بۆلای شێوەیە تر بڕۆن بە ناچاری، نەك بە خوایشتی خۆیان، ئەو کەسانە ژمارەیان زۆر کەمن و خاوەنی بیانون. بەڵام ئەو تاقمە نارەسەنانە خۆ ئەگۆڕن بە هەزاران ڕەنگ کە هەمویان دژی یەکن، کاتیش هەر ئەو کاتەیەو نەگۆڕاوە، هەر ڕۆژە خاوەنی بیروباوەڕێکن لەهەر جێگەیەکەوە با بێت ئەوان شەن ئەکەن، هەموویشی بۆ پول و پارەیەو خۆ پاراستن لە ئایین و ناموس و نیشتمانی خۆیان ئەفرۆشن بە بێگانە. لەم سەردەمەی ئێمەدا ئەو تاقمە زۆرن و خۆ دورخستنەوە لەوان زۆر پێویستە.

ئەو تاقمە بەهەر جۆرێ بن و بگەنە هەر ڕادەیە لە پەستی و نامەردی، لە ڕاڕای و لە بێ باوەڕی و باوەڕهێنان، پێویستە موسڵمان وازیان لێ بهێنن با بەنا مەردی خۆیانەوە بژین. بە مەرجێ دەست درێژیی و کوشتن و دزی و بێ ڕەوشتی بەکارنەیەرن لەگەڵ دانیشتواندا ئەگەر ئەو شتانەیان کرد ئیسلام فەرمان ئەدا بە لەناوبردنیان و کوشتنیان و دیل کردنیان لەهەر جێگەیە بن، بۆیە خوا ئەفەرموی:

﴿ فَإِنْ لَمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ وَيَكُفُّوا أَيْدِيَهُمْ ﴾ دوایی ئەگەر ئەو تاقمە وازیان لە ئێوە نەهێناو دەستیان لە جەنگ کردن لە گەڵتان نەگێرایەوەو، فرێیان نەدا بۆ لای ئێوە ئاشتیو ملیان بۆ ئێوە کەچ نەکردو داوای ئاشتیان نەکرد لێتان و، دەستی خۆیان لە جەنگ قەدەغە نەکرد بەردەوام بون لە سەر جەنگ.

﴿ فخذوهُمْ وأقتلوهم حيثُ ثقفتُموهم ﴾ دوایی ئەو تاقمە بگرن و بیان کوژن لە هەر جێگەیە ئێوە ئەوانتان دەست گیر کرد.

ئەو ئایەتە بەڵگەیەکە لە دەیان بەڵگە کە قورئانی پیرۆز ئەیخاتە بەردەم خوینەواران، فەرمودەو کردەوەکانی پێغەمبەریش بۆیان ڕون ئەکەنەوە کە نەخشەی بنچینەیی ئیسلام کوشتن و جەنگیان لا ڕەوا نیە، یەکەم جار بەرپای ناکا مەگەر بۆ سەرکوت کردنی ئەو کەسانە کە دەستیان داوەتە جەنگ و بڵاوکردنەوەی خراپەکاری لە سەر زەویدا لەو کاتەدا بۆ بەرگری لە خۆیان ئەتەقنەوە بەدەم جەنگ کەراندا. کەواتە ئیسلام کاتێ جەنگ بەرەوا دائەنێ کەلەلای هەموو یاساو دەستورێ لە کۆن و تازەدا و لە هەمو جێگەیەکدا وایان دانابێ جەنگ رەوایە بە هەموو ئەقلێکەوە. کەچی لەگەڵ ئەو بەڵگانەدا ئاینی ئیسلام ئەیان خاتە ڕوو، دوژمنانی ئیسلام بەبێ شەرمانە واز ناهێنن و ئەڵێن: ئیسلام و ئاینەکەی بریتیە لە شمشێرو تیرو ئاگرو هەڵگیرسانی جەنگ.

﴿ وَأُولَئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَاناً ﴾ وە ئەو تاقمە پیاوە جەنگ کەرانە ئێمە گێڕاومانە بۆ ئێوە بەسەریانەوە بەڵگەیەکی ڕون و ئاشکرا بۆ بەرگری لە خۆتان، خوا فەرمانی داوە بە گرتن و کوشتن و دیل کردنیان، بەو بۆنەوە بێ باوەڕی و دوژمنایەتی و بێ باوەڕی و خراپی ئەوان لە ئەندازە تێنەپەڕیوە.

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی کوشتنی بێ باوەڕە دووڕووەکانی کرد. باسی ئەوانەی کرد لەگەڵ موسڵمانا پەیمانی ئاشتیان بەستوە، باسی ئەو تاقمانەیش کرد کە خاوەنی فێڵ و ناپاکین لەگەڵ موسڵماناندأن پاش ئەوانە هەموو یاسای کوشتنی ئەو کەسانەمان بۆ ئەوکاو

بۆمانی دیاری ئەکاتەوە کە کوشتنیان دروست نی‌یە لە باوەڕداران و ئەو کەسانەی هاوپەیمانی موسڵمانانن لە بێ باوەڕان و لەوانەیش خاوەنی نامەن و لەژێر سێبەری موسڵماناندان. ئەو تاقمانە نە بە دەستیان قەس و، نە بە هەڵە کوشتنیان بە فیڕۆو بەبێ خوێندن نارەوا، بەو جۆرەی لەمەو پاش باسی ئەکرێ:

بە ڕێکەوت عەباسی کوڕی ئەبی ڕەبیعە کە برای باوکی ئەبو جەهل و برای باوك و دایکی حاریسبو موسڵمان بوبو کۆچی کرد بۆ مەدینە، دایکی زۆری بیرکرد سوێندی خوارد ناچمە سێبەرەوە هەتا عەباسی کوڕم نەبینم، لەبەر دڵنەوایی دایکی ئەبو جەهل و حاریس چوون بۆ مەدینە و هەواڵی بەسەرهاتی دایکیان دا بە عەباس، داوایان لێ کرد زۆر پەرۆشەوە بگەڕێتەوە بۆ مەکە لەبەر چاوپێ کەوتنی دایکی. لە پاشا بە خۆشی بەدرەقەی بکەنەوەو بێتەوە بۆ مەدینە. ئەویش لەگەڵیان ڕۆیشت کەچی هەر لە مەدینە دەرچوون گرتیان و پێوینان کردو سەد داریان لێ دا بە یارمەتی دانی پیاوێك لە هۆزی کەنانە.

عەباس زۆر ئێشی پێ گەیشت و سوێندی خوارد: هەرکاتێ بۆم لووا ئەو پیاوە ئەبێ بکوژم، لەدوای بردنەوەی بۆ مەکە عەباسیان بەندکرد، هەروەها لە بەندا مایەوە هەتا کاتێ مەکە داگیرکرا لەلایەن موسڵمانانەوە، لە ئەنجامدا ئەویش بەرەڵا کرا، دوایی توشی کابرای کەنانی بوو، دەستی کرد بە لێدانی وازی لێ نەهێنا هەتا کوشتی، نەیزانی موسڵمان بووە، بەو بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە فەرموی:

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ

مِن قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞ فَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ وَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ تَوۡبَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ﴿٩٣﴾

﴿ وَما كانَ لِمؤمِنٍ أنْ يَقْتَلُ مُؤمِناً إلاّ خَطأً ﴾ وە دروست نی‌یە بۆ هیچ باوەڕداری کە بکوژێ باوەڕداری بە وێنەی خۆی بە ناڕەوا مەگەر بە هەڵەو بە ڕێکەوت.

﴿ وَمَنْ قَتَلَ مُؤمِناً خطأً فَتَحْريرُ قَبَةٍ مُؤمِنَةٍ وَدَيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إلى أهْلِهِ ﴾ وە هەر کەسێ بکوژێ پیاوێکی باوەڕدار بە کوشتنێکی هەڵە، ئیتر کوژراوەکە پیاوی بێ یان ژن گەورە بێ یا بچوك، لە وولاتی موسڵمانانندا کوژرابێ.. کوشتن بە هەڵە جۆری زۆرەو ناژمێرێ بەو مەرجەی نیازی کوشتنی لەگەڵ نەبێ هەڵەیە، دوای کوشتنی پێویستە لەسەری ئازادکردنی بەندەیەکی باوەڕداری بێ شورەیی و، پێویستە لەسەری خوێنێکی تەواوبدا بە میراتیەرانی ئەو کوژراوە، ئەوانەیش بە گوێرەی یاسا بەشی دیاری کراویی خۆیانیان ئەدرێتێ، بۆ ئەوەی دڵیان پاك ببێتەوە، برینی کوژراوەکە لە دڵیانایە سارێژ ببێ بە وەرگرتنی ئەو خوێنە.

﴿ إلاّ أنْ يَصَدَّقُوا ﴾ مەگەر ئەو خاوەن مردووانە کە چاکە بکەن لەگەڵ پیاو کوژەکەو لەبەرخوا دەست لە خوێنەکەی هەڵ بگرن و گەردنی ئازاد بکەن بەو مەرجەی منال و شێت و گێل نەبن.

﴿ فَإِنْ كانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤمِنَةٍ ﴾ دوایی ئەگەر کوژاراوەکە لە تاقمێ بوون دوژمن بە ئێوە بوون و بێ باوەڕبوون و، کوژاروەکە باوەڕداربوونە ئەزانرا باوەڕی هێناوە، پێویستە لەسەر بکوژە موسڵمانەکە ئازادکردنی بەندەیێکی باوەڕدار بە تەنهاو خوێنی لەسەر نیە، چونکە خزمەکانی باوەڕدارنین و میراتیان نادرێتێ و ئەگەر خوێنیان بدرێتێ بێ باوەڕان بەو خوێنە خۆیان بەهێز ئەکەن.

﴿ وَإِنْ كانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤمِنَةٍ ﴾ وەئەگەر کوژاروەکە کەسێ بوو لە تاقمێ لە نێوان ئێوەو ئەواندا پەیمانی ئاشتی هەبوو، کوژراوەکە بێ باوەڕێکی پەیمان پێ دراوبوو لەژێر سێبەری ئیسلامدا ئەژیا، دوایی پێویستە لەسەر پیاوکوژەکە خوێنی بدابە خاوەنە میراتبەرەکانی کوژراوەکەو، پێویستە لەسەریشی ئازادکردنی بەندەیێکی باوەڕداری بێ شورەیی، ئەو کوژراوە وەك موسڵمان تەماشا ئەکرێ.

﴿ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ شَهْرَيْنِ مُتَتابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللهِ وَكانَ اللهُ عَلِيماً حَكِيماً ﴾ دوایی هەر کەسێ لە پیاو کوژ دەستی نەکەوت بەندەیە بەو جۆرەو نەخۆی هەیبوو، نەی توانی بەندەیە بکرێ، یا بەندە هەر پەیدا نەئەبوو، دوایی پێویستە لەسەری ڕۆژو گرتنی دوو مانگ بەبێ ووچان و ڕۆژەکانی یەك لە دووای یەکبن لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژگرتنە ببێ بە پەشیمان بونەوەی لەسەر ئەو شتەی لەوەوە پەیدا بووەو خوا ئەزانێ بە نیازی ئەو کەسە ئایا ئەو کوشتنەی بە هەڵە بوەیانە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و فەرمانی پێ ئەدا لە خوێن و لەوەی خوا دیاری کردووە.

ئەگێڕنەوە قەیسی کوڕی سەبابەی کەنانی خۆی و هیشامی برای موسڵمان بوون. لە پاش ماوەیە هیشامی برای کوژرا لەنێو هۆزی بەنی نەجاردا، بۆ ئەو ڕووداوە قەیس چوە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەویش زوبەیری کوڕی عەیازی ئەلئەزهەری لەگەڵ قەیسدا نارد بۆلای هۆزی بەنی نەجار کە فەرمانیان پێ ڕاگەیەنێ ئەگەر ئەزانن چ کەسێ کوشتوێتی بیدەنە دەستی لە بریتی برای بیکوژێ، ئەگەر نازانن چ کەسێکە؟ خوێنەکەی بدەنێ. ووتیان نازانین چ کەسێ کوشتوێتی. مل کەچین بۆ فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، سەد

هوشتریان دایە لە بریتی خوێنەکەیا، لەو سەرەوە گەڕانەوە قەیس بە دڵیا هات ئەم وەرگرتنی خوێنە بە تەنها شورەییە بۆی، بەردێکی دا بەسەر زوبەیرداو کوشتی، سواری یەکێ لە هوشترەکانبووگەڕایەوە بۆ مەکە، لە ئایین وەرگەڕایەوە، خوای مەزن بەو بۆنەوە فەرموی:

﴿ وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤمِناً مُتَعَمِداً فجزاؤه جَهَنَمُ خالداً فِيها ﴾ وەهەرکەسێ باوەڕداری بکوژێ بەدەستیان قەس و نیازی کوشتنی بکاو نارەوایشبێ و بە ڕەوای دانێ، دوایی پاداشتی ئەو کەسە دۆزەخە بەردەوامە لە نێوی دۆزەخدا.

فەرماندانی ئەو ڕستەیە بۆ کە سێکە ئەو کوشتنە بە ڕەوا دانێ بە گوێرەی باوەڕی خۆی، بەردەوامیشبێ لەسەر بێ باوەڕی و پەشیمان نەبێتەوە، ئەگەر باوەڕی هێنایەوە، بە ڕاستی پەشیمان بویەوە لەو گوناهە خوای مەزن ئەگەر ئارەزۆی هەبوو بە میهرەبانی خۆی لەو کەسە خۆش ئەبێ، ئەگەر ئارەزۆی هەبوو سزای ئەدا.

﴿ وَغَضِبَ اللهُ عَلَيْهِ وَلَعْنَهُ وَأعَدَ لَهُ عَذاباً عَظِيماً ﴾ وە خوا خەشمی خۆی بەسەر ئەو کەسەدا ئەڕێژی و، دوریشی ئەخاتەو لە میهرەبانی خۆی و نەفرەتی لێ ئەکاو، ئامادەی کردووە بۆی سزاێکی گەورە، بە بۆنەی ئەوەوە گوناهێکی گەورەی کردووە.

کوشتن بە شێوەیەکی گشتی سێ بەشە:

١- نیازی پەتی بۆ کوشتن (عمد محض)، ئەمەیە پیاوێ پەلاماری کەسێ بدا بە نارەوا دەست بکا بە لێدانی بە هۆی شتێکەوە کە بە زۆری کوشندەبێ، لەگەڵ ئەوانەیشا نیازی کوشتنی ئەو کەسە بکات. لەو کاتانەدا ئەو پیاو کوژە لە بریتی کوژراوەکەدا ئەکوژرێتەوە ئەگەر میراتبەرەکانی نەبورن لە کوشتنی، ئەگەر لە کوشتنی بوردن پێویستە خوێنێکی گران و قورس لەماڵی ڕوتی خۆی بە میراتبەرانی کوژراوەکەبدا.

خوێنی قورس بریتییە لە سەد هوشتر (٣٠) سەریان پیان نابێتە چوارساڵی، (٣٠) سەریان پێیان نابێتە پێنج ساڵی (٤٠) سەریان ئاوسین بە ئاشکرایی. ئەگەر هوشتر پەیدا نەبوو پێویستە نرخی تەواوی ئەو سەد هوشترانە بەو جۆرەی باسکران بدرێ بە میراتبەرەکان.

٢- کوشتن بە هەڵەی ڕوت (خطأ محض)، ئەوەیە کەسێ بە هەڵەو بێ نیازی کوشتن کەسێ بە بەردێ یان تیرێ یا گولـەیە بە ئاڕاستەی شتێ جگەی ئادەمیزاد بکا کەچی بەری پیاوێ بکەوێ و بیکوژێ، لـەو کاتانەدا ناکوژرێ. بەڵام پێویستە لـەسەر خزمانی میراتبەری پیاو کوژەکە لە جگەی باوك و مناڵانی خوێنێکی سوك بدەن بە میراتبەرانی کوژراوەکـە... خوێنی سوك بریتیە لـە سەد هوشتر (٢٠) سەریان پێیان نابێتە چوار ساڵە (٢٠) سەریان پێیان نابێتە پێنج ساڵە (٢٠) سەریان پێیان نابێتە سێ ساڵی مێینەیشبن (٢٠) سەریان نێربن و پێیان نابێتە سێ ساڵی (٢٠) سەریان پێیان نابێتە دوو ساڵی، جگـەی ئـەو (٢٠) سـەرە ئەبێ هەموویان مێ بن، ئەگەر هوشتر نەبوو ئەبێ نرخەکەیان بدرێ لـە خوێنا، ئـەو بەشە خوێنە ئەکرێ بە سێ کەرتەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ لـە کۆتایی هەر ساڵێکا بەشێکیان ئەدرێ بە میراتبەرانی کوژراوەکە.

٣- نیازی هەڵە، یانی وێنەی نیازی کوشتن (شبه العمد) یا (عمد خطـأ)ئەمەیـە کەسێ پەلاماری کەسێ تر بدات بۆ لـێدانی، نەك بە نیازی کوشتن بەهۆی شتێکەوە بە زۆری نەبێتە هۆی کوشتن، وەك تۆڵە دارێکی بچوك یا بەردێکی زۆر بچوك کەچی بەو شتە ئـەو پیاوە کوژرا، لـەو کاتانەدا ئەو پیاوانە ناکوژرێتەوە. بەڵام پێویستە لـەسەر خزمانی بە وێنەی بەشی دووەم واتە (العاقلة) خوێنێکی گران وەك لە بەشی یەکەمدا باسکرا بیدەن بـە میراتبـەرانی کوژراوەکە لـە ماوەی سێ ساڵدا.

بۆ زانین: خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیـاوە. خوێنـی جگـەی موسـڵمان لـە گـاورو لـە جولـەکە سێیەکی خوێنی موسڵمانە، خوێنی ئاگر پەرست پێچ یەکی خوێنی موسڵمانانە.

خوێن لـەم سێ جێگانەدا هەر ئەبێ خوێنی گرانبێ (١) کوشتن لـەنێو شارەوانی مەکـەی پیرۆزدا (٢) کوشتن لە مانگـەکانی زیلقـەعیدە. زیـل حجـە. موحـەڕەم. ڕەجـەب. یانـێ (الأشهر الحرام) (٣) خزمان وێنەی براو مام و ئامۆزا ئەبێ خوێنی گرانیان بۆ بدرێ.

کوشتن بەهەر شێوەیە بێ پێویستە لـەسەر پیاو کوژ بەندەیێکی بـاوەڕداری بێ شـورەیی ئازادبکا، ئەگەر بەندەی دەست نەکەوت ئەبێ دوو مانگ لـەسەر یەك بەڕۆژو بـێ، ئەگـەر نەیتوانی ڕۆژو بگرێ لـەبەر پیری و نەخۆشی پێویستە لـەسـەری خـواردن بـدا بـە شەست کەسی هەژاری باوەڕدار جگەی نەوەکانی هاشم و موتەلیب.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دەستەیە لە هاورێکانی خۆی بە سەرۆکایەتی ئوسامەی کوڕی زیدی ناردنی بۆلای هۆزی بەنی زەمر توشیان بوو بە تووشی پیاوێکەوە ناوی میرداسبو لەگەڵ ژمارەیە مەڕدا وایان زانی بێ باوەڕە. میرداس سڵاوی لێ کردن بە ووشەی درۆشمی ئیسلام و باوەڕی هێنا کەچی ئەوان کوشتیان. بە بیری خۆیان وایان ئەزانی میرداس ئەیەوێ بەو ووشانە خۆی ڕزگار بکا لە کوشتن و بە دڵ بڕوای نەهێناوە.

کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەو ڕوداوەی زانی زۆری لاگرانبوو، لۆمەی زۆری کردن. فەرمووی: دڵتان دڕی بزانن درۆ ئەکا. بەو بۆنەوە خوا فەرموی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿٩٤﴾

﴿ يا أيها الذينَ آمَنُوْا إذا ضَرَبْتُمْ في سَبيلِ اللهِ فَتَبَيَّنُوْا ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە هەرکاتێ ئێوە ڕۆیشتن بەسەر زەویداو چونە دەرەوە بۆ جەنگ کردن لە ڕێگەی ئایینی خوادا، دوایی ئێوە داوایی ڕونکردنەوەی ئەو شتە بکەن توشتان ئەبێ و پرسیاری

چۆنێتی ئەو شتانە بکەن، پەلە مەکەن و لەسەر خۆبن لە هەموو کارێکا، گومانتان لەکەسێ پەیدا کرد کوتوپڕ مەی کوژن وابزانن بێ باوەڕە.

﴿ وَلا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقى إِلَيكُمُ السَّلام لَسْتَ مُؤمِناً ﴾ وە ئێوە مەڵێن بە کەسێ فڕێ ئەدا بۆلای ئێوە سلاو کردن: تۆ باوەڕدارنیت، بە وێنەی موسڵمانان تەماشایان بکەن لە قازانج و لە زیاندا لەم جیهانەدا، نهێنی ئەو کەسانە پەیوەندی بە خواوە هەیە بە تەنها.

﴿ تَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَياةِ الدُّنْيا ﴾ ئێوە داوای دارایی بڕاوەی جیهان بکەن بەو کارانەتان. ئەو فەرمودانەی پێشو وامان پیشان ئەدەن ئەو شتانە پاڵی بەوانەوە ناوە بۆ کوشتنی ئەو پیاوە دەست بەسەرا گرتنی سامانی‌کەی بووە، بە زۆری ئادەمیزاد بۆیان دەرکەوتووە زۆربەی ئەو کارانە ئەکرێن لەلایەن هەندێ کەسەوە زۆر لە چاکەو ڕاستیەوە دوورن کەچی وا پێویستە پشت بە خوای مەزن ببەستن و وابزانن ئەو سامانەی لای خوایە نایەنە ژمارە، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَعِنْدَ اللهِ مَغانِمُ كَثِرَةٌ ﴾ دوایی لای خوا هەیە سامان و پیت و فەڕی زۆر کە پێتان ببەخشێ، ئەبوایە چاوتان نەبڕیایە ئەو دارایە کەمەی ئەو پیاوەتان لەسەر کوشت کە بە بیری خۆتان واتان دانابو بێ باوەڕەو ئەیەوێ خۆی ڕزگار بکا بەو سلاوە.

لەم سەردەمەی ئێمەدا کاتێ جەنگی ئێران و عێراق دەستی پێ کردبوو، جەردەو بەکرێ گیراوانی هەردوولا شەوانە دەرئەچون و دانیشتوانی بێ تاوانیان ئەکوشت شناسنامەو ناونیشانی ئەو کوژراوانەیان ئەهێناوە بۆلای کار بەدەستانی خۆیان، جاری وایش ئەبوو سەرەکانیان ئەهێنا بۆیان تەنها بۆ ئەوە ئەندازەیێکی کەم پارەیان بدەنێ، بەو بۆنەوە ئەو هەژارانەیان ئەکوشت گۆیا دوژمنی کاربەدەستانی خۆیانن. بەلام فڕیان بە دوژمنەوە نەبوو بەڵکو دۆستیانبوون، زۆر جاران دەرئەکەوت کە خزمی خۆیانن.

﴿ كَذالِكَ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلُ ﴾ ئێوە هەروەك ئەو پیاوە بوون لەمەبەرو بت پەرستبوون، لە پاشا ئێوە چوونە نێو ئیسلامەوە بەو ێنەی ئەو ووشەیە ئەو پیاوە کوژراوە ووتی، پێغەمەر

(ﷺ) ئەو گفتوگۆیەی لێ وەرگرت، دوایی خوێنی پارێزراو دارایی دەست لێ نەئەدرا. ئەبوایە ئێوە وەرتان بگرتایە لەو کوژراوە شتێ پێغەمبەر وەری گرت لە ئێوە. زۆرترین کەس داوا ئەکەن لە جگەی خۆیان بەبەشێ ڕازی بن، کەچی خۆیان بە بەشی زۆر نەبێ ڕازی نابن.

﴿ فَمَنَ اللهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوا إِنَ اللهَ كانَ بِما تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ دوای باوەڕهێنانی ئێوە خوا چاکەو بەخشندەیی خۆی دا بەسەر ئێوەدا بە وەرگرتنی ئیسلامیتان و ئێوەی کرد بە هاوڕێی پێغەمبەر تەنها بە ووشەی شایەتیمان، خوێن و دارایتان پارێزراو بیانوتان وەرگیرا، دوایی ئێوە بۆ لەمەو پاش پەلەمەکەن و هەموو شتێ ڕوون بکەنەوە، سزای هیچ کەسێ مەدەن بە گومان و بە گۆترەکاری.

بەڕاستی خوا ئاگادرە بە شتێ ئێوە ئەیکەن، ئەزانێ چ شتێ پاڵی بە ئێوەوە ناوە، ئەزانێ ئێوە شایەنی چ جۆرە پرسیارێکن.

زانایان لەم ئایەتە پیرۆزەدا دوو فەرمانی دەستووری و یاساییان دەرهێناوە:

١- پێویستە ڕون کردنەوەی هەموو شتێ، بە تایبەتی ئەو کارانەی پەیوەندیان بە فەرمانەکانی ئایینەوە هەیە، بە تایبەتی تر لە ڕژاندنی خوێنی ئادەمیزادو دارایی ئەوانەوە.

٢- هەرکەسێ ووشەی دیاری کراوی ئیسلامی بەدەمدا هات و ووتی: من موسڵمانم، ئەو کەسە بە موسڵمان دائەنرێ، وەك موسڵمانان تەماشا ئەکرێن لە بارەی ژن هێنان و میرات وەرگرتن و شتی ترەوە لەو شتانە پەیدا ئەبن لەسەر ئاشکراکردنی ئیسلامەتی. بەڵام نهێنی دڵی ئەو کەسە ئەدرێتەوە دەست خوای مەزن.

خوای مەزن لە ئایەتی پێشوودا سەزەنشتی ئەو کەسانەی کرد ئەو پیاوەیان کوشت لەو کاتەدا باوەڕی خۆی دەربڕی بە سلاوکردن. لەمەو دوایش باسی گەورەی جەنگمان بۆ ئەکا لەبەر ئایینی ئیسلام، بۆ ئەوەی پاداشتی گەورە لە کیس خۆیان نەدەن کە جەنگاوەران ئەیاندرێتێ، پلەو پاییەی ئایینیان کەم نەبێتەوە، باسی ئەوەیشمان بۆ ئەکا

هەندێ لە هاوڕێکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لە جەنگی تەبوکدا دواکەوتن، بیانویش لەو کەسانە وەرگیرا کە بیمارو نەخۆش بوون و پەك کەوتەبوون. بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستانە خوا فەرمووی:

لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾

موسڵمانان لە بارەی جەنگ کردن لە ڕێگەی خوادا سێ بەشن:

١- ئەو کەسانە دووابکەن لە جەنگ لەسەر بیانوێکی تایبەتی و دەستوری، وەك کوێری و شەلی و پیری و نەخۆشی و چەندین هۆی تر، خاوەنی ئەو بیانوانە بیانویان لێ وەرئەگیرێ و پاداشتیان ئەدرێتەوە بە مەرجێ باوەڕداری بێ خەوشبن سەرکەوتن و خاوەنی چاکەیان لا خۆشبێ لە ناخی دەرونیانەوە، بە ڕاستی لایان وابێ ئەگەر ساغ بوونایە هاوبەشی جەنگاوەرانەیان ئەکرد لە جەنگدا.

٢- ئەو کەسانە ساغن لە موسڵمانان. بەڵام لەلای پێشەوای ئایین و سەرۆك بەرگرییەکانەوە بانگی هەموو موسڵمانان کراوە بە هەڵسان بۆ جەنگی بێ باوەڕان، لەبەر هۆی تایبەتی موسڵمانان پێویست کراوە هیچ کەس لەوانە ساغن و منداڵ نین نابێ خۆیان.

دوابخەن لە جەنگ کەچی هەندێ لەو کەسانە خۆیان ئەشارنەوە لە جەنگ کردن، ئەو جۆرە کەسانە بیانویان لێ وەرناگیرێ، پێویستە سەرزەنشت بکرێن و شایستە سزایشن، لەبەر ئەوەی پشتیان کردۆتە جەنگی ڕەواو یاخی بوون لە فەرمانی پێشەوای خۆیان، ئەو جۆرە کەسانە هیچ جۆرە ڕێزێکیان بۆ دانانرێ بەرانبەر ئەو کەسانە جەنگیان کردووە بە هیچ شێوەیە.

٣- ئەگەر جەنگ کردن پێویست نەکرابوو لەسەر هەموو موسڵمانان و فەرمان بۆ جەنگ دەرنەکرابوو لەلایەن پێشەوای موسڵمانانەوە. بەڵام ئەبوایە هەندێکیان خۆیانییان ئامادەبکردایە بۆ جەنگ گردن و مەبەستەکە بەوان پێك ئەهات و پێویستی بە هەموو موسڵمانان نەئەکرد لەو کاتەدا بیانو لەو کەسانە وەرئەگیرێ ناچن بۆ جەنگ کردن لە کاتێکدا هەندێ تریان بۆ ئەو پێویستە جەنگیان کردوە ئەوانە جەنگیان کردووە ڕێزیان ئەدرێ بەسەر دانیشتواندا هەر چەندە گوناهباریش نابن، چونکە ئەو دانیشتوانە تەمەڵیان نەکردوە کە خۆیانیان لە جەنگ کەنار دابێ. خوای مەزن لە بارەی هەردوو تاقمەکەوە ئەفەرموێ:

﴿ لا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ غَيْرُ أولِي الضَّرَ ﴾ بەرانبەرو یەکسان نین ئەو کەسانەی ساغن و دانیشتون لە خانەی خۆیانا و باوەڕداریشن و پێویست نیە لەسەریان جەنگ کردن جگەی ئەو کەسانە خاوەن ئازارن وێنەی نەخۆش و شەل و کوێرو پەك کەوتوەکان.

﴿ وَالْمُجاهِدُونَ فِي سَبِيْلِ الله بأمْوالِهِمْ وَأنْفُسِهِمْ ﴾ وەکەسانێ جەنگ ئەکەن و خۆیان ماندوو ئەکەن، بە تایبەتی جەنگیان لەسەر پێویست نی‌یە. بەڵکو پێویستە لەسەر ئەمان و جگەی ئەوانیش. بەڵام ئەمان بە دڵسۆزی زۆرتری خۆیان بە تەنها بەو پێویستە هەڵساون و پێویستەکەیان بە ئەنجام گەیاندووەو موسڵمانان مەبەستەکەیان بۆ ئەنجام دراوە، بە بۆنەوەی دڵسۆزی ئەوانەوە پێویستە کە لەسەر دانیشتوانیش هەڵگیراوەو جەنگیان کردووە بە تەنها لە ڕێگەی خوادا بە دارایی و چەك و تەفاقی خۆیان کە بۆ جەنگاوەرانیان ئامادەکردووەو،

بە لەشی خۆشیان کە لە پانی جەنگدا خوێنیان دەرخستوە بۆ کوشتن، بەلای کەمەوە بۆ بریندارى، ئەو کەسانە بەم شێوانەوە چۆن بەرانبەر ئەکرێن لە پاداشت و رێزداو لەگەڵ ئەو کەسانەدا لەش پەروەرن و بە تەمەڵی دانیشتوون. لە بارەی ئەو کەسانەوە جەنگیان بە دارایی و بە لەشی خۆیان خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَضَلَ اللهُ الْمُجاهِدِينَ بأمْوالِهِمْ وَأنْفُسِـهِمْ عَلَى الْتـاقِدِينَ دَرَجَـةً ﴾ خوا رێزی ئەو کەسانەی داوە جەنگ کەرن بە دارایی و بە لەشی خۆیان، بە تەنها لەسەر ئەوان پێویست نیە. بەڵام دڵسۆزی خۆیان دەرئەبڕن بەسەر ئەو کەسانەی دانیشتوون و نەچوون بۆ جەنگ کردن بە پلەو پایەیێکی زۆر گەورە، وەك دەست کەوتنی تالان و سەرکەوتنیان بەسەر دوژمنانی خۆیاناو پاداشتێکی زۆر گەورە لە پاشە ڕۆژدا، ئەو ڕێزەیش لەبەر ئەوەیە کە بە تەنها پەلاماری دوژمنانی ئیسلامیان داوە، هەرچەندە تاقمە دانیشتوانەکانیش سزایان نادرێ لەو کاتەدا تاقمە خاوەن ڕێزەکان بەو پێویستە هەڵساون و بە مەبەستەکە گەیشتوون.

﴿ وكُلاً وَعَدَ اللهُ الْحُسْنى ﴾ وە هەموو تاقمێ لە دانیشتوان و لە جەنگ کەران خوا بەڵێنی داوە پێیان پاداشتێکی شیرنتر کە ئەویش چونیانە بۆ بەهەشت. بەڵام پلەی زۆرتر بۆ یەکێکیان لەبەر ئەوەیە کردەوەیان زۆرترە لە ڕێگەی ئایینی خوادا، بۆیە خوا دووپاتی ئەکاتەوە، بۆ ئەوە باشتر خۆیان ئامادەبکەن بۆ جەنگ کردن و خۆیان پەنانەدەن، ئەفەرموێ:

﴿ وَفَضَلَ اللهُ المُجاهِدِيْنَ عَلَى العاقِدِيْنَ أجراً عَضِيماً دَرَجاتٍ مِنْهُ ومغفره وَرَحْمَـةً وَكـانَ اللهُ غَفُوراً رَحِيماً ﴾ وە خوا ڕێزی جەنگ کەرانی داوە بەسەر دانیشتواندا بە پاداشتێکی گەورە کە بریتی‌یە لە چەندین پلە لە جێگاکانی بەهەشتیانا، پلەیەێکی تەنها لەلای خواوە چاکترە لە هەموو جیهان و ئەو شتانەی لەودایە. کەواتە چەندین پلە ئەبێ چەندە چاکتربێ. خوا لەوان خۆش ئەبێ بە لێ خۆشبونێکی زۆر گەورە، میهرەبانیان لەگەڵ نەکا بە میهرەبانێکی زۆر گەورەو، خوا خۆش ئەبێ لە گوناهی بەندەکانی خۆی، میهرەبانە ڕێزی بەندەکانی خۆی ئەگرێ بەشتێ بەڵێنی داوە بەوانی بدا.

موسڵمانان دوو کۆچیان لە مەکە کردووە: یەکەمیان بۆ حەبەشە بە پێنج ساڵ دوای بوونی پێغەمەر بە فروستادەی خوا، دووهەمیان بۆ مەدینە سێزدە ساڵ. دوای بوونی بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هۆی ئەو کۆچ کردنانەیش ئەوەبو کە باوەڕداران دوربخرێنە لە ناوچون و بچنە جێگەیە بە ئاسودەیی بژین، هەتا بتوانن نەخشەییێکی ڕێك و پێك دامەزرێنن بۆ جەنگ کردن لە ڕێگەی ئایینی خواداو، نەهێشتنی کاری خراپ لە زەویدا، بەو کۆچ کردنە ڕێزی ئیسلام سەرکەوێ بەسەر دوژمناندا، ئەگەر کۆچ کردن نەبوایە ڕوناکی ئیسلام ئەکوژرایەوەو ئەبوو بە خۆڵە مێش و با ئەی برد، هەر لەبەر مەبەستی سەرکەوتنی ئایینی ئیسلام پێغەمەر کۆچی کرد لە مەکەوە بۆ مەدینە، فەرمانی دا بە موسڵمانانیش بۆکۆچ کردن، زۆربەیان کۆچیان کرد، تاقمێکیان لە مەکە مانەوە بۆ پاراستنی دارایی و سودی خۆیان، چونکە بت پەرستان هەرکەسێ کۆچی بکردایە نەیان ئەهێشت هیچ شتێ لە سامانی خۆیان بینە دەرەوە، ئازاری زۆریشیان ئەدان، ئایینی خۆیانیان لێ قەدەغە ئەکردن، ئەوانیش نەیان ئەتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن. بەڵام لە لایێکی ترەوە ئەیان توانی خۆیان ڕزگار بکەن و کۆچ بکەن و بەسەر بەستی بژین و نەیان چەوساندنایەوە، بە تەواویش ئایینی خۆیانیان بردایەتە سەر بەهۆی کۆچ کردنەوە لە وڵاتی دوژمنانەوە بۆلای وڵاتی موسڵمانان و جێگە ئاسایش، لە مەدینە لە خزمەت پێغەمەردا بحەسێنەوە، لەبەر ئەوانەی پێشوو خوا قەدەغەی کرد لەسەریان مانەوەیان لە وڵاتی بێ باوەڕاندا، لەسەر زمانی فریشتەی گیان کێش سەرزەنشت ئەکرێن و خوا ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ

وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِى ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ فریشتەکان گیانی ئەوانیان کێشاوە ئەو کەسانە ستەمیان لە خۆیان کردووە بە وازهێنان لە جەنگ کردن و لە کۆچ کردن بۆ وڵاتی ئیسلام و مانەوەیان لە وڵاتی بێ باوەڕی بەسەر شۆڕی و بەزیان گەیاندن لە پێویستیەکانی ئایین.

﴿ قَالُوا فِيمَا كُنْتُمْ ﴾ فریشتەکان بەو کەسانەیان ئەووت کۆچیان نەکردبوو بە سەرزەنشت کردنیان: لە شتێکا بوون لە بارەی ئاینتانەوە لە تاقمی موسڵمانان بوون یالە تاقمی بت پەرستان؟

ئەو پرسارەی فریشتەکان لە ناوەڕۆکا بۆ ئەوە نیە فریشتەکان نایزانن ووڵامیان ئەوێ. بەڵکو بۆ سەرزەنشت و کپ کردنیانە لەسەر ئەو کردارە لەسەری بوون کە دواکەوتوون لە کۆچ کردن لەگەڵ کۆچ کەران کە فەرمانبەرداری پێغەمەربوون لە نەخشەی لە ناوبردنی بت پەرستان و بەرزکردنەوەی فەرمودەی خوا.

پرسیار/ ئایا سەرزەنشت کردنی ئەو فریشتانە لە کاتی گیان کێشاندا بووە یا لە پێشەوە یا لە دوای گیان کێشان؟

وەڵام/ زانینی ئەو پرسیارە خوای مەزن ڕوونی ئەکردووەتەوە، چاك وایە ئێمەش بێ دەنگ بین بڕوای بێگومانمان هەبێ بە بوونی ئەو پرسیارە هەر کاتێ بوبێ.

﴿ قالُوا مُسْتَضعفينْ في الأرضِ ﴾ کۆچ نەکردووەکان وەڵامی فریشتەکانیان دایەوەو ووتیان: ئێمە لاواز بووین و نەمان توانی کۆچ بکەین لە زەویی بێ باوەڕان، نەمان ئەتوانی پێویستیەکانی ئایین دابەزێنین، چونکە بت پەرستان ئازاریان ئەدایین، دوایی فریشتەکان ئەو بیانوەیان وەرنەگرت لەوان.

﴿ قالُوا الَمْ تَكُنْ أرضُ الله واسِعَةً فَتُهاجِرُوا فِيها ﴾ فریشتەکان لە ڕووی کپ کردنەوەی دەنگیان ووتیان: ئایا زەویی خوا فراوان و زۆرترنەبوو، دوایی ئێوە کۆچتان بکردایە لە زەوی مەکە بۆلای هەرێمێ تر کە بتان توانیبایە ئایینی خۆتانتان ڕاوەستانایە، وێنەی کۆچ بۆ حەبەشەو مەدینە. ئەو گفتوگۆیە لە نێوان فریشتەکان و ئەو کەسانەدا باسکران گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوای مەزن سزای تاوانباران نادا لە پاش سەلماندن و تەواکردنی بەڵگە نەبێ بەسەریانەوە بە جۆرێ بێ تاوانباران بیانویان بە دەستەوە نەمێنێ جگەی میهرەبانی خوا کە هەموو بونەوەران ئەگرێتەوە.

﴿ فأولَئِكَ مأواهُمْ جَهَنَمُ وَساءَتْ مَصِيراً ﴾ دوایی ئەو تاقمە کۆچیان نەکردووە جێگەی ئەوان لە ڕۆژی دوایدا دۆزەخەو، دۆزەخ خراپ جێگەیە کە ئەگەڕێنەوە بۆلای.

پاش ئەوەی خوای مەزن هەڕەشەی کرد لەو کەسانە دواکەوتوون لە کۆچ کردن، ئەو کەسانە دەرئەکا لەو هەڕەشەیە کە خاوەنی بیانوون لەبەر نەخۆشی و نەبوونی تفاق بۆ کۆچ کردن، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ إلاّ الْمُسْتَضْعِفينَ مِنَ الّرجالِ وَالْنِساءِ والْوِلْدانِ لا يَسْتَطِعُونَ حِيلَةً وَلا يَهْتَدُونَ سَبيلاً ﴾ مەگەر ئەو کەسانە سزایان نادرێ لاوازو بێ هێزن لە پیاوان و منداڵان توانای چارەیەکیان نەبێ بیدۆزنەوە بۆ دەرچون و کەرەسەی کۆچ کردنیان بۆ پێك نایەو، وە ڕێگە شارەزاین و بۆیان هەڵناسوڕێ لە مەکەوە دەرچن بۆلای مەدینە، نە لەلایەن خۆیانەوە، وە نە لایەنێ ترەوە ڕێگەیان دەست ناکەوێ بۆ کۆچ کردن.

﴿ فأولئِكَ عَسى اللهُ أنْ يَعْفُوَ عَنهُمْ وَكانَ اللهُ عَفُواً غَفُوراً ﴾ دوایی ئەو بێ تواناو خاوەن بیانوانە شایستەیە خوا لەوان ببورێ. ووشەی لێ بوردن ئەوەمان پیشان ئەدا کە وازهێنان لە کۆچ کردن یەك جار ترسناکە بە جۆرێ ئەوانیش خاوەنی توانانین جێگەی مەترسین ئەگەر لێ بوردنی خوا نەبێ و، خوا لێ بوردن و لێ خۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانەی خاوەنی بیانون. زانایان لایان وایە ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە موسڵمانان قەدەغەیە لە وولاتی بێ باوەڕاندا دانیشن لەو کاتانەدا نەیان ئەتوانی خۆیان ڕاوەستێنن، ئیتر با ئەو جێگەیە نیشتمانی خۆیانبێ، سامان و دارایی زۆریشیان لەوێ دا هەبێ.

بەڵام ئەمڕۆ بە ئاگاداری هەموو دانیشتوان و هەموو موسڵمانان جێگەیە دەست ناکەوێ کۆچی بۆ بکرێ و چاکتربێ لە شوێنی خۆی بۆ ئایین پەروەری، چونکە بە گوێرەی تاقیکردنەوە، کاربەدەستانی ئێستای بە ناو موسڵمان بە هیچ شێوەیە بەرگری لە یاسای قورئان ناکەن، بگرە لە کۆششدان بۆ ڕوخاندنی دەستوری ئیسلام، ئایین باوی نەماوە لایان.

هەموو ئاواتیان ڕەگەز پەرستی و نەتەوەو هەرێم پەرستنە. ئەوانەیان ئورووپاین ئورووپایێتی ئەکەن لەگەڵ جگەی خۆیان، هەرێم پەرستی ئەکەن لەگەڵ هەرێمە عەرەبەکاندا جگەی عەرەبەکانیش هەرێم پەرستی ئەکەن، بە تایبەتی ئێرانی‌یەکان ئەو کەسەی شیعە نەبێ بە موسڵمانی دانانێن. ڕژێمی تورك تورك پەرستی ئەکەن، ئاینی ئیسلام ئاینی ڕەسمی ڕژێمەکەیان نیە، بیروباوەڕی ماسۆنیە زاوییەکانیان کردووە بە پەیڕەو پرۆگرام بۆ خۆیان، زوربەی ڕژێمی موسڵمانان بیروباوەڕی بێگانەکان و بت پەرستان و خاچ پەرستانیان کردووە بە یاسا بۆخۆیان. کاربەدەستانیان وێنەی شیوعیەکان پارە پەرستن، ڕژێمی زاوێنی لەبیروباوەڕدا لە بت پەرستەکانەوە نزیکن. کەواتە ئەوەی مابێتەوە بۆ ئادەمیزادانی ژێر ئەمەیە: قورئان و فەرمودەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بکەن بە یاسا بۆخۆیان. پێویستە لەسەر هەموو کەسێ لەهەر وولاتێ هەن خوا پەرستی خۆیان بکەن بەو جۆرەی خواو پێغەمەر فەرمانیان

پێ داوە ئەگەر واز لە ئایینی ئیسلام بهێنن هەر خۆیان بەرپرسیارن لای خوا. بەڵام هەر شتێ لە توانایا هەیە لە ئامۆژگاری کۆتایی لێ نەکەن بەو جۆرەی بۆیان ئەلوێ.

پرسیار/ ئەگەر کەسێ ئەیزانێ لە وولاتی موسڵمانانندا یا جگەی شوێنی خۆی دانیشێ لەوانەیە سەربکێچشێ بۆلای واز هێنان لە پێویستە ئایینیەکان. نەك هەر لەبەر ئەوەی قەدەغەی لێ بکەن . بەڵکو چەند هۆیە تر ئەبوونە هۆی وازهێنان لە پێویستیەکانی ئایین لەبەر لاوازی بەرگری و بوونی شتێ ڕێگە بگرێ لە کاری پێویستی ئایینی وەك جێگەی کاری خراپە کردن، ئایا پێویستە لەسەری کۆچ بۆ جێگەیە تر بکا؟

وەڵام/ هەر کاتێ ئەزانرێ کە بەڕاستی کۆچ کردن و ڕۆیشتن بۆ هەر شوێنێ بێ، ئیتر وولاتێ بێ باشارێ، بازاڕێ با کوڕگایە، ئەبنە هۆی واز هێنان لە پێویستیەکانی ئاین، ئەبێ ئەو کەسە نەچێ بۆ ئەو جێگەیە، ئەگەر لەو جێگەیەدا ئەی توانێ کاری ئایین ڕاوەستێنێ کۆچی بۆ بکا.

ئەگێڕنەوە پیاوێ ناوی جەندەی کوڕی زەمرە بوو، کاتێ بیستی ئایەتی کۆچ کردن هاتۆتە خوارەوە ووتی بە کوڕەکانی سوێندم بە خوا شەو لە مەکە ناکەمەوە، ئەبێ بچمە دەرەوە من لێرە ئەترسم، نەخۆشێگی گرانی گرتبوو کوڕەکانی بردیانە دەرەوەو لە ڕێگادا مرد. بەو بۆنەوەی خوای مەزن فەرموی:

﴿ وَمَنْ يُهاجِرْ في سَبيْلَ اللهِ يَجِدُ في الأرضِ مُراغماً كَثيراً وَسَعَةً ﴾ وەهەر کەسێ کۆچ بکا بۆلای ڕێگەی پەرستنی خوا، ولامی فەرمودەی خوا بداتەوە وواز لە ولاتی بت پەرستان بهێنێ لەبەر پەرستنی خواو بەشداری کردنی موسڵمانان، ئەو کەسە دەستی ئەکەوێ جێگای زۆرو ئارامگا لە زەویدا و ئاشکراکردنی ئایین، لە دوژمنان جوێی بێتەوە وە بالای ئەوانیش گرانبێ، ئەو زەوییە مەدینەیەو، دەستیشی ئەکەوێ خواردەمەنی و زۆر ئەتوانێ ئایینی خۆی دەربڕێ. بە ڕاستی ڕۆزی و فەڕو پیتی خوا پەیوەندی بە جێگەیەکی تایبەتەوە نیە، کۆچ کردن نابێتە هۆی بێ بەش بوون لە رۆزی خوا، ولاتی خوا بەربلاوە

ڕۆزی خوا لە هەموو جێگەیە هەیە، بەخشندەی خوا نایەنە ژمارە، هەزارانی وا هەن دارایی و سامان و پلەی وایان دەست ئەکەوێ لەو جێگانە کۆچی بۆ ئەکەن کە لە ولاتی خۆیانـا بە خەویش نەیاندیوە. نمونەی ئـەو جـۆرە کەسـانە زۆرن نایەنـە ژمـارە. کەواتـە ئەوانـەی دانیشتوی مەکە بوون کۆچیان بکردایە ڕۆزی و سامان و پلەو ڕێزی زۆرتریـان دەسـت ئەکەوت. بە لوت سـۆلانەوەی بـت پەرسـتان کـەچی کۆچیـان نەئـەکرد بـەبێ نرخـی و سەرشۆڕی چەوسانەوەی دوژمنان ڕازی بون، ئەو شتانەیان بە چاکتر ئەزانی لە لێ بوردنـی خوا.

﴿ وَمَنْ يَخْرُجْ مِنْ بَيْتِهُ مُهاجراً إلى الله وَرَسُولِهِ ثُمَ يُدْرِكْهُ الْمَوْتَ ﴾ وەهەر کەسێ بچێتە دەرەو لە خانەو نیشتمانی خۆی کۆچ بکا بۆلای خواو بۆلای فروستادەی خوا لە پاشا بەر لەوەی بگاتە جێگەی مەبەستی خۆی ئەو کەسە مرد لە ڕێگەدا با لە بەردەرگای خۆیابێ.

﴿ فَقَدْ وَقَعَ أجرُهُ عَلَى الله ﴾ دوایی بەڕاستی پاداشتی ئەو کۆچکەرە پـەیدابووە بـەهۆی بەڵێنی خوا بۆی. پاداشتێ خوا بیدا بەو کەسە ئەبێ چەندە زۆربێ بە هۆی کۆچ کردنیـەوە پاداشتی کەوتوەتە سەر میهرەبانی خوا.

﴿ وَكانَ الله غَفُوراً رَحِيماً ﴾ وە خوا لێ خۆشبوونی بێ پایانی هەیە بۆ گوناهبـاران، بـە تایبەتی بۆ ئەو کەسانە کۆچیان دواخستوە، خاوەنی بەزەیی و میهرەبانەو بۆ ئـەو بەندانـەی خۆی نیازیان پاکە.

فەرماندانی ئەو ئایەتە تەنها کۆچ کردن ناگرێتەوە. بـەڵکو ئـەو کەسـانەیش ئەگرێتـەوە خۆیان ماندو بکەن بە نیازی بێ گەردەوە بۆ کردنی هەمو چاکەیەو بۆیان نـەلوێ بیکـەن. بێگومان خوا بە تەواوی پاداشتیان بۆ ئەنوسێ بە هۆی گەورەیی و میهرەبانی خۆیەوە.

هەندێ کەس گومانیان وایە مەبەستی یەکەم لە کۆچی پێغەمەرو موسڵمانان هـەر تەنـها بۆ ئەوە بووە ڕابکەن و هەڵبێن بە ئاینەکەیانەوە کە خوا لە چنگی بت پەرستان و ئازاردانی ئەوان ڕزگاریان بکا کە ڕێگەیان لێ ئەگرتن بۆ بەجێ هێنانی پێویسـتە ئاینییـەکان. واتـە بـە

وێنەی ئەو کەسانە خوا پەرستی ئەکەن و پەنا ئەبەنە مزگەوت بۆ نوێژ کردن هەتا گوێیان لە قیرە قیرو گالّە گالّ نەبێ پێویستە ئەو گومانبەرانە بزانن کۆچ کردنی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ دورترو قولّ ترە لەو شتەی ئەوان ئەیزانن، ئەو کۆچ کردنە سەرباری ئەو شتانە بە چاو ئەبینران بۆ نەخشەیێکی دارێژراوبوو پێشەکیەکەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بیری لێ کردبووە کە ببێتە هۆی بنەبڕ کردنی بێ باوەڕی و لە ناوبردنی بت پەرستی، بۆ پەرەسەندنی ئالّای ئیسلام، نەك لەبەر ترس و بیرکردنەوە.بەلّکو وێنەی لەشکرێ بەکارەمایی پێشەواکەی لە پەنای گەرمەی جەنگدا لەلایێکەوە بۆلایەتر بڕوا، لەناوکاودا دوژمن پێ ئەزانێ و پەلامارێکی پێچەوانەو چاوەڕووان نەکراو بداو دوژمن تەفروتونا بکا بە جۆرێ جارێ تر سەر هەلّنەدەنەوە.

ئەوەبوو پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە گەیشتە مەدینە پەیمانی برایەتی لە نێوان هاورێکاندا بەست، ئەو دلّانەی لەوەو بەر ناکۆك بوون لەگەلّ یەکتری بە هۆی رەگەز پەرستی و هۆز پەرستیەوە هەیان بوو بەستنی بە یەکەوە کردنی بە برای ئایینی، لە دوایدا پێغەمەر (د.خ) هانی موسلّمانانی دا بۆ جەنگ کردن و بەرگری لە خۆیان و بوون و باوەڕیان. بەلّێنی دانێ بە بەهەشتی بەرین بۆ کوژراوانی جەنگ ئەبێ، رێزو سەربەستیش بۆ ئەو کەسانەیە ناکوژرێن.

کاتێ وانەو فەرمودەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ جێگەی خۆی گرت لە دەرونی بێ گوماناندا دەستی کرد بە چەکدار کردنیان و پێك هێنانیان بە دەستەو لق و فەرماندەو هێزی سەربازی، ئەی ناردن بەم لاو بەولادا، زۆرجاران پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خۆی پێشەوایی ئەکردن، ئەو کارانەیش هەموویان بۆ ئەوەبوو ئاسایش و خۆگرتن و بۆ موسلّمانان پەیدابێ، خۆشی و ئاسایشی بت پەرستان بکەوێتە لەرزین، لە دوای ئەوانە جەنگی فراوان و بەربلاوی دابەزان، بەو بۆنەوە موسلّمانان خۆیان و داراییان لەو رێگەیەدا بەخت کرد، دەستی یارمەتی و سەرکەوتنی خوا پەرەی سەند بۆیان، ووشەی بێ باوەڕی سەرەو نخون بوو، ووشەی خوا هەلّگڕاو سەرکەوت.

پێویستە ئەو کاربەدەستانە خۆیان بە موسڵمان ئەزانن، بیر لــە ئامۆژگـاری و نەخشــەی پێغەمەر بکەنەوەو پەیڕەوی بکەن و بیکەن بە ڕوناکی بەردەمی خۆیان، دەست بدەنە برایێتی یەکتری. دڵی خۆیان پاك بکەنەوە لە کینەو لەبێ باوەڕی و خۆ هەڵکێشــان و دۆستایەتی بێ باوەڕان، ڕەگەزو هەرێم و چینایەتی پەرستن لە دڵیایانا فڕێ بــدەن، گفتوگـۆی خۆیـان بەرانبەربە دوژمنانی خۆیان بکەن بەیەك، واز لە خاچ و چەکوش و ئەستێرەی شەش ســوچ پەرستن بهێنن، جیاوازی نێوان عەرەب و کوردو تــورك و فــارس و ئــورو واز لێ بــهێنن و ڕوبکەنەوە قورئان، خۆ ئەگەر لە یاسای قورئان لابدەن توشیان ئەبێ بــە توشـی دوژمنـانی خۆیانەوە، بەو بۆنەوە دوژمن بە ئاواتی خۆیــان ئەگــەن، ئیــتر بیانــەوێیان نەیانــەوێ، خــوا ئابڕویان ئەباو خۆیان بە خۆیانەوە خەریك ئەکەن.

ناکۆکی نێوان ڕژێمەکانی عەرەب لە دژی خۆیان و ناکۆکی ئەوان و ڕژێمەکانی تــری موسڵمان، بە تایبەتی جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عــێراق و ئــێران گــەورەترین بەڵگــەی ئابڕوچونیانە، نازانرێ کاربەدەستان چ سودێکیان دەست کەتووە لــە پشــت کردنیــان بــۆ ئایینی خواو لە ڕوکردنیان بۆلای خاچ و چەکوش و ئەستێرەی شەش سوچ؟!!.

ڕژێمی بەعسی عێراق نزیکەی (١٨٠) هەزار ژن و مناڵ و پــیرو بــێ چــەکی کــوردی بەناو ئەنفالــەوە زیندە بــەچاڵ کردووە، نزیکــەی پێنــج هــەزار شــارو دێــهاتی کــوردی بــە مزگەوتەوە ڕوخاندو، جگەی ئەوەی زۆر لە هەزاران بنەماڵەی لە کــەرکوك و خانــەقین و موسڵدا دەرکردووە ئاوارەی کردوون بە بیانووی ئەوەوە کوردن.

تاقمێ لە هۆزی بەنی نەجار پرسیاریان لە پێغەمەر کرد، ووتیــان: ئێمــە بەســەر زەویــدا ئەسوڕێینەوە نوێژەکانمان بە چ شێوەیە بکەین. خوای مەزن وەڵامی دانەوەو فەرموی:

وَإِذَا ضَرَبْتُمْ

فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ

أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْۖ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةًۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْۖ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾

وَخُذُواْ حِذْرَكُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾

فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾

﴿ وَإذا ضَرَبْتُمْ في الأرضِ فَلا جُناحَ عَلَيْكُمْ أنْ تَقْصُرُوْا مِنَ الصَّلاةِ ﴾ وەهەر کاتێ ئێوە چونەوە دەرەوەو چون بەسەر زەویدا بۆ کاروان و کۆچتـان کـرد، یـا چـون بـۆ جـەنگ کردن، یا بۆ بازرگانی، ئەو چونە دەرەوەیەشتان گوناهی تێدانەبوو، دوایـی هیـچ کوناهـێ لەسەر ئێوە نیە کە ئێوە هەندێ لە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە کە چوار ڕکاتی بن.

﴿ إنَ خِفْتُمْ أن يفقنكم الذين كفرُوا ﴾ ئەگەر ئێـوە ئەترسـان زیـان بـە ئێـوە بگـەیەنن کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بە کوشتن و پەلاماردانتان.

بۆ زانین: ترسان مەرج نیە بۆ کورت کردنـەوەی نوێـژ، باسـکردنی تـرس لـێرەدا بـە تایبەتی بۆ ڕون کردنەوەی هۆی هاتنە خوارەوە ئایەتەکانە، چونکە بـە زۆری لـەو کاتانـەدا ترسیان لە پەیدابوونی دوژمن هەبووە پەلاماریان بدەن لە دەرەوەی مەدینەوە، ئەگینا کـاتی گەران بە زەویدا کورت کردنەوەی نوێژ دروستە ترس هەبێ یانە؟ بە گوێـرەی فـەرمودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾.

﴿ إنَ الكافِرِينَ كانُوا لَكُمْ عَدُوّاً مُبِيناً ﴾ بە ڕاستی بێ باوەڕان دوژمنی ئاشکران بۆ ئێوە ئاگاداربن زۆر بە هۆشیارانە.

﴿ وَإذا كُنْتَ فِيهِمْ فَأقَمْتَ لَهُمْ الصَّلاة طائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ وَلْيَـأْخُذُ وَأسْلِحَهُمْ ﴾ وەهـەر کاتێ تۆ لـەنێو هاوڕێکانتای بوی کاتێ ترسان لـە دوژمـن، دوایـی تـۆ ویسـتت بـۆ ئـەوان نوێژت بکەی بە کۆمەڵ، لەشکرەکە بکە بە دووبەشەوە، دوای ئـەوە پێویسـتە بەشـێکیان لـەگەڵ تۆ ڕاوەستن و نوێژەکانیان بۆ بکـەی، وە ئـەو نوێژەکەرانـە پێویسـتە چەکـەکانیان هەڵگرن لـەبەر دڵنیایی بونیان لـە دوژمن.

﴿ فَإذا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِنْ وَرائِكُمْ ﴾ دوایی کاتـێ نوێـژ کـەرەکان سـوجدەیان بـرد پێویستە ئەو بەشەکەی تریان نوێژ ناکەن لە پشتی ئێوەوە بـن و پاسـەوانیتان بکـەن، دوای ئەوەی تاقمە نوێژکەرەکان لـەنوێژ بونەوە بچنەوە بۆ نێو کوڕی لـەشکرەکە.

﴿ وَلْتأتِ طائِفَةٌ أخرى لَمْ يَصَلُوا فَلْيُصَلُوا مَعَكَ ﴾ وە پێویستە بـڕۆن بەشـەکەی تریـان نوێژیان نەکردووەو پاسەوانیان کردووە، دوایی ئەوانیش پێویستە نوێژ لـەگەڵ تۆ بکەن.

﴿ وَلْيَأخُذُوا حِذْرَهُمْ وأسْلِحَهُمْ ﴾ وە پێویستە ئەوان وەربگرن شتێ خۆیان پێ بپارێزن لە دوژمن و چەکەکانیشان هەڵگرن و دای نەنێن.

﴿ وَالذّيْنَ كَفَرُوا لَو تَغْفُلُونَ عَنْ أسْلِحَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ مَيْلَةً واحِدَةً ﴾ ئاواتە خوازن کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ئەگەر ئێوە ئاگاتان لە چەکەکان و تفاق و کەل و پەلەکانتان نەبوو دوایی ئەوان هەڵمەتتان بدەنێ بەیەك هەڵمەت و بە هەموویانەوە، لە ناکاودا پەلامارتان بدەنێ و بتان کوژن و لەناوتان بدەن. کەواتە نابێ بەیەکەوە نوێژ بکەن، چونکە دوژمنان خۆیانیان مەڵاس داوەو چاوڕووانی هەل ئەکەن زیانتان پێ بگەیەنن.

﴿ وَلا جَناحَ عَلَيْكُمْ إنْ كانَ بِكُمْ أذىً مِنْ مَطَرٍ أوْ كُنْتُمْ مَرْضى ﴾ وە هیچ گوناهێ لەسەر ئێوە نییە ئەگەر ئێوە ئازارتان توش ئەبوو لەبەر سەختی باران چەکەکان و کەل و پەلەکانتان تەڕ ئەبوون و قورس ئەبوون و نەتان ئەتوانی هەڵیان گرن، یا ئێوە نەخۆشبوون لەبەر لاوازی چەکەکانتان بۆ هەڵنەگیرا.

﴿ أنْ تَضَعُوْا أسْلَحِتَكُمْ وَخُذُوْا حِذْرَكُمْ إنَ اللهَ أعَدَ لِلكافِرِينْ عَذاباً مُهِناً ﴾ کە ئێوە دابنێن چەکەکانتان و هەڵیان نەگرن، بە بۆنەی ئازارو نەخۆشیەوەو، ئێوە وەرگرن بێداری خۆتان و هوشیاری خۆتانبن نەوەك دوژمن پەلامارتان بدەن. بەڕاستی خوا ئامادەی کردووە بۆبێ باوەڕان سزاێکی ئابڕو بەر بۆیان. ئەو ڕستەیە بەڵێنە بۆ باوەڕداران کە سەر ئەکەون بەسەر بێ باوەڕاندا. کەواتە ئەبێ باوەڕداران دڵیان بەهێزبێ، وا نەزانن کە خوا فەرمانیان پێ ئەدا ئاگایان لە خۆیانبێ مانای وایە بێ باوەڕان سەرئەکەون.

﴿ فَإذا قَضَيْتُمُ الصَلاة فأذكُرُ اللهَ قِياماً وَقُعُوداً وعَلَى جنُوبِكُمْ ﴾ دوایی کاتێ ئێوە لە نوێژ بوونەوە دوایی ئێوە یادی خوا بکەن بەڕاوەستانەوەو بە دانیشتن و بە ڕاکشانەوەو لە هەموو کاتێکاو یادی خوا هەر بەتەنها بە نوێژ نییە.

﴿ فإذا أطْمأنَتُمْ فأقِيمُوا الصَلاة إنَ الصَلاة كانَتْ على الْمُؤمِنِينَ كِتاباً مَوْقُوتاً ﴾ دوایی کاتێ ئێوە پشتوتانداو ترستان نەما، دوایی نوێژەکانتان بەجێ بهێنن و دای بەزێنن بە تەواوی بە چوار ڕکاتەوە بە هەموو مەرجەکانیانەوە. بەڕاستی نوێژ لەسەر باوەڕداران

پێویستێکی خاوەن کاتە، هەموو نوێژێ کاتێکی تایبەتی بۆ دانراوە، پێویستە لەو کاتانەدا بکرێن و کۆتایی پێ نەیەو بیان کەن.

بۆ زانین: لە هیچ کاتێکا بە هیچ شێوەیە نوێژ نەکردنی بۆ نیە، هەتا لە کاتی جەنگ و نەخۆشیو ترسیشدا پێویستە هەموو ئادەمیزادێکی بالّغ و ژیر بە گوێرەی توانای خۆیان نوێژەکانیان بکەن بەراوەستانەوە بێ یا بە دانیشتنەوە و بە پاڵەوەبێ.

بۆ ئاگاداری: دروستە بۆ کاروان و گەرۆك کورت کردنەوەی نوێژی چوا رکاتی بەم پێنچ مەرجانەی خوارەوە:

١- پێویستە ماوەی کاروانی گەشتەکەی یەك سەر لە (٤٨) میل کە یەکسانە بە (٨١)کیلۆمەتری تەواو بەبێ کەمی.

٢- پێویستە ئەو نوێژانە کورت ئەکرێنەوە لە کاتی خۆیانا بن، کاتەکەیان بەسەر نەچوبێ یانێ نوێژێ نەکراو لەکاتی دانیشتندا لە کارواندا کورت ناکرێتەوە، نوێژێ نەکرا لەکاتی کاروانیدا کورت ناکرێتەوە لە کاتی دانیشتندا. نوێژی مەغریب و بەیانی کورت ناکرێتەوە.

٣- پێویستە ئەو گەشت و کاروانە بۆ کاری گوناه نەبێ، وەك چونە دەرەوە بۆ دزی و بۆ جەردەیی ئیتر بۆ هەر شتێ تر بێ زیانی نیە، وەك خوێندن و حەج و سەردانی خزم و بازرگانی و شتی تر.

٤- پێویستە نیازی کورت کردنەوەی نوێژ بهێنێ لە کاتی ووتنی (الله أکبر) ی دابەستنی نوێژ.

٥- پێویستە نوێژ دانەبەستێ بە کۆمەڵ لەگەڵ پێشەوای نوێژێ نوێژ بە چوار رکات بکات.

هەروەك دروستە نوێژ کورت بکرێتەوە دروستیشە کۆکردنەوەی دوو نوێژ بەیەکەوە بەم مەرجانەی خوارەوەیە:

١- کە نوێژی عەسری هێنا بۆلای نوێژی نیوەڕۆ (جمع التقدیم) پێویستە نوێژی نیوەڕۆ لە پێشەوە بکرێ و لەکاتی دابەستنی نوێژی نیوەڕۆ نیاز بهێنێ بۆ کردنی نوێژی عەسر لە دوای نوێژی نیوەڕۆ، لە دوای کردنی نوێژی نیوەڕۆ بەبێ دواکەوتن بە گورجی نوێژی عەسر بکا، بۆی هەیە چوار چوارو دوو دوو هەردووکیان بکا، ئەیشتوانی یەکێکیان چوار ڕکات بێ و ئەویی تریان دووڕکات بێ.

٢- ئەگەر نوێژی نیوەڕۆ برایە لای نوێژی عەسر (جمع التأخیر) پێویستە لەکاتی نوێژی نیوەڕۆدا نیاز بهێنی لە کاتی نوێژی عەسردا نوێژی نیوەڕۆش بکا، ئیتر ئەتوانرێ نوێژی عەسر لە پێشەوە بکا یا نوێژی نیوەڕۆ بکا، مەرج نیە بەیەکەوە بکرێن.

٣- نوێژی مەغریب ئەبرێتە لای نوێژی عیشا، نوێژی عیشا ئەهێنرێتە لای نوێژی مەغریب بەو مەرجانەی لای کۆبونەوەی نوێژی نیوەڕۆو عەسردا باسکران. بەلاّم نوێژی مەغریب کورت ناکرێتەوە.

بۆ زانین: لە کارواندا کورت کردنەوەی نوێژ چاکترە لەوەی چوا ڕکات بکرێ.

بۆ ئاگاداری: وەك دروستە کۆکردنەوەی نوێژ لە کاتی کارواندا، دروستیشە کورت کردنەوەیان بە هۆی باران بە قوڕو لیتە وەبەم سێ مەرجانە: (١) ئەبێ ئەو مەرجانەی بۆ کاروانی باسکران بێتە دیی بە جگەی کاروانی (٢) پێویستە نوێژەکان بە کۆمەڵ بکرێن نەك بە تەنها (٣) پێویستە نوێژەکان لە مزگەوتا بکرێن و لە کاتی نوێژی یەکەمدا بن (جمع التقدیم). پێویستەو مەرجە بۆ ئەو کۆکردنەوەیە پەیدا بوونی باران لە کاتی هەردوو نوێژەکانداو لە کاتی سلاّودانەوەیاندا.

کورت کردنەوەی نوێژ لای شافعیەکان (رخصتە) یانێ ئەتوانرێ کۆبکرێنەوەو بۆیان هەیە کورت نەکرێنەوە، هەرچەندە کورتکردنەوە چاکترە. بەلای حەنەفیەکانەوە کورت کوردنەوەی نوێژ (عزیمە) واتە نوێژ لە کارواندا پێویستە دوو ڕکات بکرێ و پێویستە نوێژی چوار ڕکاتی بکرێ بە دوو ڕکات. لای حەنەفیەکان نوێژ کۆکردنەوە لە هیچ کاتێکا دروست نی‌یە جگە لە عەرەفەو موزدەلیفە بۆ ئەو کەسانە خەریکی حەج کردنن.

لای زانایان بە گشتی نوێژی ترس بە سێ جۆر ئەکرێ:

١- ئەمەیە: دوژمن لەلای ڕوانگەوە بن، لەو کاتەدا پێشەوای نوێژ لەشکرەکە ئەکا بە دوو تاقم: تاقمێکیان ڕووبەڕووی دوژمن ئەوەستن و ئەبنە پاسەوان، تاقمەکەی تریان لە پشتی پێشەواکەوە ئەوەستن و ڕکاتی نوێژ بە کۆمەڵ لە گەڵیا دائەبەستن، دوای هەڵسانەوەی پێشەوا بۆ ڕکاتی دووەهەم ئەو تاقمە نوێژکەرە نیازی جیابونەوە بهێنن لەگەڵ پێشەوادا، دوایی خۆیان بۆ خۆیان ڕکاتی تر بکەن و سلاو بدەنەوە بچن لە بەرانبەر دوژمندا ڕاوەستن، تاقمەکەی تری پاسەوان بێن بۆلای پێشەوای نوێژ، نوێژی لەگەڵدا دابەستن لەگەڵی بن هەتا نزم ئەبێتەوە بۆلای تەحییات ئەم تاقمەش نیازی جوێبوونەوە لە پێشەوا بهێنن و ڕکاتی تر نوێژ بکەن و لەگەڵ پێشەوادا سلاوبدەنەوەو پێشەوا چاوەڕووانیان بکا.

٢- دوژمن لەلای ڕووانگەوە ئەبێ: لەو کاتەدا پێشەوای نوێژ لەشکرەکە بکا بە دوو تاقم هەردوو تاقمەکە لەگەڵ پێشەوادا نوێژ دابەستن هەتا پێشەوا ئەچێ بە سوژدەدا تاقمێکیان لەگەڵیا سوژدە ببەن، ئەو تاقمەکەی تریان ڕاوەستن بۆ پاسەوانی کە پێشەوا هەڵسایەوە بۆ ڕکاتی دووهەم تاقمە پاسەوانەکان بچن بە سوژدەدا و بگەنەوە بە پێشەوا، هەردوو تاقمەکە تەحیات لەگەڵ پێشەوادا بخوێنن و سلاو لە گەڵیا بدەنەوە.

٣- ئەمەیە: موسڵمانان لە ئەوپەڕی گرانی مەترسیدان و لەگەڵ دوژمندا تێك ڕژاون. لەو کاتەدا هەریەکە بۆ خۆی نوێژی خۆی بکا بە هەر چۆنێ بۆی گونجا، بە ڕاوەستان یا بە سواری، ڕوبەڕوی ڕووانگە بێیانە؟ لە ڕاکردندا بن یانە؟ بیانوی جم و جوڵ و هاتووچۆیان لێ وەرئەگیرێ. کەواتە واز هێنان لە نوێژ بە هیچ جۆرێ دروست نیە.

خوای مەزن پاش ئەوەی باسی ئەو فەرماندانانەی خۆی کرد کە پێویستە لە کاتی جەنگدا بیانزانن، دووبارە ئاوڕی ئەداتەوە بۆلای هاندان بۆ جەنگ کردن و ئەفەرموێ:

وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾

﴿ وَلا تَهِنُوا فِي ابْتِناءِ الْقَوْمِ ﴾ وە ئێوە بێهێز مەبن و سستی پیشان مەدەن لە بۆ داواکردنی کۆمەڵێ بێ باوەڕان و جەنگ کردن لەگەڵیان.

﴿ إنَ تألَمُونَ فَإنهُمْ يَألَمُونَ كما تألَمُونَ ﴾ ئەگەر ئێوەی موسڵمان ئازارو ئێشتان پێ بگا بە هۆی بریندار بونتان بە دەستی بێ باوەڕان، دوایی ئەوان بە ڕاستی ئازار و ئێشیان پێ ئەگا بە هۆی بریندار بونیانەوە بە وێنەی شتێ ئێوە ئازرتان پێ ئەگا.

﴿ وَتَرْجُونَ مالا تَرْجُونَ ﴾ وە ئێوە بە ئومێدی شتێکن ئەوان بە ئومێدی ئەو شتەنین، وەك پاداشتی گەورەو چونتان بۆ نێو بەهەشت لە ڕۆژی دوواییدا، یارمەتیدانتان لەم ڕۆژەدا، یانێ ئێوەو ئەوان لە ئازارو ئێشدا وەك یەکوان، پەیوەندی بە لایەکتانەوە نی یە، ئێوە بە تەمای بەشێکن ئەوان بە تەمای نین. کەواتە پێویستە ئێوە چاکتر ئارەزۆتان بۆ جەنگی ڕەوا هەبێ و بە ئارامتربن.

﴿ وكانَ اللهُ عَلِيماً حَكِيماً ﴾ وە خوا بە کردەوەی ئاشکراو بە نهێنی دەرونتان ئەزانێ، هەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ لە پێویست کردنی هەندێ شت و قەدەغەکردنی هەندێ تر.

زانایان ئەڵێن: توعمەی کوڕی ئەبو یریق لە هۆزی بەنی زوفەرزرێکی قەتاوەی کوڕی نەعمانی دراوسێی خۆی لەنێو هەمانە ئاردێکا دزی، ئاردەکە لە کونی هەمانەکەوە ئەڕژا،

هەمانەو زرێکەی دایە دەستی زەیـدی کـوڕی سـەمینی جولـەکـە، خـاوەنی زرێکـە داوای زرێکەی لـە توعمە کردو نەیدایەوە سوێندی خوارد ئاگام لـێی نیە، ئـەویش وازی لێ هێنـاو کەوتنە دووای شوێنی ئاردە ڕژاوەکە هەتا بردییانە خانەی جولـەکەکە دوایی ووتی: توعمـە ئەوانەی داومەتە دەست، کۆمەڵێ لـە جولـەکەکان شایەتیان بۆدا بۆ کردنەوەی ئـەو گـرێ کوێرەیەو ئەو مەبەستە: هۆزی بەنی زوفەر ووتیان: با بچین بۆلای پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ چـوون و داوایان لـە پێغەمەر کرد ببێتە پاڵ پشتی توعمەی دزی ئەو زرێیە، ووتیان: ئەگەر وانـەبێ ئابڕومان ئەچێ و توعمەیش لەناو ئەچێ.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەدڵیا هات بە گوێرەی ڕووالەت بـە دڵـی هـۆزی بـەنی زوفـەر بکـا دەستی زیدنە بیرێ، چونکە زرێکە لای ئەوانە دۆزراوەتەوە، بۆ ڕوونی ئـەو ڕووداوە خـوا فەرمووی:

إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ

عَنْهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ
ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعْمَلْ
سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا
رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا
ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا
فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن
يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن
شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ
مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾

﴿ إنا أنزلنا إِلَيْكَ الكتابَ بِالْحَقِ لتحكم بَيْنَ النّاسِ بِما أراكَ الله ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردوە بۆلای تۆ نامەیە کە قورئانە بە ڕاستی لەبەر ئەوەی تۆ فەرمان بدەی لە نێو ئادەمیزادا بەشتێ خوا فێری تۆی کردووە ئەو شتە بە هۆی سروشەوە. یانێ من تۆم هەڵبژاردووە بۆخۆم و بۆ پەیامی خۆم نەك بۆ جگەی خۆم و ڕزایێتی ئەوان.

تەفسیری زمناکۆیی

﴿ وَلا تَكُنْ للخائنين خَصِيماً ﴾ وەتۆ مە بە پارێزەرو لایەن گری کەسانی نادروست و ئەوانەی دژی ڕاستین وێنەی خزمانی توعمەی دزو ببی بە دوژمنی زەیدی جولەکەی بێ ئاگاداری لەو دزییەدا.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەرگیز پشتیوانی تاوانباری نەکردوە، ناگونجێ پشتیوانی هیچ کەسێ بکا بە ناڕوایی، خوای مەزن لەو ئایەتەدا کە فەرمانی داوە بە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بە قەدەغە کردنی پشتیوانی لە تاوانباران مانای ئەوە نیە پێغەمەر پشتیوانی کردوون، قەدەغە کردنەکە بەر لەوە بووە هەڵسێ بەو خراپەیە، بۆئەوە بیری لێی نەکاتەوەو هەتا ببێ بە ئاسایش بۆ هەموو ئادەمیزاد.

پرسیار/ ئەگەر کاری خراپە قەدەغە نەگونجێ بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ بەهۆی ئەوەوە خۆی لە خۆیا خۆگرو خۆپارێزە لە هەموو خراپەیە، ئیتر بۆ ئەبێ خوا ئەو باسە بەرپا بکا؟

وەڵام/ بە ڕاستی خوای مەزن فەرماندانی خۆی ڕوویێ ئەکا بۆ لای پێغەمەر لە هەموو کاتێکا، چونکە ئەو شتانە فەرمانە لەلایەن گەورەی بەرزو بەرزتر بۆلای بچوك و بۆلای خوارەوەی خۆی هەتا هەموو کاری چاك و خراپ بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕون ببێتەوەو لە پێشەوە ئاگاداری بکا لە چۆنیەتی هەموو ڕووداوێکا.

﴿ وَأَسْتَغْفِرِ اللهَ إنَ اللهَ كانَ غَفُوراً رَحِيماً ﴾ وە تۆ داوای لێ خۆشبوون بکە لە خوا بۆ ئەو شتانە هاتووە بە دڵتا بۆ سزادانی ئەو جولەکەیەو پاڵ پشتی کردنی توعمەی دزو هۆزەکەی. بەم جۆرە ئامۆژگاریانەی خوا بۆ پێغەمەر بۆ ئەوەیە پەیڕەوانی ئەو بیکەن بە دەستور بۆخۆیان. بە ڕاستی خوا لێ خۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە داوای لێ بوردن ئەکەن، میهرەبانە بۆیان.

﴿ وَلا تُجادِلْ عَنِ الذِينَ يَخْتانُونَ أَنْفُسَهُمْ إنَ اللهَ لا يُحِبُ مَنْ كانَ خواناً أَثِيماً ﴾ وەتۆ پارێزداری مەکە لە کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان کردووە لە خۆیان بە دزی کردن و لایەنگری تاوانبار. بەڕاستی خوا خۆشی ناوێ کەسێ ناڕاستە بە زۆری بە هۆی دزینی ئەو زرێیە، زۆر گوناهبارە بەوەی بە ناڕەوا ئەو جولەکەیەی کردووە بە دزینی ئەو زرێیە.

بۆ زانین: ئەو توعمە ناوەی کە دزی کردبوو دوای ئـەو ڕوداوە هەڵـهات و لـە ئـایین وەرگەڕاو چوو بۆ مەکە، لەوێش چوو بۆ دزیی لە مـاڵێك و کونـی کـردە خانوەکـەیان، بەردێ کەوت بەسەریاو کوشتی.

ناوەڕۆکی مانای ئەو ئایەتانەی پێشوو هەر چەندە بە ڕووالەت ڕوویان پێ کراوە بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەڵام هەموو کەس ئەگرێتەوە. بـە تایبـەتی دادوەران و فـەرمان ڕەواو کـار بەدەستان، ئەو کەسانە خراپەکارن نابێ پشتیوانیان لێ بکرێ. بە ڕاسـتی تۆڵـە لـە هـەموو کەسانێ ئەسێنێ کە درۆزنبن و ستەم لە جگەی خۆیان بکەن.

﴿ يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلا يَسْـتَخْفُونَ مِـنَ اللهِ ﴾ خۆیـان ئەشـارنەوە لـە ئـادەمیزادو شەرمیان لێ ئەکەن و ئەترسن ئازاریان بدەن، لە پەنهانیدا دژی ڕاستین و، خۆیان لە خـودا بۆ ناشاردرێتەوە، لە خوا ناترسن و شەرم ناکەن، هەر خوایش شایانە بۆ ئەوەی شـەرمی لێ بکرێ و لێی بترسێ.

﴿ وَهُوَ مَعَهُمْ ﴾ وە خوا لەگەڵ ئەو کەسانەیەو بە نهێنی دڵیان ئەزانێ و هیچ شـتێ لـە خوا پەنهان نیە. ئەو ئایەتە پیرۆزە بەسە بۆ ئەو کەسانەو ئابڕویان ببا، بە هۆی بێ شـەرمی و نەترسانیان لە خواو ئەیشزانن خوا ئاگاداری هەموو شتێکە.

﴿ إذ يُبَيِّتُونَ مالا يَرْضى مِنَ الْقَولِ وَكانَ اللهُ بِما يَعْمَلُونَ مُحِيطاً ﴾ کاتـێ ئـەو کەسـانە شەوێ پیلان دروست ئەکەن، درۆو بوختان ڕێك ئەخەن بە شتێ خوا ئەو شتە پەسەند ناکا کە بریتیە لە دزی کردنی توعمەو ئەدرد زینـی ئەوزرێیـە ئـەدا بەسـەر ئـەو جولەکەیـەداو سوێندی درۆ ئەخوا. لە نێوان خۆیانا ئەیان ووت: پێغەمەر سوێندی موسڵمانان وەرئەگیرێ و باوەڕ بە جولەکەکان ناکا، خوا ئەزانێ بەشـی ئەوان ئەیشارنەوەو ئاگادارە.

﴿ ها أَنْتُمْ هؤلاء جادَلْتُمْ عَنْهُمْ في الحَيـاةِ الدُنْيـا ﴾ ئێـوەی بـاوەڕدار ئاگـادارین، ئێـوە بەرگری و پارێزەری لە توعمە و خزمەکانی ئەکەن کە بەو بۆنەوە موسڵمانن لە زیندەگانی جیهاندا. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەو ئایەتە گفتوگۆیە لەگەڵ خزمانی توعمە، یانـێ ئێـوە لایەنی توعمە ئەگرن لە ژیانی جیهاندا.

﴿ فَمَنْ يُجادِلُ عَنهُمْ يَوْمَ القِيامَةِ ﴾ دوایی چ کەسێکە دژایەتی خوا بکاو بەرانبەری ڕاوەستێ و بەرگری بکا لە توعمە و خزمەکان توعمە لە ڕۆژی هەڵسانەوەیان لە گۆڕەکانیان، هیچ کەسێ ئەو توانایەی نیە و هەمو کارێ بەدەستی خوایە لەو ڕۆژەدا کەفەرمان ئەدا بخرێنە نێو ئاگرەوەو سزایان ئەدرێ. بەو ئایەتە قەدەغە کراوە یارمەتی دانی ستەمکاران.

﴿ أمْ مَنْ يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً ﴾ یا چ کەسێکە بەسەریانەوە بێ و ئاگادریان بکاو بیان پارێزێ لە سزا لە ڕۆژی دووایدا و ببێ بە پارێزەریان. بێگومان هیچ کەسێ ئەو توانایە نیە.

﴿ وَمَنْ يَعْمَلْ سوءً أو يَظْلِمْ نَفْسَهُ ﴾ وەهەرکەسێ کارێکی خراپ بکاو ئازار بە جگەی خۆی بگەیەنێ و نیازی وابێ تاوانێ بدا بەسەر کەسێ تردا. بە وێنەی درۆ کردن لەگەڵ قەتادەی خاوەنی زرێیکەو لەگەڵ زەیدی جولەکە، یا ستەم لە خۆی بکاو سوێندی درۆ بخواو بوختان بکا بە کەسێ ترداو هاوبەش بۆ خوا دابنێ.

﴿ ثم يستغفر الله يجد الله غفوراً رحيماً ﴾ دوایی ئەو کەسە داوای لێ خۆش بوون بکا لە خوا و پەشیمان ببێتەوە لەو گوناهانە کردویەتی خوای دەست ئەکەوێ بەوە لەو کەسە خۆش ببێ لەگوناهەکانی و میهرەبانە لەگەڵیا . ئەو ئایەتە هانی هەموو گوناهباران ئەدا بۆ پەشیمان بوونەوە لەگوناە . بەتایبەتی توعمە و خزمەکانی .

دوای ئەو فەرمودانەی پێشوو: خوا بۆمانی ڕون کردۆتەوە ڕێگەی دۆزینەوەی پەشیمان بونەوە لە گوناە. ڕوونی کردوەتەوە گوناە هەرچەندە زۆرو گەورەبێ، یا کەم و بچوکبێ نابنە هۆی وەرنەگرتنی پاڕانەوەو پەشیمان بونەوە لە هەرکاتێکا داوای بکا.

﴿ وَمَنْ يَكْسِبْ إثْماً فَانَما يَكْسِبُهُ عَلَى نَفْسِهِ وَكانَ الله عَليماً حَكيماً ﴾ وەهەر کەسێ گوناهێ بکاو بیەوێ بیدا بەسەر کەسێ تردا پاکبێ، دوایی بە ڕاستی ئەو کەسە تۆڵەی لەو گوناهەی لەسەر خۆیەتی و بۆ خۆی ئەگەڕێتەوەو، خوا هەموو شتێ ئەزانێ. بە تایبەتی فەرماندانی بە بڕینی دەستی دز.

﴿ وَمَنْ يَكْسِبْ خَطِيئَةً أَوْ إِثْماً يَرْمِ بِهِ بَرِيئاً ﴾ وەهەر کەسێ گوناهێکی بچوك بکـا یـا گوناهێ بە هەڵە بکا. یا گوناهێکی گەورەبێ، یـان بەدەسـتیان قـەس بیکـا، لـە پاشـا ئـەو گوناهە بگرێتە کەسێ تری بێ تاوان. ببێتە هۆی لەکـەدارکردنی، بـۆ ئـەوەی ئـەو کەسـە تۆڵەی تاوانەکەی هەڵگیرێ، بە وێنەی توعمە کـە ئـەو زرێییـەی دزی دایـە پـاڵ زەیـدی جولـەکە.

﴿ فَقَدِ احْتَمَلَ بُهْتاناً وَإِثْماً مبيناً ﴾ دوایی بە ڕاستی ئەو کەسە بوختـانێك و گونـاهێکی ئاشکرای هـەڵگرتووە، ئـەندازەیان لـە گـەورەییدا دیـاری نـاکرێ، چونکـە ئـەو کەسـە گوناهباربووە بە کردنی ئەو گوناهە، تاوانباریشە بەو بوختانە داویەتیـە پـاڵ کەسـێکی بـێ تاوان. کەواتە لەیەك کاتدا دوو گوناهی کردووە.

بۆ زانین: بۆختان کردن دوو جۆرە:

(١) کەسێ گوناە ئەکاو ئەیداتە پاڵ کەسێ تری بێ تاوان.

(٢) کەسێ خۆی گوناهی نەکردووە، بەڵام بوختان ئەکا بە کەسێ تری بێ تاواندا، ئەو کەسانە وەك دەستیان قـەس ئـەژمێرێ کـە تۆڵـەی زۆر گەورەیـەو سـەختە، خزمـەکانی توعمەی دز، ئەیانزانی کە توعمە زریکەی دزیوە کەچی پیان ووت: تۆ لای پێغەمـەر(د.خ) سوێند بخۆ کە من نەم دزیوە، بێ شەرمانە داوایان لە پێغەمەر کرد کە بەرگری لـە توعمـە بکاو بیپارێزێ لە تۆڵەی دزینی ئەو زرێیەو بیداتە پاڵ ئەو جولـەکەیـە، بـۆڕون کردنـەوەی ئەو باسە خوا فەرموی:

﴿ وَلَوْلا فَضْلُ اللهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُـهُ﴾ وەئەگـەر گـەورەی خـوا بەسـەر تـۆ نەبوایـە کـە سروشی بۆ ناردی و لە ڕاستی و ناوەڕۆکی ڕووداوەکە ئاگاداری کردی و، میـهرەبانی و بەخشندەیی خوا نەبوایە کە تۆی لە نیازی سزادانی زەیدی جولەکە و لە باوەڕ پێ کردنـی توعمەی کوڕی ئەبو یریڤ لایدای.

﴿ لَهَمَّتْ طائِفَةٌ مِنهُمْ أنْ يُضِلُّوكَ وَما يضِلُّونَ إلاّ أنْفُسِهِمْ ﴾ بە ڕاستی ویستیان تاقمێ لە هۆزی بەنی زوفەری خزمانی توعمەی دزو نیازیان وابوو کـە تـۆ وەربگـێڕن لـە فـەرمانی

ڕاستی و بت خەڵەتێنن لەگەڵ ئەوەیشدا ئەیانزانی ڕوداوەکە چۆن بوەو، لە ڕێگە لانادەن و کەس ناخەڵەتێنن مەگەر هەر خۆیان وەرگێڕن لە ڕاستی، چونکە تاوانی ئەو کارە بۆخۆیان ئەگەڕێتەوە.

﴿ وَما يَضُرُّونَكَ من شَيءٍ ﴾ وە ئەوان زیان بە تۆ ناگەیەنن هیچ شتی، تۆ لەژێر پاراستنی خوادای، ئەو شتەی هات بە دڵی تۆودا کە یاسا بەسەربێ تاوانا دابەزێنێ بە گوێرەی دەرکەوتووی ڕووداوەکە بوو کە زرێیەکەیان لە ماڵی زەید دەرهێنا، بەو بۆنەوە ویستت دەستی زەید ببڕێ.

ئەو ئایەتە بە ڕونی بۆمان دەرئەخا کە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لایەنی توعمەی نەگرتووە کە خۆی و هۆزەکەی لە پەیمان لایانداوە، هەرگیز پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نەیویستوە دەستی زەید ببڕێ لەبەر دڵی ئەوان، پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ تەماشای دەرکەوتنی زرێیەکەی کردوە لە خانوی زەویدا هێنایانە دەرێ.

﴿ وَأَنْزَلَ اللهُ عَلَيْكَ الْكِتابَ وَالْحِكْمَةَ ﴾ وە خوا ناردویتیە خوارەوە نامەیەکە بریتیە لە قورئان کە یاسای هەموو ڕۆوداوێکی بۆ ڕون کردویتەوەو، ناردوێیتە سەری تۆ هەموو ئەو فەرمانانە لە قورئاندا، هەموویان لە جێگەی شیاویی خۆیانا دانراون، بە تۆی ناساندووە کاری ڕەواو قەدەغە.

﴿ وَعَلَمَكَ مالَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ ﴾ وە خوا فێری تۆی کردووە شتێ تۆ ئەو شتەت نەزانیوە، بە هۆی سروشە هەموو کارێکی نهێنی پێ ناساندوویی. بە تایبەتی پیلانی هۆزی توعمە کە لە شەودا بڕیاندابوو کە تۆ لایەنی ئەوان بگری.

﴿ وَكانَ فَضْلُ اللهِ علَيْكَ عَظِيماً ﴾ وە گەورەیی و ڕێزگرتنی خوا بەسەر تۆوە گەورەیە، چ شتێ بێ گەورەتر لەوەی تۆی کردووە بە فروستادەو کردوویتی بە پێشەوای هەموو ئادەمیزاد. بە تایبەتی تۆی پاراست لە هەڵەو هەڵ خلیسکان و فێری کردن شتێ ترنەت ئەزانی.

ئەو ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوە بۆ هیچ کەسێ دروست نیە لایەنگرێ هیچ کەسێ تر بکا بە بوون و نەبوونی هیچ ڕووداوێ، پێویستە فەرمان ڕەوا لایەنی هیچ کەسێ نەکرێ لە باوەڕداران و لەبێ باوەڕان هەتا پێویستی ڕوداویان بۆ دەرئەکەێ. پەیدابوونی شتێکی دزراو نابێتە هۆی فەرماندان بەسەریا مەگەر پاش ڕوون بوونەوە.

پاش ئەوەی خوای مەزن لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی ئەو کەسانەی کرد بە شەودا کۆڕیان بەست بۆبڕیاردان لەسەر گفتوگۆی ناڕەواو یارمەتی دانی گوناهباران، دوایی باسی ئەو کەسانەمان بۆ ئەکا کە زوربەی چغەکانیان چاکەی تێدانیەو ئەفەرموێ:

لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾

﴿ لا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْواهُمْ إلاّ منْ أمَرَ بِصَدَقَـةٍ ﴾ هیـچ چاکەیـە نیـە لـە زۆربـەی چغەی تاقمی توعمەدا، بە تایبەتی ئەو پیلانە نهێنیە بەشەوا ڕێکیان خست بـۆ ڕزگـارکردنی توعمە مەگەر چغەی کەسێ فـەرمانی دابـێ بـە بەخشینی دارایی بـە لێ قـەوماوان و بـە هەژاران.

﴿ أَوْ مَعْرُفٍ أَوْ إِصْلاحٍ بَيَنَ النّاسِ ﴾ یا فەرمانی دابێ بە پەرستنی خواو بە شتێ یاسای ئیسلام پەسەند کردبێ. وەك دەست گیرۆیی کردنی ئادەمیزادو هەموو شتێ لای یاساو لای ئەقلّ چاکبێ. بە چاکە ئەژمێررێ بە ڕووپێکی گەشەوە گفتوگۆ لەگەلّ دانیشتوان بکرێ یا فەرمانی دابێ بە ئاشتەوایی پەیداکردن لەنێو ئادەمیزاد، لێلّی دوژمنایەتی نێوانیان نەهێلّێ، بەمەرجێ لە سنوری یاسای بەرێزی ئیسلام دەرنەچێ.

ئەو ئایەتانە هەرچەندە دەربارەی چغەکردنی تاقمی توعمە هاتوەتە خوارەوە. بەلاّم هەموو چغەیە بۆ کاروباری ئادەمیزاد بکرێ ئەی گرنەوە. بە ڕاستی ئەو ئایتە جێگەی کۆبوونەوەی هەموو چاکەی تێدا باسکراوە.

پرسیار/ وەك باسکرا زۆربەی چغەچاکەی تێدا نیە. بە ڕاستی وەك ئەزانرێ چغە لە نێو یەکتریدا ئەکرێ دەربارەی بازرگانی و پیشەسازی و کشت و کالّ و شتی تردا لەو شتانە پەیوەندیان بە گوزەران و بوژانەوەی دانیشتوانەوە هەیە، ئایا ئەوانەیش چاکەیان تێدا نیە؟

وەلاّم/ ئەو شتانەی چاکەی ڕوتیان تێدایە ئەگەر لەسنوری یاسای ئایین دەرنەچن زۆر چاکن بگرە وایش ئەبێ ئەو چغانە پێویستین بە گوێرەی یاساو ئەقلّ و نەریت لە کاتێکا ژیان و بوژانەوەی ئادەمیزادیان پێوە بەسترابێ.

﴿ وَمَنْ يَفْعَلْ ذلك إبْتِناءَ مَرْضاةَ اللهِ ﴾ وەهەر کەسێ ئەو سێ شتانە ناوبراون بەجێیان بهێنێ لەبەر داواکردنی ڕەزامەندی خوا. فەرماندان بە چاکە هەموو کاتێ هەر چاکەیە. بەلاّم کارپێ کردنیان لەبەر خوا نەك بۆ پەیداکردنی پلەو پایە، زۆر گەورەترە لەوەی ئامۆژگاری خەلّکی بکرێ و کاری چاکەیان بۆ ڕون بکرێتەوەو خۆی کاری پێ نەکا، بگرە لەلایەن خوای مەزنەوە ئەبێتە هۆی سزادان، فەرماندان بە چاکە ڕێگەیە بۆ کردنی چاکەو مەبەست بریتیە لە کارپێ کردنی، ئەگەر کاری پێ نەکرێ سودی بۆ ئامۆژگاری کەرنیە.

﴿ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أجراً عَظِيماً ﴾ دوایی ئێمە ئەبەخشین بەو کەسە پاداشتی زۆر گەورە نەیەنە ژمارەو هەموو شتێ لە چاو ئەوا بەکەم دابنرێ.

﴿ وَمَنْ يُشاقِقِ الرَسُولَ مِنْ بَعْدِ ما تَبَيَنَ لَهُ الْهُدى ﴾ وەهەر کەسێ دوژمنایێتی فروستادەی خوا بکاو بێ فەرمانی بکا لە دووای ئەوەی بۆ ئەو کەسە ڕون ببێتەوە ڕێگەی ڕاست و ڕانموییی بە هۆی ئاگادار بوونی لەسەر کارە بە هەموو کەس نەکراوەکان کە بەڵگەن لەسەر ڕاستی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾.

﴿ وَيَتَبِعْ غَيْرَ سَبِيلَ الْمُؤمِنينَ ﴾ وە دوای جگەی ڕێگەی باوەڕداران بکەوێ، زانایان ئەڵێن: ئەو ئایەتە لە بارەی توعمە دزەوە هاتۆتە خوار. بەڵام هەموو کەسانێ ئەگرێتەوە کە کردەوەیان وێنەی ئەوبێ.

﴿ نُوَلِهِ ما تَوَلى وَنُصْلِهِ جهنّم وَساءَ تْ مَصِيراً ﴾ وە ئێمە ئەو ئەگێڕین بەسەردارو خاوەنی ئەو شتە خۆی سەرداری کردووەو بۆخۆی هەڵبژاردوە لە گومڕایی و لادانی لە ڕاستی و خۆی و بۆ خۆی سەربەستە لەهەر کارێکا ئەیکاو، ئێمە ئەو کەسە ئەخەینە دۆزەخەوەو دۆزەخ خراپ جێگەی گەڕانەوەیە.

ئەو ئایەتە چەندین سودی تێدایە:

١- فەرمودەی خوا (نُوَلِهِ ما تَوَلى) ئاماژەی ئاشکرایە ئادەمیزاد سەربەستن و نابڕێن بە ڕێگەدا بۆ هیچ کارێ

٢- (مِنْ بَعْدِ ما تَبَيَنَ لَهُ الْهُدى) بەڵگەیە لەسەر ئەمەی هەر کەسێ بە وردی گەڕا بە شوێن ڕاستیدا ڕێگەی نەدۆزییەوە ئەو کەسە بیانوی لێ وەرئەگیرێ بە وێنەی کەسێ بانگی ئیسلامی پێنەگەیشتبێ، بە مەرجێ ڕوبکا بۆلای ڕاستی و کار بەڕاستی بکا هەر کاتێ ڕاستی بۆ دەرکەوت.

٣- ئادەمیزاد داوای شتێکی لێ ئەکرێ بیزانێ لە بەڵگەیەکەوە، بەر پرسیارنیە لای خوا ئایا لە ڕاستیدا وایە یا نە؟، ئەوەی داوای بۆ بکرێ لە ئادەمیزاد گەڕانە بە ووردی بۆ ڕاستی بە گوێرەی توانای خۆی هەتا دەستی لە هەموو بەڵگە ئەبڕێ، ئەگەر توشی ڕاستی بوو ئەو کەسە ئەبێ بە خاوەنی دوو پاداشت: بۆ کردنی ئەو شتەو بۆ گەڕان بە شوێن ڕاستیدا.

٤- پرسیار لە پێشەوا شافعی کرا لە ئایەتێ بەڵگەبێ لەسەر (الأجماع) ئەفەرموێ (٣٠٠) جار قورئانم خوێند هەتا ئەم فەرمودەیەی خوام دەست کەوت (وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ). کەواتە دواکەوتنی باوەڕداران پێویستە، ڕێگەی ئەوانیش کۆبونەوەیانە لەسەر هەر شتێ بێ.

هەر کاتێ یەکێتی نەتەوەکان بنچینەی لەسەر یەکێتی بیروباوەڕ دانرابێ، پێویستە پەرستراوەکەیشیان یەکبێ و خوایان یەکبێ، ئەو کاتە سەرکەوتنیان مسۆگەر ئەبێ، ئەگەر نیازو بیرو باوەڕو پەرستراوەیان زۆربون و پارچە پارچە بن سەرکەوتنیان بۆ ناگونجێ، بۆیە خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پەرستنی خوا بە تەنهاو هاوبەش بۆ خوا دائەنرێ و ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾

يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾

﴿ إنَّ اللهَ لا يغفر أنْ يُشْرَكَ بِهِ ﴾ بە ڕاستی خـوا خـۆش نابـێ کـە هاوبەشـی بـۆ ئـەو دابنرێ لە پەرستندا بمرێ لەسەری. ئـەو ئایتـە هاتۆتـە خـوارەوە دەربـارەی پیـاوێکی بـە سالاچوو کە چووە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ووتی: من لەمەوپێش چوبوومە خـوارەوە لـە گوناە کردندا. بەلام لەو کاتەوە باوەڕم بە خـوا هێنـاو هاوبەشـم بـۆ دانـەناوەو ناسـیومە، جگەی خوایش کەسم نەکرووە بەسەرداری خۆم، لەبەر ئەوەی پەلاماری گوناهم نـەداوەو پەشیمان بومەتەوە لـە گوناهەکانم ئەبێ خوا چ شتێکم پێ بکا، بەو بۆنەوە ئـەو ئایەتـە هاتـە خوارەوە هەندێ تر لـە زانایان ئەلێن: هاتوەتە خوارەوە دەربارەی توعمەی کوڕی ئەبو بریق کە لەسەر هاوبەشدانان مرد.

﴿ وَيَغْفِرُ ما دُونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشاء ﴾ وەخوا خۆش ئەبێ لە شتێ جگـەی هاوبەشـدانانبێ بۆ خوا ئەگەر پەشیمان ببێتەوە بە ڕاستی لە بۆ کەسێ ئـارەزۆی هـەبێ لـێـی خـۆش ببـێ. ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە هەموو کەسێ ئەگرێتەوەو هـەموو گوناهـێ ئەگرێتـەوە، بـە پەشـیمان بونەوەیش لـە هاوبەشدانان، ئەگەر مرۆڤێکی گوناهبـار بمـرێ و پەشـیمان بوبێتـە، بـۆ ئـەو کەسە هەواڵەی ئارەزۆی خوایە.

﴿ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً بَعيداً ﴾ وەهەر کەسێ هاوبەشی بۆ خـوا دابنـێ بـە بت و جگەی بت لە گۆڕ پەرستی و پیران و کار بەدەستان و سامان، دوایی بە ڕاستی ئـەو کەسە لە ڕێگەی ڕاست لایداوە بە لادانێکی دووورودرێژ و بێ کۆتا.

هەرچەندە لە باسی ماناکردنی ئایەتی (٤٨) لـە سـورەتی ئەلبەقـەرەدا باسـی دووپـات کردنەوەی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئان کرا بۆ هەندێ ڕووداو بۆ دووجار یا زۆرتـر، لـەم سورەتەیشدا جارێ تر وێنـەی نـاوەڕۆکی ئـەو ئایەتـەی (٤٨)ی ئـەم سـورەتەیش لـێرەدا دووپات کراوەتەوە، ئەبێ هۆی ئەو دووپات کردنـەوە چ شـتێ بـێ کـە لـە زۆر شـوێنی قورئاندا هەن؟

وەڵامی دوپات کردنەوەی هەندێ ئایەت لەبەر ئەمانەیـە: ئـەبێ بزانـین قورئـان یاسـای دەست کردو نامەی هونەری نیە باسی ڕووداوێ بکا یەك جار بگەڕێتەوە بۆلای ئەو یاسایە کەسێ بیەوێ کار بەو یاسایە بکا. بەڵکو قورئان نامەی ڕانموویيە، نامەی شارەزایی کـردن و سەپاندنی ڕەووشتی بەرزو بەرێزە بۆ ئادەمیزاد، ئەوانەیش پێك دێن و ئەچنە مێشکەوە بـە هاوردن و بردنی چەند مانایەکە پێویسـتین و بخرێنـە دەرون و مێشـکی ئـادەمیزادەوە، لـە هەموو باسێکا کە ئامادە بکرێن بۆ وەرگرتنی مانای مەبەست پێك نایەن بـۆ ئـادەمیزاد لـە هەموو ڕوێکەوە بە باشی بە جگەی دووپات کردنـەوەی باسـەکە، بۆیـە ئـەبینرێ خـاوەن بیروباوەڕو خاوەن ڕامیاریـەکان و ئـەو کەسـانەی دەسـتوری کۆمەڵایـەتی و سروشـت و ڕەوشتی ئادەمیزاد ئەزانن و لە چۆنێتیان شارەزان بۆ چەند جارێ مەبەستەکانی خۆیـان لـە خوتبەو گفتوگۆیانا دووپات ئەکەنەوە لە ووتارەکانیدا، هەروەها ئادەمیزاد لە تواناyانا نیـەو زوربەیان ناگەن لە هەموو کون و قوژبن و چۆنیەتی هەموو ڕووداوێ بەیەکجار بەو بۆنەوە باسمان کرد پێویستە یەك خوا بناسین بۆ ئەوەی بتوانین و نەشلەژێین بە ئاواتی خۆمان بگەین لە بلاوکردنەوەی ئایین و بەرهەڵستی کردن لە دوژمن. ئەبێ لە بیرمان نەچێ پـەیدابوونی بیروباوەڕو تاقم و پـارتی زۆر یەکـەمین هـۆن بـۆ گزبونـی یاسـای ئیسـلام و بـێ هـێزی

موسڵمانان. بۆ نمونە پاش ماوەیە دوای هاتنی ئایینی ئیسلام ئاگر پەرستەکان لەنێو نەتەوەی فارسیدا پارت و بیروباوەڕی زۆریان خستە نێو موسڵمانان بۆ گۆڕانیان وا گومان پەیدا کردنیان لە ئایین و شڵەژاندیان لە دژی یەکتری، لە زۆر کاتا بە ئاواتی خراپی خۆیان گەیشتن.

پاپاکان و پاشاو کار بەدەستانی بێ باوەڕان و فەرمان ڕەوایانی ساویلکەی موسڵمانان. بە تایبەتی خاچ پەرستانی ئوروپاو زاوێنیەکان ئەوانیش لە کۆن و تازەدا پارت و تاقم و شاگردو ستونی پێنچەمیان لە نێوموسڵماناندا پەیدا کرد، بەو بۆنەوە هەوڵێکی زۆریاندا بۆ پەیداکردنی گومان و دووبەرەکی لە نێو دەرونی موسڵماناندا. بە تایبەتی بیری بێ خوایی و خستنە دڵیان و بێ نرخ کردنی ئایین لە ناویانا، بۆ پشت گیری مەبەستی خۆیان یارمەتی زۆریان وەرگرت لە دابەزینی لاوازی کردنی باوەڕداران بە گۆڕینی جل و بەرگی ناشایستە بۆ ژنان و مۆدێلی وا کە دژی پەیڕەویی ئیسلامن و بە بڵاوکردنەوەی خواردنەوەی مەی و کردنی قومار و ئامادەکردنی جێگەی داوێن پیسی بێ ئەندازەیی بەبێ ترس، بەو بۆنەوە کێوی سەختی ئایین بە گورجی کزو لاوازبوون. ئەگەر هەروەها بڕوا تروسکەی نامێنێ و ئەتوێتەوە، بۆ ئەو ڕووداوانە موسڵمانان بە گشتی و زانایان بە تایبەتی و کاربەدەستان بە تایبەتی تر بەر پرسیارن.

خوای مەزن باسی ئەو کەسانەی بۆ کردین هاوبەشیان بۆ خوا دائەنا لە پەرستنیدا لەو ئایەتانەی پێشودا. عەرەبەکان بەر لە ناردنی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ گومانیان وابو فریشتەکان کچی خوان. دوایی خوا باسی چۆنیەتی کردەوەی ئەو بێ باوەڕانەمان بە ڕوونی بۆ ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ إِنْ يَدْعُونَ مِنْ دونِهِ إلاّ إناثاً ﴾ ئەو بت پەرستانەی عەرەب ناپەرستن لە جگەی خوا مەگەر چەند پەرستراوێکی مێینە، بۆیە بە گوێرەی بیروباوەڕی خۆیان و بۆ پیرۆزی ناوی بتەکانیان ئەنا بە ناویی ژنانەوە، وێنەی ئەوانیان ئەکێشا بە وێنەی ژنان و شخڵی ژنانەیان ئەکرد بە بەریانا، وەك لات و عوزاو مەنات، بەلایانەوە وابوو ئەو بتانە لە وێنەی کچەکانی

خوان و لە خواوە نزیکن. بەڵام کە ماوەی زۆریان بەسەردا تێپەڕی بەوەیشەووە نەوەستان یەکسەر کردنیان بە خواو بڕوایان وابو ئەوان ڕۆزی دروست کەرن. بە داخەوە ساویلەکەکانی ئەم سەردەمەی ئێستا وایان لێ هاتووە کە پیرەکانی تەریقەت زیان و سود ئەبەخشن بە ئادەمیزاد، بێ شەرمانە ئەچنە لای گۆڕی مردووەکان و لەوان ئەپاڕێنەوە، لە کەسێ لەوانە سەر بە تەریقەتانن لێم بیست وتی: گیبا بەبێ دەستوری فلان پیر سەوز نابێ و لای کەسێ لە زانا گەورەکانیان ئەو گفتوگۆیەی کردو ئەویش دەنگی نەئەکرد.

﴿ وَإِنْ يَدْعُونَ إِلاَّ شَيْطاناً مَرِيداً ﴾ وە ناپەرستن لە ناوەڕۆکا مەگەر شەیتانی زۆریاخی لە پەرستنی خوادا، چونکە هەر شەیتان فەرمانی پێداون بە پەرستنەکان و ئەو بیروباوەڕە خراپە. کەواتە لە بنەڕەتدا شەیتان پەرستن.

﴿ لَعَنَهُ اللهُ وَقالَ لأَتخذن مِنْ عِبادِكَ نَصِيباً مَفْرُوضاً ﴾ خوا شەیتانی بێ بەش کردووە لە میهرەبانی و بەزەی خۆی، شەیتان وتی: بە ڕاستی من وەرئەگرم بۆ خۆم لە بەندەکانی تۆ بەشێکی پێویست کراو، بێژراوە لە هەموو هەزارێکا نۆسەدو نەوەدو نۆیان بەشی شەیتانن، یەك کەسیان بەشی خوان. ئەو ڕستەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەیتان ئەوپەڕی دوژمنی ئادەمیزاد.

پرسیار/ لەو ڕستەیەوە وادەرئەکەوێ شەیتان کەسێکی ڕاستەقینەیەو هەموو هێزو بڕوایەکە بۆخۆی گفتوگۆ ئەکا بەرانبەر خوا ئایا ئەبێ بەو جۆرە بێ یا مانایەکی لێ ئەدرێتەوە بە جۆرێ تر.

وەڵام/ هەموو کەسێ لە ئادەمیزاد ئامادەیی تێدا هەیە بۆ کردنی کاری چاك و کاری خراپ، بە ڕاستی مەبەست لەوبەشەی شەیتان خۆ ئامادەکردنی شەیتانە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد کاری خراپ بکا.

بۆ زانین: لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن: شەیتان هەر نەبووەو نابێ، بە ڕاستی بیرکردنەوە لە شەیتان کە دەسەڵاتی پەیدا کردووە بەسەر ئەقڵی ئادەمیزادا لە ڕۆژێکا بووە زانین و

زانست بریتیە بووە لە چەندین ووشەیە ببێژرێ لە نێو ڕیزی قوتابیەکاندا، بریتی بووە لە چەندین دێڕ لاپەڕەی نامەکانی پڕکردوەتەوە، سەری نەکێشاوە بۆلای کار پێ کردن مەگەر کەمجار. بەڵام لەم ڕۆژەدا بە ڕاستی بیرۆکەی شەیتان بە هەموو ماناکانیەوە گەڕاوە بە چیرۆك و پڕو پوچ و بێ بنچینە، دوای ئەوەی زانست بەراوردکارە بۆ هەموو ڕاستەقینەو بنچینەیە بۆ هەنگاوێ هەنگاوی بۆ ببەیی و خاوەنی هێزە لە هەموو گۆڕەپانێکا کارێکی بە هەموو کەس نەکراویی وایە ئاسن ئەخاتە جوڵە بە هەزاران مەتر ببڕێ بە ماوەیەکی کەم، ئەفڕێی بە هەوادا بۆلای مانگ و مەڕیخ و لەناو ئەوانە گفتوگۆ ئەکەن لەگەڵ دانیشتوانی زەویدا. کەواتە زانست بەشی شەیتان ناهێڵێ هەتا بیر لە شەیتان بکەینەوە؟

لە وەڵامدا ئەبێژرێ زانستیش دوو جۆرە: چاك و خراپ، خراپەکەیان بەشی شەیتانە، ئێمە گومان نابەینە هیچ کەسێ لە نرخی زانست و سودەکانی کەم بکاتەوە، بە ڕاستی زانست هێزو سامانێکی گەورەیە. ئادەمیزاد پێویستیان بە زانست هەیە بە وێنەی پێویستیان بە ئاو. بەڵام هیچ کەسێ نیە نەزانێ کە زانست بە تەواوی وەك ئادەمیزادە لە ئامادەبونیا بۆ کاری چاك و خراپ. بەڕاستی هەرکاتێ زانست ڕووی پێ بکرێ بۆلای چاکە خواردەمەنی ئەرەخسێنێ بۆ کەسانی برسی و بەرگ بۆ ڕووتاڵەکان و چاك کردنەوەی نەخۆشەکان. کاتێ زانست ڕووی پێ بکرێ بۆلای خراپە دانیشتوان ئەکوژێ و ئاوەدانی کاول ئەکا، خراپە جێگەی ڕامیاری ئەو شەیتانەیە ئێمە باسی ئەکەین و مەبەستمانە، بە ڕاستی زانیاری ئەمڕۆ بەدەستی ڕامیاریەوەیە ڕوی پێ ئەکا بۆلای لەناوبردن و کاول کردن و دەستەڵات پەیداکردن و چەوسانەوە.

بە ڕاستی بەشی شەیتان بەهەر شێوەیە ئارەزۆت هەبێ دوپات ئەبێتەوە بە پێشکەوتنی زانیاری و گەشەکردنی، چونکە یاریدەرانی خراپە لە ڕابوردوودا خۆیان چەکدار ئەکرد بە چەکی بازوو لەش. بەڵام ئێستا دوای ئەوەی زانست ئەم دەستەڵاتەی پەیدا کردووە، تاقمی شەیتان خۆیان چەکدار ئەکەن بەزەڕەو بە چەکی خراپ بۆ نەهێشتنی شارستانی و بۆ داگیرکردنی جیهان، ئەو کەسانە خۆیان شەیتانن و دوژمنی خواو ئادەمیزادن، ئەو

خوێندنگایانە ئێستا لێرەو لەوێ بڵاوبونەتەوە زۆریان بەشی شەیتانن و باسی ئایین و ڕەوشتی بەرزیان تێدا ناخوێنلرێ. هەر بەو جۆرە وڵامی شەیتان ئەدەنەوە کە خوا ئاماژەی پێ کردووە بە فەرمودەی خۆی (لأتخذن مِنْ عِبادِكَ نَصِيباً مَفْرُوضاً). ناوەڕۆکی ئەم ئایەتەی خواو ڕەویشە کە ئەفەرموێ:

﴿ وَلأُضِلَنَهُمْ وَلأُمَنِيَنَهُمْ ﴾ شەیتان ئەڵێ: سوێندم بەخوا، من بەندەکانی تۆ لائەدەم لە ڕێگەی ڕاست بە هۆی ڕازانەوەی کاری پوچ و خراپ کە ئەیان ڕێژمە دەرونیان، وەوایان لێ ئەکەم بەتەمای مانەوەی زۆر بن لەجیهاندا خۆیان نابەستن بە کاری ڕاست و چاکەوە، بەبێ شەرمانە ئەڵێن: نە چاك هەیە نە خراپ. نە بەهەشت هەیەو نەدۆزەخ. زیندوبوونەوە هەر نیە، سامان و دارایی بسازێنە و بە خۆشی بژیی و بێ دڵی خۆت مەکە، ئەوانە هەموویان لادانە لە ڕێگەی ڕاست بە هۆی شەیتانەوە، من ئەخەمە نێو دڵیان چەندین ئاواتی پڕوپوچ لە درێژی ئەمەن و لەوەی زیندوبونەوەو سزادان نیەو لە گەیشتنیان بە ئاواتی خۆیان لەسەر خەیاڵ بژین، هەندێکیان بڕوایان بە خوا نیە، هەندێ تریان ئەڵێن: لە دواییدا پەشیمان ئەبینەوە، خوا میهرەبانەو ڕزگارمان ئەکا لە ڕۆژی پرسیارو تۆڵەدا، ئەوانە هەموویان بەشی شەیتانن کە بە دەیان ئاواتی بەختیاری ئەخاتە دڵیان بۆ ئەوەی لادەن لە پەرستن.

﴿ وَلأُمُرَنَهُمْ فَلَيُبَتكُنَ آذانَ الأنعامِ ﴾ وە شەیتان ئەڵێ: من فەرمان بە بەشکانی خۆم ئەدەم لەبەندەکانی تۆ بە بڕینی گوێچکەکانی ئاژاڵەکانیان، دوایی ئەوان گوێچکەی چوار پێکانیان ئەبڕن کە بریتین لە بزن و گاو مەڕو هوشتر. ئەو کارە خراپە یەکێکە لە دەیان کاری خراپی عەرەبەکان بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام کە هوشتریان پێنج بێچوی ببوایەو پێنجەمیان نێر بوایە گوێچکەی ئەو هوشترەیان ئەبڕی و قەدەغەیان ئەکرد لە خۆیان و بەرەڵایان ئەکرد.

﴿ وَلأُمُرَنَهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللهِ ﴾ وە شەیتان ئەڵێ: من فەرمانیان پێ ئەدەم بە گۆڕینی شێوازو دەست کردی خوا لە بونەوەراندا، دوایی ئەوان ئەگۆڕن دروست کراوی خوا، بۆ

نموونە: کوێرکردنی چاویی هوشترو سوار نەبوونی. خەسـاندنی ئادەمیزاد. ئادەمیزاد لـە کۆن و لـە تازەدا دروست کراوی خوایان گۆڕیەوە وەك ئەمانە:

١- بڕینی گوێکەی هوشترێ پێنج بە چکەی ببوایەو پێنچەمیان نێر بوایـەو سـودیان لێ وەرنەگرت و بەرەڵایان ئەکرد.

٢- ژنان موی جگەی خۆیان ئەهێناو ئەیان لکان بە موی خۆیانەوە بـۆ دەسـت بڕینـی دانیشتوان و خەڵەتاندنیان.

٣- ژنان بە زۆری و پیاوان بە کەمی خاڵیان ئەکوتا لـە دەست و لـە ڕومەتی خۆیـان و لـە لـەشیان بە ڕەنگی سەوز، بە هۆی کوتانی دەرزی لـە لـەشی خۆیان و بریندار کردنی.

٤- ئادەمیزادیان ئەخەسان،گوێچگەی هوشتریان ئـەبڕی، چاویـان کوێـر ئـەکرد، بـۆ نموونە: عەرەبەکان هوشترەکانیان بونایە بە هەزار سەرچاویی نێرەکەیان کوێر ئەکرد.

٥- پیاوان خۆیانیان ئەکرد بە ژن و شێوازو دەنگ و ڕەنگ و بـەرگی خۆیانیـان وەك ژنان لێ ئەکرد، لـە هەموو شتێ سەیرو سەمەرەتر ئەمەیە: کوڕ شو ئەکاو مارەی ئـەبڕن لـە پیاوێ لـە ئەوروپا بە گوێرەی یاسای دەستی کردی خۆیان.

٦- لـەم سەردەمەدا پیاوان بە ئارەزوی خۆیان ئەچنە لای دکتۆرەکان و ئامێری پیاوەتی خۆیان ئەبڕن و خۆیان ئەکەن بە ژن، بۆ نموونە: لـە ئەمەریکا (١٢) دە پیاو خۆیان کرد بـە ژن و وێنەکانیان لـە ڕۆژنامەدا بڵاوکرایەوە.

٧- عەرەبەکان و جگەی ئەوانیش خۆرومـانگ ئەسـتێرەکان ئەپەرسـت کـە خـوا بـۆ سوری ئەوانی دروست کردبوو نەك بۆ پەرستن.

٨- لـەوانە خراپتر گۆڕینی دروست کراوەکانی خوایە لـە نەهێشـتنی ئاسـایش و ژیـانی دانیشتوانی سەر زەویی بە کوشتن و ئازار دانیان، بە هۆی فەرماندانی شەیتان بـە شـاگردە خۆشەویستەکانی کە یەکێ لـەوانە سەرۆك کۆماری ئەمەریکا (ڕۆفلـت) لـە ١٩٤٥/٦/٢ بەخستنە خوارەوەی بۆنبای زەڕە بەسەر شاری (هیرۆشیما) و شاری (ناگازاکی) لـە یاباندا، تەنها جگە لـە بریندار (٨٠,٠٠٠) کەسیان لـە هیرۆشیما دا کوشت... ئەوانـەی باسکران کەمێکن لـە بەشی شەیتان.

﴿ وَمَنْ يَتَخِذِ الشَّيْطانَ وَلِياً مِنْ دُونِ اللهِ فَقَدْ خسر خسراناً مُبِيناً ﴾ وەهەر کەسێ شەیتان وەربگرێ بە دۆست بۆ خۆی لە جگەی خوا. هەرشتێ شەیتان فەرمانی پێ بداوە ئەو کەسە بیکاو ڕێزی فەرمانی شەیتان بدا بەسەر فەرمانی خوادا، دوایی بە ڕاستی ئەو کەسە زیبانی پێ گەیشتوە بە زیبانی ئاشکرا، خۆی کردووە بە بەشی شەیتان، خۆی کردووە بە دیلی ئەفسانەو پڕوپوچ و ئاواتی بێ ئەنجام، دەست مایەی سەربەستی لە کیسی خۆی داوە.

﴿ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ﴾ شەیتان بەلێن ئەدا بە بەشەکانی خۆی لە بەندەکانی خواو دوودڵی ئەخاتە دەرونیان بەوە کە نەبەهەشت و نە دۆزەخ و نە زیندو بونەوە نین. ئەو بەڵێنەی خۆی نایەتەدیی و، ئەخاتە دڵیان و وایان لێ ئەکا بە تەمای زۆر شتبن و بەوانە ناگەن، ئەخاتە دەرونیان داوێن پیسی بکەن و مەی بخۆنەوە، ژییان ڕابواردنە.

﴿ وَما يَعِدُهُمْ الشَّيْطانُ إلاّ غُرُراً ﴾ وە شەیتان بەڵێن نادا بە بەشکانی خۆی مەگەر کاری پوچ و گومڕای و فریودانیان بەدەست کەوتنی ئاواتی پڕوپوچی ئەمڕۆ.

﴿ أُولئِكَ مأواهُمْ جَهَنَمْ وَلا يَجِدونَ عَنْها مَحِيصاً ﴾ ئەو کەسانەی ئەشیتان ئەکەن بە دۆستی خۆیان جێگەی گەڕانەوەیان دۆزەخە، وەدەستیان ناکەوێ ڕزگاربوون و جێگەی هەڵهاتن و ڕاکردنیان.

پاش ئەوەی خوا باسی هەڕەشەکردنی کرد لە بەشەکانی شەیتان و لەبێ باوەڕان، باسی موژدەرانمان بۆ ئەکا بە پاداشتی چاك بۆ باوەڕداران و ئەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِيْنَ آمَنوْا وَعَمِلُوا الصّالِحاتِ سَندْ خِلُهُمْ جنّاتِ تَجْري مِنْ تَحْتِها الأنهارُ خالِدينَ فيها أبداً ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوەو، کردەوە چاکەکانیان کردووە ئێمە ئەیان خەینە نێو چەندین بەهەشت ئەڕوا بەژێر درختەکانی و ئەم لاو لایاندا چەندین ڕوباری ئاویی خۆش و بەتام بەردەوامن لەنێو ئەو بەهەشتانەدا هەتا هەتایە:

﴿ وَعْدَ اللهِ حَقاً وَمَنْ أصْدَقُ مَنَ اللهِ قَلِيلاً ﴾ ئێمە ئەو کەسانە ئەخەینە بەهەشتەوە بەڵێنی خودا بیدا ڕاستەو دێتە دی و بێگومانە، چ کەسێ بێ ڕاست گۆتر لە خوا لەلایەن فەرمودەی ڕاست و بەڵێنەوە.

خوای مەزن لەو ئایەتەدا بۆ دڵنیا کردنی باوەڕداران بەڵێنەکەی خۆی بەهێزتر کردوە بە سێ شت: (١) بە ووشەی (أبداً) بە مانا هەمیشە (٢) بە ووشەی (وَعْدَ اللهِ حَقاً) بەڵێندانی خوا ڕاستە (٣) بە ووشەی (وَمَنْ أصْدَقُ) چ کەسێ بێ ڕاست گۆتر لە خوا. مەبەست لەو بەهێز کردنە ئاگادارکردنی باوەڕداران و چاکە کەرانە لەسەر ئەوەی هەموو بەڵێنەکانی شەیتان درۆو ئەفسانەو بۆشن.

پرسیار/ بەڵێنی خوا بۆ بەخشینی بەهەشت لە زۆرترین ئایەتەکانی قورئاندا بەستراوە بە ووشەی هەتا هەتایی و هەمیشەیی، لە زۆرترینی ئایەتەکانی هەڕەشە کردندا نەبەستراوە بەو ووشانەوە، ئەبێ لەبەر چ شتێ بێ؟

وەڵام/ ئەو کەسانە چوونە بەهەشت هەرگیز نایەنە دەرەوە. بەڵام ئەو کەسانەی ئەچنە دۆزەخ وائەبێ باوەڕدارن، بۆ ماوەیە سزای خۆیان کۆتایی پێ دێنن و خوا بە میهرەبانی خۆی لە دۆزەخ دەریان بکا.

جولەکەو گاورەکان لەگەڵ موسڵماناندا خۆیان هەڵئەکێشا. خاوەن نامەکان ئەیان ووت: پێغەمەری ئێمە لەبەر پێغەمەری ئێوە هاتووە،نامەکەیشمان پێش نامەی ئێوە کەوتوە.

کەواتە ئێمە لە ئێوە چاکترین. موسڵمانانیش ئەیان ووت: پێغەمەری ئێمە دواهاوەری پێغەمەرانە، نەمەکەیشمان هەموو نامەکانی گۆڕاوە. کەواتە ئێمە چاکترین لەئێوە، خوای مەزن بۆ ڕونکردنەوەی ئەو ڕووداوە فەرمویی:

لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن

يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئـەو ئایەتانـە هاتونەتـە خـوارەوە دەربـارەی قورەیشیـەکان و خاوەن نامەکان قورەیشیەکان ئەیان ووت: ئێمە زیندو ناکرێینەوە. خـاوەن نامـەکان ئـەیان ووت: جگەی ئێمە کەسی تر ناچێتە بەهەشت، خوای مەزن فەرمووی:

﴿ لَيْسَ بِأمانيكُمْ وَلا بِأمانِي أهْلِ الْكِتابِ ﴾ پاداشت و سزاو زیندوبوونەوە بە ئـاوات و ئارەزووەکانی ئێوەی موسڵمانان و بە ئارەزۆی بت پەرستان نیـەو، بـە ئـاوات و ئـارەزۆی خاوەن نامەکان نبە. یانێ هیچ کارێ نە بە دەستی موسڵمانانە، نە بە دەستی بت پەرستان و خاوەن نامەکان ، هەموو شتێ بەڵکو هەموو شتێ بە ئارەزۆی خوایەو بـە هـۆی کۆششی خۆیانەوەیە، بە گفتوگۆی ئەوان نابێ.

﴿ مَنْ يَعْمَلْ سُوءً يجز بِهِ ﴾ هەرکەسێ کارێکی خراپ بکـات پاداشـتی ئەدرێتـەوە بـەو خراپەیە، ئەگەر باوەڕداربێ لـە جیهاندا، ئەگەر بێ باوەربێ لـە پاشەڕۆژدا، ئەبێ بزانرێ خوا خزمی کەس نیە جگە لـە کردەوەی چاك نەبێ هیچ ناگاتە فریایان.

﴿ وَلا يَجِدُ مِنْ دُونِ اللهِ وَلِياً وَلا نَصِيراً ﴾ وە ئەو کەسە دەستی ناکەوێ لـە جگەی خوا هیچ دۆست و سەرپەرشتی کەرێ و، دەستی ناکـەوێ یارمـەتی دەرێ ڕزگـاری بکـا لـە سزای خوا.

﴿ وَمَنْ يّعمل من الصالِحاتِ من ذكرّ وأنثي وهو مؤمن ﴾ وەهــەر کەسـێ هـەندێ لـە کارە چاکەکان بکا، بێگومان هیچ کەسێ ناتوانێ هەموو کارە چاکەکان بکا بە تـەواوی و خوایش داوای نەکا. بۆ نموونە: زۆر کەس هەن لـە ماوەی تەمـەنیان حـەجیان نـەکردووەو زەکاتیان نەداوە، چونکە پێویست نەبوون لـەسەریان ئەو کەسە لە پیاوان و لـە ژنان، وەئەو

کەسەیش باوەڕداربێ بە خواو ئاینی خوا. بێگومان کاری چاکە بەبێ باوەڕ سوود بەخش نیە لە پاشە ڕۆژدا.

﴿ فأوُلئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَةَ وَلا يُظْلَمُونَ نقيرا ﴾ دوایی ئەو کەسانە چاکەکان ئەکەن و باوەڕدارن ئەچنە بەهەشت و، ستەم لەوان ناکرێ بە ئەندازەی درزی دەنکە خورمایە، واتە هیچ شتێ لە پاداشتەکەیان کەم ناکرێتەوە. ژنان هەرچەندە بە گوێرەی لەش و سروشتیان جیاوازن لەگەڵ پیاوان لەم جیهانەدا، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا بە هیچ جۆرێ جیاوازییان بۆ نیە لە وەرگرتنی پاداشت و تۆڵەدا.

ڕستەی (وَهُوَ مُؤْمِنٌ) مەرجە بۆچونی بەهەشت . باوەڕهێنان مەرج نیە بۆ وەرگرتنی جگەی بەهەشت لەم ڕۆژەدا بە سامانی زۆرو پلەو پایەو لەش ساغی و ئاسایش، لە پاشا ڕۆژیشا بە سوکیونی سزای دۆزەخ، بەو مەرجە ئەو چاکانە لەبەر خواو مرۆڤایتی بێ، خوا دادپەروەرەو مافی کەس لە کیس نادا، بێ باوەڕ هەرکاتێ کاری چاك بکا لەڕێگەی چاکەدا نەك بۆ شۆرەت خوا پاداشتی ئەداتەوە.

کاتێ خوای مەزن ڕونی کردەوە کە ڕزگاربوون و چوونی نێو بەهەشت پەیوەستە بە باوەڕەوە ڕوونیشی ئەکاتەوە باوەڕیان بە چ جۆرێ چاکەو ئەفەرموێ:

وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطًا ﴿١٢٦﴾

خوای مەزن لە دوولاوە باسی گەورەیی و ڕێزی باوەڕهێنانمان بۆ ئەکا و ئەفەرموێ:

١- ﴿ وَمَنْ أحْسَنُ دِيناً ممَّنْ أسْلَمَ وَجْهَهُ الله ﴾ وە چ کەسێکە چاکترو شیرینتربێ لە کەسێ لەلایەن ئایینەوە لەکەسێ بەبێ گەردوو بە پوختەیی خۆی دابێتە خواو خوای گێڕابێ بە پەرستراوی خۆی و خوای تری نەبێ.

﴿ وَهُوَ مَحْسِنٌ ﴾ وە ئەو کەسە چاکە کەربێ و وازی لە خراپەکان هێنابێ، بە تەواویی بە تەمای خوابێ و بە تەمای کەسی تر نەبێ، لەم ڕۆژەدا پەیڕەویی یاساکانی خوای کردبێ. بێگومان هیچ کەسێ لەو چاکترنیە.

٢- ﴿ وَأتَبَعَ مِلَّةَ إبْراهِيمَ حَنيفاً وأتَخَذَ اللهُ إبْراهيمَ خَلِيلاً ﴾ وە پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیمی کردبێ کە ئیبراهیم لایداوە لە ئایینێکی پوچ. بێگومان ئەو کەسەیش پەیڕەویی ئەوی کردبێ لایداوە لە ئایینی خراپ و پوچ و، خوا ئیبراهیمی وەرگرتووە بە دۆستی خۆیی و پلەی زۆر گەورەی داوەتێ و کردوێتی بە باوکی زوربەی پێغەمەران.

پرسیار / لەبەر چ شتێکە خوای مەزن فەرموێتی (وە پەیڕەویی کردبێ) نەیفەرموە: پەیڕەوی موحەممەدی کردبێ.

وەڵام / لەبەر ئەوەیە ئایینی ئیبراهیم و ئایینی پێغەمەرو یەکن، پێغەمەرایێتی ئیبراهیمش جێگەی بڕوای هەموانە بە گشتی. نەك لای موسڵمانان بە تەنها. کەواتە باس کردنی ئیبراهیم بەهێزترە بۆ بۆڕدانی بێ باوەڕان خوای مەزن کە ئیبراهیمی کردوە بە دۆستی خۆی لەبەر ئەوە نیە کە خوا پێویستی بە ئیبراهیم هەیە، لەبەر هەر شتێ بێ وێنەی پێویستی دۆستێ بۆ دۆستێ تر نییە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئیبراهیم بە پوختەیی پەرستنی خوای کردوە، خوایش کردوێتی بە دۆستی خۆی و ڕێزی گرتووە بە میهرەبانی خۆی. ئەگینا بوونەوەران بە پێغەمەرانەوە هەموویان بەندەی خوان، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ ولله ما في السَماواتِ وما في الأرضِ وَكانَ الله بِكُلُ شَيىءٍ مُحيطاً ﴾ وە بۆ خوایە ئەو شتە لە ئاسمان و ئەو شتەی لە زەویدان بە ئادەمیزادو فریشتە و دێو و درنجەوە بە هەموو بونەوەرانەوەو، خوا هەر کەسێ لەوانە بە پاکی و پوختەیی خوا بپەرستێ ئەیکا بە دۆستی

خۆیو، خوا زانایە بە هەموو شتێ و پاداشت و تۆڵەی هەموو شتێ ئەداتەوە بە خاوەنەکانیان.

خوای مەزن بە شیرینترین جۆر نامەی پیرۆزی دارێژراوە، بەو جۆرەی باسی هەندێ لە فەرماندانی خۆی ئەکا، لە دواییدا باسی چەندین ئایەتی تر ئەکا لە بارەی موژدان و هەڕەشەکردن و هاندان و ترساندن، ناواخنیان ئەکا بە چەند ئایێتێ تر بەڵگەبن لەسەر فەرماندانی خۆی. ئەو شێوە دارِژاندنە باشتر کار ئەکاتە سەر دەرونی ئادەمیزاد بۆ وەرگرتنی فەرمانەکانی خوا، بۆیە ئەفەرموێ:

وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْوِلْدَانِ وَأَنْ تَقُومُوا لِلْيَتَامَىٰ بِالْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِهِ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ ﴾ وە داوائەکەن لە تۆ بۆ ڕون کردنەوە ئەو شتانە پەیوەندییان بە ژنانەوە هەیەو نەزانراون دەربارەی میراتبردنیان و مێردکردنیان و شتانی تریش. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی پێشوو لەبەر دوو هۆیە:

١- عەرەبەکان میراتیان بە ژنان و بە منالآن نەئەدا وەك لەمەوبەر باسکران. لە دواییدا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە و پێویستی کرد میراتدان بەوان.

٢- ئەگەر کچە هەتیوەیە لای خزمانی خۆی بوایە ئەگەر جوان بوایە ئەیان خواست بێ ئەوەی مارەیی بدەنێ و سامانەکەیشیان ئەخوارد ئەگەر سامانیان ببوایـە، ئەگـەر کچـەکان ناشرینیان بوایە، نەیان ئەدا بە مێرد هەتا ئەمردن و سامانەکەی بخۆن، بۆیە خوای فەرموی:

﴿ قُلِ اللهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَ ﴾ تۆ بلێ خوا ولاّمی ئەو پرسیارەی ئێوە ڕون ئەکاتەوە بـۆ ئێـوە لـە بارەی فەرماندانی بەشتێ پەیوەندی بە ژنانەوە هەیە. ئەو ڕستەیە. بەڵگەیە لـەسەر ئـەوەی کە یاسا دانان تەنها پەیوەندی بە خواوە هەیە. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەسەری پێویســت نـەکراوە یاسادانان و جگەی ڕاگەیاندنی یاسا. بۆ نموونـە زۆر جـاران پرسـیار لـە پێغەمـەر کـراوە وولاّمی نەدانەوەتەوە هەتا پەیام و سروشتی بۆ هاتوەتە خوارەوە.

﴿ وَما يُتْلى عَلَيْكُمْ في الكِتابِ ﴾ وەشتێ ئەخوێنرێتەوە بەسەر ئێوەدا لـە نامـەی خـوادا ڕونی کردوەتەوە کاروباری ژنان بۆتان.

﴿ في يَتامَى النّساءِ اللاتي لا تُؤتُونَهُنَ ما كُتِبَ لَهُنَ وَتَرْغَبُونَ أنْ تَنْكِحُوهُنَّ ﴾ لە بـارەی ئەو ژنە هەتیوانەوە ئێوە نابەخشن بەوان شتێ پێویســت کـراوە بـەوان بـدرێ لـە مـارەیی میرات، ئێوە ئەوان بە کالاّو بە ئاژەڵ دائیان ئەنێن و، ئێوە ئەتانەوێ کە ئەوان مـارە بکـەن لە خۆتان ئەگەر شۆخ بونایەو سامانەکانیان بخۆن.

﴿ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْوِلْدانِ وأنْ تَقُومُوا لِلْيَتامى بِالْقِسْطِ ﴾ وە خوا ڕونی کردۆتەوە وە فەرمانی خۆی لە بارەی ئەو منداڵە لاوازانەوە کە ئێوە بەشیان نادەن لە میراتاو، خوا ڕونـی کردۆتەوە کە ئێوە هەڵسن بە دادپەروەری لەگەڵ هەتیوان لـە خۆیانـا و لـە سامانیاندا و بەشی هەموویان بدەن بە تەواوی، ئیتر نێرین یا مێی، منداڵبن یا گەورە.

﴿ وَما تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإنَ اللهَ كانَ بِهِ عَليماً ﴾ وە ئەو شتەی ئێوە بیکەن لە چاکەکردن لـەگەڵ هەتیوان و منالاّن و دادپەروەری، دوایی بە ڕاستی ئەزانێ بەو شـتە ئێـوە بیکـەن و پاداشتتان ئەداتەوە بە گوێرەی خۆی:

پیاوێ بیانوی گرت بە ژنێکی پیری خۆی کە تەلاّقی بدا، ئەو ژنەیش خاوەنی منـاڵبوو، دڵی بۆیان ئەسوتا و بەوانەوە بەسترابوو. بە مێردەکەی ووت: تەلاّقم مەدەو بەشی خـەوتنی

خۆم ئەدەم بەو ژنەی خۆت ئارەزۆت هەبێ. مێردەکەی ووتی. ئەمەیان بۆ من زۆر چاکە. ئەوە لەلایێکەوە لەلایێ ترەوە کاتی وا ئەبێ ژنێ ناچیزە ئەبێ و بەدخوە ئەبێ. لە باسی مانای ئایەت (٣٤) ئەم سورەتە یاسای ئەو باسە ڕوون کراوەتەوە، وایش ئەبێ بەد خوویی لە پیاوانەوە ئەبێ، بە گوێرەی یاسا لەگەڵ ژنان هەڵناسن لەو کاتەدا ژنان ترس لە پیاوان پەیدا ئەکەن. خوای مەزن بۆ روون کردوەی یاسای ترسی ژنان ئەفەرموێت:

وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾

﴿ وإنْ إمْرَأة خافَتْ مِنْ بَعْلِها أوْ أعْراضاً ﴾ وە ئەگەر ژنێ ئەترساو چاوەڕووانی ئەکرد لە مێردەکەی ئازاری بدا بە لێدانی و بە خێونەکردنی و ڕوو گرژبون لە گەڵیدا یا ترسی

هەبوو ڕووی لێ وەربگێڕێ و وازی لێ بـهێنێ و گفتوگـۆی لەگـەڵ نەئـەکرد و لـەگـەڵی دانەئەنیشت، بە هۆی پیری و ناشرینی ژنەکەو ڕەوشتی نارەوای لەگەڵ ئەکرا یا ئـارەزۆی لە ژنێ تربوو، جگەی ئەوانیش.

﴿ فَلا جُناحَ عليهما أنْ يُصْلِحا بينهما صُلْحاً ﴾ دوایی هیچ گوناهێ لەسـەر ئـەو ژن و پیاوە نییە، ئەگەر ژنەکە ئەیزانی ناچیزەیی مێرد سەر ئەکێشێ بۆلای تەڵاقدانی، یـا وازی لێ ئەهێنێ نەئەوەبێ تەڵاقی بدا، نە ئەوەبێ وەکو ژن تەماشای بکا، لەو کاتەدا لە نێوان خۆیانا یا بەهۆی دوو کەسی تری ناوبژی کەریان کە ئاشتەوایی بخەنە نێوانیانەوە، بە جۆرێ ژنەکە وازبهێنێ لەهەموو مافی خۆی، بۆ ئەوەی بمێنێتەوە لـەژێر چـاودێریی مێردەکـەیدا و بژیـن بەیەکەوە بەبێ ئاژاوە، مێردەکەش بەڵێن بدا کە ئازاری ژنەکە نەداو لـەوەو دوا بـە باشـی بەخێویی بکا لە خواردەمەنی و بەرگدا. نەك لەگەڵ خەوتن.

﴿ وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ﴾ وە ئاشت بوونەوە چاکترە لە ئاژاوەو لە تەڵاقدان، یانـێ ئاشـتەوایی چاکە لە هەموو کاتێکا و مانای وا نیە ئاژاوەیش چاکە. بەڵکو ئاژاوە هەموو کاتێ خراپـە، ئاشتەوایی کاتێ دروستە ژنەکە خۆی پێی خۆش بێ ، ئەگـەر وانـەبو پێویسـتە پیاوەکـە یـا بەخێوی بکا و بژین پێکەوە بە گوێرەی یاسا یا تەڵاقی بدا بە گوێرەی ڕێکەوتنی نێوانیان.

﴿ وأحْضِرَتِ الأنْفُسُ الشّحَ ﴾ وە ئامادە کراوە هـەموو دەرونـێ بـۆ رژوی و بـەرچاو تەنگی و جوێی نابێتەوە لێی. یانێ ژن بە ئاسانی لە مافی خۆی دانابەزێ و چاوپۆشی ناکـا لە سامانی خۆی، پیاویش واز لە ژن نابەرێ و تـەڵاقی نـادا بـە خۆڕایـی. کەواتـە ئەگـەر هەردوولایان ملیان نەئەدا بە دەستەوە بە گورجی و چاوپۆشییان لە یەکتری نەئەکرد، ئـەو کارانە بۆ ئادەمیزاد شتێکی سروشتین ماندوبون بۆ ڕێك خستنیان زۆر گرانە، ئەگـەر ژن و پیاوێك پێك نەیەن. دوای ڕەوشتی سروشت بکەون. ئەو ڕستەیە بـۆ ئەوەیـە بیانوویـان لێ وەربگیرێ لە کاتی بگرەو بەردەی نەهێشتنی ئاژاوەو، هەروەك ڕستەی پێشوو هاندانیانە بۆ ئاشتەوایی.

﴿ وَإنْ تُحسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإنَّ اللهَ كانَ بِما تَعْمَلُونَ خَبِيراً ﴾ وەئەگەر ئێوەی پیاو ژن چاكـە بكەن لـەگەڵ یەكتری بە خۆشی و ئارام لـەسەر ئازارو نـاچیزەیی یـەكتری بگـرن و، ئێـوە خۆتان بپارێزن لـە ناچیزەیی و ڕو وەرچەرخان لـە یەكتری و خۆتان دووربخەنەوە لـە ئاژاوە، دووایی بە ڕاستی خوا ئاگادارە بەشتێ ئێوە بیكـەن لـە چاكـەو لـە ئـاژاوەو ئاشـتەوایی و ئەزانێ بەمەستتان. كەواتە پاداشتان ئەدرێتەوە لـەسەر نیازی خۆتان.

﴿ وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِساءِ وَلَوْ حرصتم ﴾ وە ئێوە نـاتوانن و لـە تواناتـاندا نی‌یە كە ئێوە دادپەروەری بكەن لـەنێو ژناندا ئەگەر ژنی زۆرتان هەبێ و مافیان بدەنـێ لـە هەموو ڕووپێكەوە بۆ ڕوون كردنەوەی مانای ئەو ڕستەیە ئەبێ بزانـین دادپـەروەری لـەنێو ژناندا لـەسەر دووبەشە:

١- هەیانە لـە توانای پیاودا هەیـە: وەك یەكسـانی لـەنێو ژنـاندا لـە بـەخێوكردنیان و خەوتن لـەگەڵیان بەشەودا، ئەو بەشەیان خوا داوای لـە پیـاوان ئـەكا بـە گوێـرەی یاسـای دیـاری كـراو پێویسـتە جێ‌بـەجێبكرێن، چونكـە لـەژێر توانـاداان. كەواتـە مەبەسـت لـە دادپەروەری لـە ئایەتی (٣)ی ئەم سورەتەدا ئەو بەشانەیە.

٢- هەیانە لـە توانای پیاودا نی‌یە وەك خۆشەویستی دەرون و ئاوڕ بۆلای یەكێ لـە ژنان بگرە چونە لایشیان، وائەبێ و لای هەموان ڕوونە ئارەزۆ لـە ژنێ پەیدا ئەبێ و بۆ ژنـێ تـر پەیدا نابێ، ئەو بەشەیان یاسا داوای ناكـا لـە پیـاوان، چونكـە لـە توانـایدا نیـە. كەواتـە مەبەست لـەو ئایەتە ئەم بەشەیانە، وەك فەرموی: وە بـا ئێـوە بتانـەوێ دادپـەروەری بكـەن لـەنێو ژنانداو خۆتانی بۆ ماندو بكەن، چونكە لـە توانای ئێوەدا نیە.

﴿ فَلا تَمِيلُوا كُلَّ المَيْلِ فَتَذَرُوها كالْمُتَلَقَةِ ﴾ دوایی ئێوە ڕوو مەكەن بـۆلای ئـەو ژنـەی خۆشتان ئەوێ بـە هـەموو ڕووكردنـێ، بـە جـۆرێ ڕووی دڵ و ڕووی كردەوەتـان كـۆ بكەنەوە بۆلای ئەو ژنە، ئەو ژنەكەی تر خۆشتان ناوێ بێ بەش بكەن لـە هەموو مافی خۆی و لـەگەڵ نەخەون بەبێ دەستوری خوا و بەخێویشی نەكەن، دوایی ئێوە واز لـە ژنەكەی تـر بهێنن خۆشتان ناوێ بە وێنەی كەسێ بەند كرابێ و یەسترابێتەوە، نە ئەوەیە تەلاق بـدرێ و مێردێ تر بكا، نە ئەوەیە وەك ژنی خاوەن مێرد مامەڵەی لـەگەڵ بكرێ.

﴿ وَإِنْ تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَأَنَّ اللهَ كانَ غَفُوراً رَحِيماً ﴾ وە ئەگەر ئێوە چاكە بكەن و ئاشتەوایی دابەزێنن، ئەو شتەی كردوتانە لەمەوبەر نەیكەن دووایی دادپەروەری بكەون و، خۆتان بپارێزن لە ناچیزەیی و ئەو كارە خراپەی كردوتانە و رێزی هیچ یەكێ لەژنەكانتان نەدەن بەسەری ئەویی تریانا لەو شتانەی لە توانای ئێوەدایە، دوایی بە ڕاستی خۆشبونی خوا بۆ ئێوە زۆرە بۆ ئەو ڕوكردنتانەتان بۆلای ئەو ژنەی خۆشتان ئەوێ و میهرەبانەو سزای ئێوە نادا بە واز هێنانتان لەوەی كروتانە لە بێدادی.

﴿ وَإِنْ يَتَفَرَّقا يغنِ اللهُ كُلاً مِنْ سَعَتِهِ وَكانَ اللهُ واسعاً حَكِيماً ﴾ وەئەگەر ئەو ژن و پیاوە لە یەك جوێ ببنەو بە تەڵاقدانی ژن لەسەر پارە یا بە خۆڕایی و مارەییەكەی بدرێتێ ئەگەر هەبیوو خوا هەموو كەسێ لە ژن و پیاو ساماندار ئەكاو پەكیان ناخا بە ڕۆزی دانی فراوانی خۆی ژنەكە مێردی چاكتر ئەكاو پیاوەكەیش ژنێكی چاكتر ئەهێنێ و، خوا میهرەبانی فراوان و زۆرە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاویی خۆیا دائەنێ لە فەرمانەكانیدا.

پیاوو ژن بەر لە هەموو شتێ ئەبێ هەوڵێ ئەوە بدەن ئاژاوەو ناكۆكی نابوت بكەن، چونكە ئاشتەوایی چاكترین شتە بۆ هەردوو لایان، ئەگەر ئاشتەواییان بۆ نەگونجا تەڵاقدان چاكترە بۆ نەهێشتنی ئاژاوەو بێدادی، دوایی گەورەیی بەخشندەیی خوا زۆرەو هەردوولایان ئەگرێتەوە بە یەكەوەبن یا جوێ ببنەوە، زۆر نزیكە وەك خوا ئەفەرموێ، كە ئەو ژنە مێردی چاكترو ئەو پیاوەیش ژنی چاكتریان دەست بكەوێ، چونكە میهرەبانی و گەورەیی خواو هەموو شتێ ئەگرێتەوە. خوای مەزن كە باسی ئەوانەی پێشووی بۆ كردین، بۆ دڵدانەوەی هەردوو لایەنی ژن و پیاو ئەفەرموێ:

وَلِلَّهِ مَا فِي
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ
مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ

مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدٗا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿١٣٤﴾

﴿ ولله ما فِي السَّماوات وَما في الأرْضِ ﴾ وە بۆ خوایە خاوەنێتی شتێ لە ئاسمانەکان و شتێ لە زەویدان. بە گوێرەی ویستی خۆی ئەیانبا بەرێوە. کەواتە بەو توانا گەورەیـە خـوا هەیەتی بەو هەموو سامانەی خوا لەئاسمانەکان و زەویدا دروستی کردووە بەو میهرەبانیـەوە هەیەتی ڕۆزی ئەدا بە ئێوە دوای بچڕانی ژن و مێردی لە نێوانتانا. خـوای مـەزن فـەرمانی داوە بە خاوەن نامەکان و بەوانیش بەر لەوان بوون، فەرمان ئەدا بە ئێوەی موسڵمانیش بۆ خۆپاراستن لە خواو ئامۆژگاری هەموو لایەکتان ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ وَصَّيْنا الذينَ أوتُوا الكِتابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَإياكُمْ أنِ اتقُوا الله ﴾ وە بە ڕاستی ئێمـە ڕامان سـپاردووەو ئامۆژگـاری کەسـانێکی ئـەوتۆمان کـردوە لـە پێش ئێـوەوە بـوون و ئامۆژگاری ئێوەمان کردووە کە ئێوە هەموو لایەکتان لە خوا بترسن و هاوبەشی بۆ دانەنێن لە پەرستندا، خۆتان لەبێ فەرمانی خوا بپارێزن.

﴿ وَإنْ تَكْفُرُوا فَانَّ لله ما فِي السَّماوتِ وَما في الأرْضِ وَكانَ الله غَنِياً حَمِيداً ﴾ وەئەگەر ئێوە بە هەمووتانەوە باوەڕ نـەهێنن بـە خـواو ئـایینی ئیسـلام، دوایـی بـۆ خوایـە شـتێ لـە ئاسمانەکان و لە زەویدان بـە فریشـتە و بـە ئەسـتێرەکانەوە بـە جنۆکـە و بـە ئـادەمیزاد و بەبوونەوەرانی ترەوەو.

خوا بێ نیازە لە ئێوەو پێویستی بە ئێوە نیە، فەرمانبەرداری ئەوبن یانە، ئێوە هیچ سودێ بە خوا ناگەیەنن، خوا خۆی لە خۆیا خاوەنی سوپاسە، ئێوە سوپاسی بکەن یانە؟

﴿ وَللهِ ما في السَّماواتِ وَما في الأَرْضِ وَكَفى بالله وَكِيلاً ﴾ وەبۆ خوایە شتێ لە ئاسمەنەکاندان و شتێ لە زەویدایە، هەڵیان ئەسوڕێنێ و ئەیانبا بە ڕێوە، بە هاوردن و بونیانەوە لە نەبوونەوە، بە مردنیان و بە زیندو کردنەوەیان و، بەسە خوا بۆ پشتیوانی و کارپێ سپاردن. کەواتە هەر خوا بکەن بۆ خۆتان بە پشتیوان.

﴿ إنْ يَشَأْيُذْهِبْكُمْ أَيُها النّاسُ وَيأتِ بِخَلْقٍ آخَرِينَ وَكانَ اللهُ عَلى ذلكَ قَدِيراً ﴾ ئەگەر خوا ئارەزووی هەبێ ئێوە لە ناو ئەبا ئەی ئادەمیزادو، ئەهێنێ و دروست ئەکا کۆمەڵێ تر جگەی ئێوەو لە جێگەی ئێوە دایان ئەنێ و یاریدەی پێغەمەر ئەدەن و پشتی ئەگرن بۆ چەسپاندنی یاسای قورئان و، خوا توانای هەیە بەسەر لابردنی ئێوەداو دروست کردنی تاقمێ ترو بێ فەرمانی خوا نەکەن.

پرسیار/ لە باسی مانای ئایەتی (٢٦) ئەم سورەتەدا باسی دووپات کردنەوەی هەندێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا کرا. لێرەدا باسی هۆی دووپات کردنەوەی ڕستەی (وَللهِ ما في السَّماواتِ وَما في الأَرْضِ) ئەکەین لە زۆرترین ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا بە گشتی و بە تایبەتی دووپات کردنەوەی لە ئایەتی (١٣١) و لە ئایەتی (١٣٢) سێ جار یەك لە دووای یەك دووپات کراوەتەوە، ئەبێ هۆکانیان چ شتێ بێ؟

وەڵام/ هۆی دووپات کردنەوەی ئەو ڕستەیە ئەمەیە بە گشتی: خاوەنێتی خوا بۆ هەموو بونەوەران لە ئاسمانەکان و لە زەویی و ئەو شتانەی لەناو ئەواندان ئەمەمان پیشان ئەدا کە خوا خاوەنی زانایی و توانای خویەتی و دانانی هەموو شتێکە لە جێگەی شیاوی خۆیانا کە ئەوانە بەڵگەی بێگومانن لەسەر بوونی خوا، لەهەموو ڕوێکەوە، بەڵگەیشن لەسەر گەورەیی بێ هاوتایی خوا.

دووپات کردنەوەی ئەو ڕستەیە سێ جار لەو دوو ئایەتانەدا دوا بەدوای یەك بۆ پیشاندامانە بۆ سێ سوود:

١- کە خوای مەزن لە ئایەتی پێشوودا فەرموی: (مَايُغْنِ اللهُ كُلاً مِنْ سَعَتِهِ) خوا ڕۆزی هەمو یەکێ لەوان ئەدا بە ڕۆزی فراوانی خۆی. دوایی بۆ جێگیرکردنی ناوەڕۆکی ئەو فەرمودەیە خوا ئەفەرموێ. بۆ خوایە ئەو شتەی لە ئاسمانەکاندان و ئەو شتەی لە زەویدان. ئیتر چۆنپەکی ئێوە ئەخاو بەخێوتان ناکا؟

٢- کە خوای فەرموی: (وَإِنْ تَكْفُرُوا) وە ئەگەر ئێوە باوەڕ نەیەرن بۆ ڕاستی و بێگومانی مەبەست لەو فەرمودەیە، خوا فەرموی: ئەو شتانە لە ئاسمانەکان و زەویدان بۆ خوان، ئیتر پێویستی بە ئێوە نیە باوەڕ بهێنن یانە؟ ئێوە سودو زییان بە خوا ناگەیەنن.

٣- کە خوا فەرموی بۆ جاری سێهەم: (وَللهِ ما في السَّماواتِ وَما في الأرْضِ) وە بۆ خوایە ئەو شتەی لە ئاسماکاندان و ئەو شتەی لە زەویدان. بۆئەوەیە مەبەست لە ناوەڕۆکی ڕستەی دوایی باشتر جێگەی خۆی بگرێ لە دەروندا کە ئەفەرموێ (إنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أيُها النّاسُ وَيأتِ بِخَلْقٍ أخَرينَ) ئەگەر ئارەزۆ بکا لەناو ئەبا ئێو ئەی ئادەمیزادو، خوا تاقمێ تر ئەهێنێ و لە جێگەی ئێوە دائەنێ بۆ پەرستنی خۆی، هەتا ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیە بە هۆی ڕستەی پێش خۆێوە باشترو مسۆگەرتر جێگەی خۆی بگرێ لای ئادەمیزادا هەتا بترسن و باوەڕبهێنن و یاریدەی پێغەمەر بدەن، ئەگەر ئەوان بەو مەبەستە هەڵنەسن نەتەوەیە تر دروست ئەکا پاش بنەبڕکردنی ئەوان بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە. کەواتە هەموویەکێ لەو ڕستانە کە دووپات ئەکرێنەوە لە هەموو شوێنەکانی قورئاندا بە گشتی و لەو سێ جێگانەدا بە تایبەتی هەریەکەیان هۆێکی تایبەتی و پێویست و سودێکی تازەیان هەیەو لەیەك جیاوازن.

﴿ مَنْ كانَ يُريدُ ثَوابَ الدُّنْيا فَعِنْدَ اللهِ ثَوابُ الدُّنْيا والأخِرَةِ وكانَ اللهُ سَميعاً بَصِيراً ﴾
هەرکەسێ مەبەستی بێ بەو کارەی ئەیکا لە جەنگ کردندا پاداشتی جیهان بە دەست بهێنێ وەك تالان و سودی ئەمڕۆ، یا بۆ بە دەست هێنانی پلەو پایەو شۆرەت دەرکردن، داواکاری ئەو کەسە پەست و بێ نرخە و بێ مانەوەیە، دوایی لەلای خوا هەیە پاداشتی

جیهان و پاشە ڕۆژ نایشبڕێنەوە، لەلای خوا دەست کەوتنی پاداشتی هەردوو لایەنیان مسۆگەرە بە مەرجێ خاوەنی باوەڕ بێ و خۆی بپارێزێ لەبێ فەرمانی لەبەر خوا، ئەو کەسە گومانی وابێ پاداشتی ئەمڕۆو پاشە ڕۆژ کۆنابنەوە سەری داوە لەبەرد، ئەو شتەی بەختیاری ئەمڕۆی تێدابێ ئایین برِیاری لەسەردابێ و هانیشی بۆ بدرێ دژایێتی لەنێو ئەوەدا و لە نێو پاشەڕۆژدا نیە. بەڵکو دژایێتی لە نێوان پاداشتی پاشە ڕۆژو لە نێو ستەم و فێڵ و دزی تالان و خراپەکانی تردا هەیە.

خوای مەزن لەمەوپێش باسی ژنان و ناچیزەیی و ئاشت کردنەوەی نێوان ژن و مێردی بۆ کردین، لەمەودوا باسی بەجێ هێنانی باوەڕو فەرمانەکانی خوامان بۆ ئەکا. بە کورتی پێمان نیشان ئەدا ئەگەر ئێمە خەریکی پەیدا کردنی ئارەزومەندی خۆمانبین، ئەو کاتە خۆمان بۆ خۆمانین و پەیوەندیمان بە خواوە نیە. ئەگەر خەریکی بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خوا بین لەو کاتەدا ئێمە بۆ خواین نەك بۆ خۆمان، ئەمەیان بەڕێزترین و گەورەترین پلەو پایەن. خوا بۆیشمان ڕون ئەکاتەوە بەختیاری ئادەمیزاد لەوەدایە گفتوگۆو کردارو جوڵان و دانیشتن و دارایی خۆی لە ڕێگەی خوادابێ، بۆ چەسپاندنی ئەو مەبەستانە خوا ئەفەرمویێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ

عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾

﴿ يا أيها الذينَ آمَنوا كُونُوا قَوّمِينَ بِالْقِسْطِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتـان هێنـاوە ئێوە ڕاوەستاو بەردەوامبن لەسەر دادپەروەری، خۆتانی بۆ ماندو بکـەن هـەتا بـەو بۆنـەوە دەستورو دادپەروەری ڕاوەستاوبێ لەنێو بونەوەراندا.

﴿ شُهَداءَ وَلَوْ عَلى أنْفُسِكُمْ وَالْوالِدَيْـنَ والأقْرِبيْـنَ ﴾ ئێـوە ڕاوەسـتاوو بـەردەوامن لـە شایێتی دانتان لەبەر ڕەزامەندی خواو بەبێ درۆو، با ئەو شایێتی دانە لەسـەر خۆتانبـێ و بـە ڕاستی ئەو شتەی لەسەرتانە بیڵێن و، با لەسەر باوك و دایك و لەسـەر خزمـەکانبێ، ئیتر بابێتە هۆی زیانی لەش و داراییتان. ئەبێ لـەبیرمانبێ شـاییتی دانـی بـاوك و دایـك و بـۆ سودی منالّی خۆیان دروست نیە، هەروەك شایێتی دانی منالّ بۆ باوك و دایك دروست نیە، دوایی خوا چاکترە بۆ پاراستنی سامان و هەژاری لە ئێوە.

﴿ إنْ يَكُنْ فقيراً أوْ غَنِياً واللهُ أولى بِها ﴾ ئەگەر شایێتی لەسەردارو یا هـەموو یـەکێ لـە شایێتی لەسەردارو شایێتی بۆ دراو ساماندار بۆیا هەژار ئێوە خۆتان مـەگرن بـۆ ڕاوەسـتانی شایێتی دانتان بەزەییتان بۆ هیچ لایێکییان دەرمەبڕن و لایەنی هیچ کامیان مەگرن.

ئایینی ئیسلام بەڕاستی لە هەموو کاتێکا پێویستە هەر ئەو فەرمان ڕەوابێبەسەر خۆمـان و بەسەر باوك و دایك و خزمانماندا، خۆمان و خزمانمان لە ئاستی ئاییندا خـاوەنی خۆمـان نین، هەرکاتێ سودی تایبەتی خۆمان لەگەڵ ئاییندا لە دژی یەکتری بـوون پێویسـتە ئـایین هەڵبژێرین و واز لە سودی خۆمان بهێنین، ئیتر باسەرکێشی بـۆلای لـەناوچونی خۆمـان و داراییمان.

هەرکەسێ بەراوردی ئەو فەرمودەی قورئان بکا لەگەڵ کردەوەی خۆیا بەوە کۆتای پێ دێ کە ئێمە سوودی تایبەتی خۆمان و خزمانمان هەڵبژاردوەو ڕێزمانداوە بەسەر ئاییندا، ئەگەر ئێمە بە باشی بۆی داچین و وردی بکەینەوە بڕیار ئەدەین کە سەرچاوەی ئاواتمان لە ئاییندا هەر بۆ سوودی خۆمانە بە تەنها. نەك ئاواتمان فەرمانی نامەی خواو فەرمودەو کرداری پێغەمەربن، بەگوێرەی تاقی کردنەوە ناوەڕۆکی دەرونی ئێمەو زۆربەی ئادەمیزاد بۆمان ئەسەلمێنن، بەڵام یا هەستی پێ ناکەین، یا خۆمانی لێ گێل ئەکەین. منایێتی و خزمایێتی سوواری ئەقڵمان بووە و کوێری کردووین لە ئاستی ڕاستی و خستوویێتە دەرونمان ئایین سودی تایبەتی ئەمڕۆیە بە تەنها. کەواتە ئەبێ بزانین هەوەس و دەرونی خۆمان گەورە ترین دوژمنە بۆمان و ئەبێ ئاگاداری خۆمان بین لە ڕاستی لانەدەین.

هەموو یەکێ لە ئادەمیزاد ئامادەیی تێدایە بۆ وەرگرتنی چاکەو خراپە، لەهەمان کاتا بە گوێرەی سروشت ئارەزۆی لە چاکەیە نەك لە خراپە، ئەگەر خۆی بۆ خۆی وازلێ بهێنرێ جگە لە چاکە هیچ شتێ تر ناکاو لە چاکە لانادا لەبەر هۆیێکی دەرەکی نەبێ لە خۆی کە دژی سروشتە ئەگەر کەسێ سەرپشك بکرێ لە نێوان ووتنی ڕاستی و بەخشینی دیناریێ یا درۆیە بکاو دیناریێ وەربگرێ و پشزانێ لە هیچیانا توشی زێیان نابێ بێگومان ڕاستە کە هەڵئەبێژێرێ و دینارەکە ئەبەخشێ. کەواتە ئادەمیزادێ ژیر هەرگیز درۆناکا لەبەر هۆیێ نەبێ وەك ترسان و چاوچنۆکی، یا خۆشەویستی خزمایێتی یا بۆ زێیانی دوژمنایێتی، یا بەزەیی بە هەژاراندا، یا دڵخۆشکردنی ساماندااران و چەند شتی تر، خوا قەدەغەی کردووە واز لە شایێتی دان بهێنرێ لە ئەوانەی باسکران، پێویستە شایێتی دان هەر لەبەر خوابێ بە تەنها و لەبەرهیچ شتی تر نەبێ ئەو ئایەتە هەرچەندە هاتۆتە خوارەوە دەربارەی شایێتی دان و دەربارەی سامانداریێك و هەژارێ چوونە خزمەت پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوانیان. بەڵام ئەبێ لە هەموو کات و لە هەموو جێگەیە هەر ڕاستی ببێژرێ و دادپەروەری پەیڕەوی بکرێ لەگەڵ دوژمنانیشدا.

﴿ فَلا تَتَبِعُوا الْهَوى أنْ تَعْدِلُوا ﴾ دوایی ئێوە دوای ئارەزۆی نارەوا مەکەن بۆ ئەوەی لادەن لە ڕاستی و دادپەروەریتان پێ ناخۆشبێ. بەواز هێنانتان لە ئارەزۆی نارەوا ئێوە ئەگەرێن لە خاوەن دادپەروەران.

﴿ وَإنْ تَلْوا أوْتُعْرِضُوا فَأنَّ اللهَ كانَ بِما تَعْمَلُونَ خَبيراً ﴾ وەئەگەر ئێوە زمانتان پێچ بدەن و منجە منج بکەن لە شایێتی دانداو دوای بخەن و تەمەڵی بکەن، یاواز لە شایێتی دان بهێنن و دای پۆشن و جێبەجێی نەکەن لە شوێنی خۆیدا، و دوایی بە ڕاستی خوا بەو شتەی ئێوە ئەیکەن ئاگادارە لە دادپەروەری و لەلادانتان لە ڕاستی، بێگومان پاداشت و تۆڵەیان وەرئەگرن.

بۆ ئاگاداری: من بۆخۆم وا هەست ئەکەم و هەرکەسێ ئەبینم هەروەك من وایە کە لەو کاتانەدا ئایەتێ لە قورئانی پیرۆز ئەبینرێ یا ئەخوێنرێتەوە پەیوەندی بە کردنی فەرمانی خواوە هەبێ وا هەست ئەکەین جیاوازی و دوراێتێکی یەکجار هەیە لە نێوان ئەو دەستورەدا خوا دیاری کردوە لەنامەی خۆیا بۆمان لەگەڵ ئەو ئایینەدا خۆمان بەکاری ئەهێنین لە ڕەوشت و کردەوەمانا. لەو هەوەسەی ئێمەوە وا دەرئەکەوێ لێمانەوە کە ئایینی خوا هەر بۆ خوێتی، ئەو ئایینە ئێمە بەرکاری ئەهێنن جیاوازە لەو ئایینەی خوا ناردوێتی، ئیتر هەستی پێ بکەین یانە؟ئادەمیزاد بەدادپەروەری هەڵنەساوە بەڕاستی هەتا دادپەروەری جێگەی‌خۆی نەگرێ و ئادەمیزاد بیرونیازی خۆی ڕون نەکاتەوە بە باوەڕهێنانی بێ گەردو پوختە بەو شتانەی خوا فەرمانی پێداون. ئادەمیزاد چەندین بەشن: هەیانە بڕوای بە دروست کەری بونەوەران هەیە کە خوایێکی تەنهایەو بڕوای بە پێغەمەرایێتی و نامە ئاسمانیەکان نیە. هەیانە باوەڕی بە هەندێ لە پێغەمەران هەیەو باوەڕی بە هەندێکیان نییەو هەیانە بڕوای بە هەندێ لە نامەکانی خوا هەیەو بڕوای بە هەندێکیان نیە. هەیانە بڕوای بە بوونی فریشتەکان و ڕۆژی دووایی نیە ئەم ئایەتەی دوایی بۆمان ڕون ئەکاتەوە چۆنێتی باوەڕهێنانی ڕاستی و ئەو شتانەی پێویستە باوەڕمان پێیان هەبێ بەبێ جیاوازی و بە تەواوی و ئەفەرموێ:

﴿ يا أيُّها الّذِيْنَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللهِ وَرَسُولِهِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕتـان هێنـاوە لـە موسڵمانان ئێوە باوەڕبهێنن بە خواو دامەزراوبن لـەسەری و لـە ناخی دڵتانەوە دەرچێ نـەك بە دەمی ڕووت و، باوەڕ بە نێرراویی خوا بهێنن و بەردەوامبن لەســەر بـە ڕاستی و بـەبێ خەوش و گەرد.

﴿ والْكِتابِ الذي نَزَّلَ عَلَى رسُولِهِ وَالْكِتابَ الذي أنْزَلَ مِنْ قَبْلُ ﴾ وە باوەڕبــهێنن بـەو نامەیە خوا ناردێیتە خوارەوە بۆ سەر نێرراویی خۆی کە موحەمــەدو کـاری پـێ بکـەن بـە تەواویی و، باوەڕبهێنن بە نامێیکی ئەوەتۆ خوا ڕەوانەی کردووە لە پێش قورئانەوە بۆســەر پێغەمـەرانی تـر. ئـەو ڕستانەی پێشـوو بۆمـان ڕون ئەکاتـەوە ئـەو کەسـانە وازیـان لـە هاوبەشدانان بۆ خوا هێناوە وازیشیان لە بێ خوایی هێناوە پێویستە باوەڕیشیان بەوانە هەبێ باسکران بەبێ جیاوازی. بۆ چەسپاندنی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الأخِرِ فَقْد ضَلَّ ضَلالاً بَعِيــداً ﴾ وەهـەر کەسـێ باوەڕی نەهێنابێ بە خواو بە فریشتەکانی و بە فروستادەکانی خواو بـە ڕۆژی دوایـی بـەبێ جیاوازی دوایی بە ڕاستی ئەو کەسە لایـداوە لـە ڕێگـەی ڕاسـت و مەبەسـتی پوختـە بـە لادانێکی دوورودرێژی بێ‌کۆتایی. ئەو ئایەتــە پـیرۆزە بەڵگـەی ڕوونـە لەسـەر ئـەوەی کـە باوەڕهێنان بەو شتانەی لەبەر چاونین و لـە بنچینەکانی پایەی ئیسلامن هەر کەسـێ بـڕوای بەوان نەبێ بە ڕاستی بە موسڵمان ناژمێررێ.

ئادەمیزاد هەیانە باوەڕ ئەهێنن بە ئاینێ لـە ئایینەکان، یا بە بیروباوەڕێ لـە بیروباوەڕێ تـر بە توندی لایەنیان ئەگرن و خەباتی بۆ ئەکەن بۆ فیداکاریەوە پێوەکـاری بـۆ ئەکـەن. وەك بینراوەو ئەبیسترێ لە هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕانەوە، دوایش لـەو ڕێگەیە خۆیان ئەکـەن بـە قوربانی، کەچی لـە پاش ماوەیــەو دوای لێ کۆڵینـەوەیان دڵیـان ئەتەکێتـەوەو بڕیـاری بـە هەڵەچوونی ئەو بیروباوەڕە ئەدا، خۆی ئەخاتە پاڵ زانایانی پیاوچاکان کە لەپێشا دوژمنیـان بوو باوەڕ بە ئاینێ ئەهێنێ و ئەبێت بـەدوژمنی ئایینـە پێشـوەکەی خـۆی زۆر بـە نـاقۆڵایی ئەزانێ. کەواتە لـەسەر ئەو زاناو پیاو چاکانە پێویستە بە گەرمی پێـش وازیـان لێ بکـەن و

وەریان بگرن و نابێ هیچ کەس تانەیان لێ بدا لەسەر کارو کردەوەی جارانیان، دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاستیان دۆزیوەتەوە. بەڵکو پێویستە ڕێزی تەواویان لێ بگیرێ و چاکەیان باس بکرێ، چونکە گەڕانەوە لە هەڵە ئەوپەڕی گەورەیی و ڕێزە، هەروەك بەردەوام بوون لەسەر پەرستنی شتێ بێ نرخ پەستیە.

ئادەمیزاد هەیشیانە بێ باوەڕن و لەسەر ڕەنگێ ناوەستن، هەرڕۆژە لەسەر بیرو باوەڕێکن، لەملا ئەچن بۆ ئەولا، زۆری پێناچێ ئەچنەوە بۆلای بیروباوەڕە کۆنەکەی، دووبارە جارێ تر ئەچێتەوە بۆلایەتر، هەروەها بۆ چەند جارێ، ئەو کەسانە ئەوانەن بێ بارن و هەرچی و پەرچین جێگەی متمانەنین. خوای مەزن لە باسیانا ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾

﴿ إنَ الذيْنَ أمَنُوا ثُمّ كَفَرُوا ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەتۆ باوەڕیان هێنابوو لە جولەکەکان لە پاشا بێ باوەڕبوونەوە بەهۆی پەرستنی گوێرەکەوە.

﴿ ثُمَ أمنُوا ثُمَ كَفَرُوا ﴾ لە پاشا باوەڕیان هێناوە بە خواو بە موساو پەشیمان بوونەوە، لە پاشا بێ باوەڕبوونەوە بە عیسا و بە ئینجیل و نیازی کوشتنی عیسایشیان کرد.

﴿ ثُمَ أزْدادُوا كُفْراً ﴾ لە پاشا زۆرتر ئەكەن بێ باوەڕی خۆیان بە باوەڕ نەهێنانیان بە موحەمەدو بە قورئان و چاویی پیسیان بڕیوەتە پێغەمەرو ئاواتی نەمانی ئەخوازن:

﴿ لَمْ يَكُنْ اللهُ ليغفر لَهُمْ وَلا لِيَهْدِيهُمْ سَبيلاً ﴾ خوا لەو كەسانە خۆش نابێ هەتا بەردەوامبن لەسەر بێ باوەڕی خۆیان و، خوا ڕانموییان ناكا بۆلای ڕێگەی ڕزگاربونیان، چونكە بە گوێرەی زانیاری بێ وێنەی خوا ئەو كەسانە دورن لەوە پەشیمان ببنەوەو لەسەر باوەڕ بوەستن و دڵیان بەبێ باوەڕی مۆركراوەو چاویان كوێر بووە لە ئاستی ڕاستی. كەواتە مانای وانیە ئەگەر بە پوختەیی باوەڕبهێنن باوەڕیان لێ وەرناگیرێ و خوا لەوان خۆش نابێ، ئەو كەسانە بە ویستی خۆیان ڕێگەی ڕاستیان لە كیس خۆیانداوە.

بۆ زانین: ئەگەر بێ باوەڕی پێش باوەڕهێنان كەوت و خۆی وون كرد كە باوەڕهێنان هاتە كایەوە تۆڵەی بێ باوەڕی نابینرێ، ئەو كەسەی ڕوناكی باوەڕی بە خۆیەوە بینی بیانوی لێ وەرئەگیرێ بۆ كارە خراپەكانی ڕابردووی. بەڵام ئەگەر بێ باوەڕی لە پاش باوەڕهێنان جار لە دووای جار بە گوناهێكی زۆر گەورە دائەنرێ لێ خۆشبوونی بۆ نابێ و بیانویشی لێ وەرناگیرێ... بە كورتی خاوەن باوەڕ ئەو كەسانەن لەسە باوەڕی خۆیان بەردەوامبن و گۆڕانی بەسەردا نەهاتبێ لە هەموو كات و جێگەیەكدا بە هەر شێوەبن، ئەو كەسانە لە باوەڕ وەرئەگەڕێن جار لە دوای جار زۆر خرابترن لەو كەسانە هەر باوەڕیان نەهێنابێ بگرە لەو كەسانەیش خرابترن بێ خوان و بڕوایان هەر بە بوونی خوا نیە.

خوای مەزن باسی ئەو كەسانەی كرد لەسەر بارێ نین و جار بە جار ئەگۆڕێن و دوڕون باسی ئەمەیشمان بۆ ئەكا جۆری سزادانیان چۆن ئەبێ، ئەوانەیش ئەو كەسانەن بێ باوەڕان ئەكەن بە دۆستی خۆیان و ئەفەرموێ:

﴿ بَشِّرِ الْمُنافِقِينَ بِأنَ لَهُمْ عَذاباً أليماً ﴾ تۆ موژدە بدە بەو كەسانەی دوو ڕوون كە بە ڕاستی بۆ ئەوان هەیە سزایێكی ئازار پەیداكەرو خاوەن ئازار.

﴿ الذينَ يَتخِذُونَ الْكـافِرِينَ أوْلِيـاءَ مِـنْ دُونِ الْمُؤمِنِـين ﴾ ئەو دوو ڕوانە كەسانێكی ئەوتۆن بێ باوەڕان وەرئەگرن بە دۆستی خۆیان لە جگەی باوەڕداران و داوای یارمەتیان لێ ئەكەن و واز لە باوەڕدارانی دڵپاك ئەهێنن و نایان كەن بە دۆستی خۆیان.

﴿ أيبتغون عِنْدَهُمْ الْعِزَّةَ فَإنَّ العِزَّةَ لله جَميعاً ﴾ ئایا ئەو دوو ڕوانە داوا ئەکەن کە لای ئەوان پەیدابێ بەو دۆستایێتیە گەورەیی و هێزیان دەست بکەوێ و بە گومانی خۆیان و وا ئەزانن ئەو کارەی موحەممەد تەواونابێ، دوایی بە ڕاستی گەورەیی و توانا بۆ خوایە هەموویان بە گشتی خوا هەر بە دۆستانی خۆی هێز ئەبەخشێ، دووڕووان دڵیان مۆرکراوە لە هیچ شتێ وردنابنەوە.

هەموو کەسێ پێی خۆشەو ئەیەوێ ناو دەربکا لە جیهاندا بە پیاو چاکی و بە تێگەیشتوویی و بە زانیاری و بە ئازایی لە هەر ڕێکەوە بۆیان بگونجێ و ڕێك بکەوێ لەگەڵ یاسای ئیسلام. بەڵام هەندێ تر لە ئادەمیزاد هەن داوای سەرکەوتن و سەربەرزی و ناودەکردن ئەکەن لە شەیتان و لە کاربەدەستانی ستەمکارو خۆیانیان پێ ئەفرشن و ئەیان کەن بە دۆستی خۆیان و هەر شتێکیان پێ بلێن بۆیان ئەکەن، ئایا ئەو کەسانە چۆن بە ڕەوای دائەنێن داوای هێز لە جگەی خوا بکەن؟ بۆ ناودەکردن و پەیڕەویی ستەمکاران خۆیان توشی کێجەڵوکەی دوو ڕویی بکەن، ئەبێ بزانن هێزو سەرکەوتن هەر بە باوەڕهێنانی پوختە دەست ئەکەوێ بە تەنها.

ئەو باوەڕدارانەی ئەو تۆ خوا باسی کردون لە فەرمودەی خۆیا (مِنْ دُونِ الْمُؤمِنِين) ئەو باوەڕدارانەن ئیسلام بە هۆی ئەوانەوە سەرکەوتن و گەورەییان بە دەست هێناو ووشەی ئیسلامیان بەرز کردەوە بە کۆشش و فیداکاری خۆیانەوە، هەموو ئایین و بیروباوەڕی تریان پرش و بڵاوکرد، بە یاریدەی خوا شاگردەکانیشیان لەم سەردەمەی ئێمەدا بە توانای هێزی پۆڵایینی باوەڕداران لەناوئەچن. کەواتە چۆن ئەبێ داوای هێزو سەرکەوتن لە بێ باوەڕان و ستەمکاران و دوو ڕووان بکرێ، ئەوانەی باسکران لەهەر کەسێکا بینران بێگومان لە بازنەی باوەڕ دەرچوون.

هەروەك داواکردنی گەورەیی لە بێ باوەڕان و دۆستایێتییان قەدەغەیە، خۆ هەڵکێشان و خۆ بە گەورە دانان بە هۆی باوکو بێ باوەڕەکانەوە قەدەغەیە، وا دابنێ لە نێوان ئەو

کەسانەدا باوەڕدارن و لەنێوان بێ باوەڕاندا پەیوەندی ڕەگەزو خزمایێتیان ماوەتەوە دوای باوەڕی ئیسلام، وەك خۆ هەڵکێشان بە فیرعەونەکان و کیسراکان و قەیسەرەکان و ئاشوری و بابولی و عەرەبەکانی پێش ئیسلامەوە. پێشەوا ئەحمەد لە حوسینی کوڕی موحەممەدەوە لە ئەبوو بەکری کوڕی عەباسەوە لە حومەیدی کەندییەوە لە عوبادەی کوڕی قەیسەوە لە ئەبی ڕیحانەوە لە پێغەمەرەوە ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ:

ئەو کەسەی خۆی پاڵ بدا بە (٩) و باوکی بێ باوەڕەوە مەبەستی خۆ هەڵکێشان و ڕێزبێ ئەو کەسە (١٠)ە هەمیانە و لە ئاگردان.

لەو باسانەوە بۆمان دەرئەکەوێ دوو ڕووی سەوز ئەبێ و بنج دائەکوتێ بە هۆی لاوازیە بڕوانە بوونی مرۆڤ بە خۆێتی خۆی لە بەرانبەر ڕاستی و باوەڕ بەخوا، بەرهەمی ئەو لاوازیە بریتیە لە ترس و چاوچنۆکی و خۆ هەڵواسین بە جگەی خوای مەزنەوەو بە خۆبەستنەوە بە نیشتمانەوە بە جۆرێکی نارەواو ڕەگەز پەرستی و دوور کەوتنەوە لە پەیڕەویی خوا لە ژیانداو بەکار نەهێنانی لە فەرمانی ڕۆژانەدا. بەرگری لە ناموس و سامان و نیشتمان بە جۆرێکی ڕەوا لە پەرستنی خواوە دەرئەچێ و دێت.

ئەو دۆستایەتی‌یەی بێ باوەڕان خوا قەدەغەی کردووە بریتیە لە یارمەتی دانی یەکتری و بن بە هاوپەیمانیان، دۆستایێتی لێرەدا ئەوە نیە پەیڕەویی ئایینەکەیان بکەوێ ئەگەر وابێ ئەوە بێ باوەڕی تەواوە پێی ناوترێ دۆستایێتی، پەیڕەو کردنی ئایینی بێباوەڕان یەکەمجار زۆر گرانە لای موسڵمانان. هەندێ کەس وایان داناوە دۆستایێتی بریتیە لە تێکەڵاوبوونی باوەڕداران و بێ باوەڕان بۆ سودی یەکتری و بازرگانی. بە تایبەتی بەستنی پەیمانی زانین و زانیاری و ڕۆشنبیریی، ئەوانە ئەگەر دژی یاسای ئیسلام نەبێ خراپەی تێدانیە.

بەڕاستی چاوپۆشی ئیسلام لەگەڵ بێ باوەڕاندا زۆر ڕوون ئاشکرایە، بەڵام هەندێ لە موسڵمانانی نەفام و کاربەدەستان چاك و خراپ تێکەڵاو ئەکەن. ئەو کەسانە ڕاستی و ناوەڕۆکی ئاین لە دەرونیانانە چەسپاوە بەو جۆرەی وا بزانن یاسایێکی چەسپاوە لەلایەن

خوای مەزنەوە، ئەو کەسانە خۆیانیان گێل و گەوج کردوە لە ئاستی یاسای ڕونی قورئـان بانگەوازی ئیسلامیان لێ تێك چووە لە بارەی چاو پۆشـی کـردن لەگـەڵ بێ بـاوەڕانداو جوێی ناکەنەوە لەگەڵ نیازی خراپـی خۆیـاندا، نـازانن بـێ بـاوەڕان هـەندێکیان دۆسـتی هەندێکیان لـە کاتی جەنگ کردن لەگەڵ کۆمەڵێ ئیسلامدا ئەو کەسانە خاوەنی بـیروڕای ڕاستی نین بۆیە ئەم سەرو ئەو سەر ئەکـەن، لەسـەر بـارێ ناوەسـتن، ئـەو جـۆرە کەسـانە پێویستە تف و نەفرەتیان لێ بکرێ و بە هیچ جۆرێ بڕوایان پێ نەکرێ و سزایشیان بـدرێ بە توندی و تیژی و بکرێن بە نموونەی پیاو خراپان، ئەو بێ بارییە ڕەوشتی زوربەی خـاوەن بیروباوەڕە خراپەکانی ئیستان، پارەو پول لەهـەر لایەکـەوە دەسـتیان بکـەوێ ئـەو لایەنـە ئەپەرستن، بە تایبەتی خاوەن ڕامیاریەکان لە کۆن و لە تازەدا ئەو ڕەوشتە پەرسـتەیان هەیـە کەس ناکەن بە دۆستی خۆیان، ئەو کەسانە جگە لەوە فێڵ بازو بوختـان چـی و درۆزنـن هیچ شتێ تریان بۆ ڕەوا مەبینن، ئەو کەسانە چۆنیان بۆ بلوێ لە خراپە و لە ئاژاوە بـڵاوی ئەکەنەوە و ماری ژێری‌کان هەندێ لە موسـڵمانان ئـەو کاتـە لەمەکـەدا بـوون لای بـت پەرستەکان دائەنیشتن ئەوانیش ووتەی ناڕەوایان بەکار ئەهێنا لە دژی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ و لـە دژی قورئان، لەو کاتەدا موسڵمانان لاواز بوون و نەیان ئەتوانی ووڵامیان بدنەوە، بۆ ئـەو ڕووداوە خوای مەزن ئایەتی (٦٨)ی سورەتی ئەلئەنفالی ناردە خـوارەوەو فـەرمانی پێـدان لای بت پەرستان دانەنیشن و وازیان لێ بهێنن و گوێ لە گفتوگۆیان نەگرن، ساڵ هات و ڕۆیشت و موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لە مەدینەدا جولەکـەو دووڕووانـی زۆری تێدا بوو دەرونیان پیس و خراپ بوو، موسڵمانان وەك فەرمانەکانی خوایان لە بیرنـەمابێ، ئەچونە لای کۆڕی ئەوبێ باوەڕانە لە مەدینەدا، ئەوانیش دەستیان ئەکرد بە خراپـەو ووتـن بە ئایینی ئیسلام و پێغەمەر بە درۆو بە بوختان وەك ئەوانەی مەکە، بێگومـان بـێ بـاوەڕان هەموویان یەك ڕەگەزن، خوای مەزن ئایەتەکەی سورەتی ئەلئەنفالی بیر خستنەوەو فەرموی:

وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ۚ فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾

﴿ وَلَقَدْ نَزَلَ عَلَيْكُمْ في الْكِتابِ أنْ إذا سَمِعتُم أياتِ الله يُكْفَرُ بـها وَيَستهزء بِـها ﴾ وە بەڕاستی خوا ڕەوانەی کردوە بۆسەر ئێوە لــە نامـەی خۆیـا کـە قورئانـە کـە هـەر کاتـێ بیستبوتان ئایەتەکانی خوا بڕوایان پێ ناهێنرێ لەلایەن بت پەرستانەوەو، گاڵتە ئـەکرێ بـەو ئایەتانە.

﴿ فَلا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتى ایَخُوضُوا في حَدِيثٍ غَيْرِهِ ﴾ دوایی ئێوە لەگـەڵ ئـەو کەسـانە دامەنیشن دەست ئەکەن بە گاڵتەکردن بە ئایەتەکانی خوا هەتا ئەوان ئەچنە نێـو گفتوگـۆی تر جگەی باوەڕ پێ نەکردن و گاڵتەکردن بە ئایەتەکانی قورئان.

﴿ إنَّكُمْ إذا مثلُهُمْ ﴾ بە ڕاستی ئێوەی دانیشتوی لای گاڵتە کراوەکان بە ئایەتی خـوا وێنەی ئەوانن لە بێ باوەڕیدا ئەگەر بە کارەکانیان ڕازی بن، چونکـە خـۆ ئەگـەر توانـای ئەوەتان هەیە لایان دانەنیشن وازیان لێ بهێنن و لۆمەیان بکـەن، پێویستە ئێـوە بزانـن ئـەو کەسانە لای مالوم و جولەکەکان دائەنیشن و دەست ئەکـەن بـە گفتوگـۆی خـراپ وەك دوو ڕووەکان ئەژمێررێن، ئێوە چۆن و بۆچی لایان دائەنیشـن و گوێیـان لێ ئـەگرن، ئـەو کەسانە جگە لە خراپە هیچ شتێ تریان لێ ناوەشێتەوە.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایتە هەر شتێ بێ و لەگەڵ هەر کەسانێ بـێ، بێگومـان بـە گشتی بەڵگەیە لەسەر ئەمە: پێویستە هەموو موسڵمانان واز لە تێکـەڵاویی هـەموو کـاری پوچ و دژی ئایین بهێنن، ئەو پێویستە بونەیش بە تایبەتی بـۆ ئـەو کەسـانە نییـە دانیشـتویی مەدینە بوون و ئەو کەسانەی ئەوتۆ ناگرێتەوە ڕووی ئـەو ئایەتـەیان بـۆ لاکـراون. بـەڵکو هەموو موسڵمانان ئەگرێتەوە لە هـەموو کـات و جێگەیـەکدا، پێویسـتی هەموومانـە لای کۆڕوکۆمەڵێ دانەنیشین گاڵتە بـە ئـایین بکـەن و گفتوگـۆی خـراپ بگرنـە ئـایین، وەك زۆرجاران باوەڕداران توشیان ئەبێ بەو کارانەوە.

﴿ إنَّ اللهَ جامِعُ الْمُنافِقينَ وَالْكافِرينَ في جَهَنَمَ جَميعاً ﴾ بەڕاستی خـوا کۆئەکاتـەوە دوو ڕوەکان و بێ بـاوەڕان لـەنێو دۆزەخـدا هـەردولایان بەیەکـەوە. کەواتـە دانیشـتوان و لا دانیشتوان هەردوولایان لە دۆزەخدان لە دوو ڕووەکان و لەبێباوەڕان.

﴿ الذيْنَ يَترَبَصُونَ بِكُمْ فَإن كانَ لَكُمْ فَتحٌ مِنَ اللهِ قالُوا أَلَـمْ نَكُـنْ مَعَكُـمْ ﴾ کەسـانێکی ئەوتۆن چاوەڕوان ئەکەن کارێ بۆ ئێوە پەیدا ببێ لەسـەرکەوتن لـە شـکان لـە جـەنگدا، دوایی ئەگەر بۆ ئێوە پەیدا بوو سەرکەوتن وەدەست کەوت و یاریدان لەلایەن خواوە دوو ڕووەکان ئەیان ووت: ئایا ئێمە لەگەڵ ئێوەدا نەبوون و یارمەتیمان نـەدان؟ کەواتـە بەشـی خۆمانمان بدەنێ لە دەست کەوت.

﴿ وإنْ كانَ لِلْكافِرينَ نَصِبٌ قالُوا أَلَـمْ نَسْـتَحُوذ عَلَيْكُـمْ ﴾ وەئەگـەر بـۆ بـێ بـاوەڕان هەبوایە بەشێ لە سەرکەوتن دوو ڕوەکان ئەیان ووت: ئایا ئێمە زاڵ نەبوین بەسەر ئێـوەداو

نەمان ئەتوانی بتان کوژین، کەچی ئێمە لەبەر سودی ئێـوە خۆمـان هەشارداوە خۆمانمـان گرت و ئێوەمان نەکوشت و جەنگمان لەگەڵ ئێوەدا نەکرد.

﴿ وَنَمْنَعْكُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە ئێمە ئێوەمان نەپاراسـت لـە بـاوەڕدان و شـتێکی وامـان خستە دڵیان لاوازیان بکاو سستیمان کـرد لـە یارمـەتی دانیـان. کەواتـە بمـان کـەن بـە هاوبەشی خۆتان لەوانەی دەستتان کەوتوە. ئەو دووڕووانە خۆیانیان کردبـوو بـە تـابوری پێنجەم بۆ باوەڕداران، ئەچونە دەرەوە لەگەڵ موسڵمانان بە ڕواڵەت بۆ یارمەتی دانیان، لە ناوەڕۆکا بۆ پارچە پارچەکردنیان بەهۆی پروپاگەندەیی ژەهراویی،وێنەی ئـەو کەسـانە لـە هەموو کاتێکا هەن، بە تایبەتی لەم ڕۆژەی ئێمەدا لەو کاتەوە نوتی نەفرەتی دۆزراوەتـەوە، ئەو کەسانە ئالاو درۆشمـی نیشـتمان پـەروەریان بـۆ خۆیـان هـەڵداوە دەق بـە دەقـی بـێ باوەڕانن، ئەگەر خەبات کەران سەرکەوتن بەسـەر دوژمنـانی گەلاندابـە گورجـی خۆیـان ئەکەن بەناو خەبات کەراندا و ئەڵێن: ئێمە لەگەڵتان بووین و لەژێرەوە یارمـەتیمان داون، ئەگەر خوێن مژان سەرکەوتن بەسەر شۆڕشگێڕاندا ئەڵێن: ئێمە نەمان هێشت سەر بکەون. ئەو کەسانە لەسەر دوو پەت یاری ئەکەن و خۆیان ئەکەن بە ستونی پێنجـەم، هـەردولایان فریو ئەدەن.

پرسیار / ئەبێ بۆچی ڕستەی (فَتْحٌ مِنَ اللهِ) بەکارهێنراوە بۆ موسڵمان و ووشە (نصيب) بۆ بێ باوەڕان بێژراوە.؟

وەڵام / بەڕاستی سەرکەوتنی موسڵمانان سەرکەوتنە بۆ ڕاسـتییکی ئـەوتۆ بەردەوامـەو پایەدارن بەمەرجێ خاوەنکەی پەیڕەوبن بۆ یاسای خواو بۆ فەرمانی ئـەو لـە ئامـادەکردنی تفاق و چەك، کەواتە شایستە بێژێ (مِنَ اللهِ). بەڵام سەرکەوتنی کاری پوچ شتێکی کـاتیەو ناوەستێ لەبەردەم ڕاستیدا هەرکاتێ خاوەن ڕاستیەکان یەك بگرن لەسەر خەبات.

بە ئومێدی خوای مەزن هێزی بێ بـاوەڕان و دووڕوان لـەم ڕۆژەدا بـە وێنـەی هـێزی ئەوانەی پێشوو ئەبێ و کاتی ئەبێ، هێزی ڕاستی لە خوای مەزنەوە ئەبێ و بەردەوامە هـەتا کۆتایی جیهان و خراپەکار نەمێنێ.

﴿ فَاللهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ القِيامَةِ ﴾ دوایی خوا فەرمانی خۆیی دیاری ئەکا لـەنێو ئێـوەی باوەڕدارو لە نێوان دوو ڕوواندا لە ڕۆژ هەڵسانەوەتان لە گۆڕەکاندا: تـاقمی بـاوەڕداران بۆ بەهەشت و دوو ڕوەکان بۆ دۆزەخ.

﴿ وَلَنْ يَجْعَلَ اللهُ لِلْكافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً ﴾ وەخـوا هـەرگیز نـایگێڕێ بـۆ بـێ باوەڕان بەسەر باوەڕدارانا هیچ ڕێگەیە لـە ڕۆژ دووایـدا کـە بـێ بـاوەڕان خۆیـانی پێـوە هەڵکێشن، یاسا ئیسلام هەتا ڕۆژی دوایی خۆی دەرئەخاو ناویی وون نابێ بە تـەواوی بـا جار بە جارێ لاوازبێ لە لایێکەوە، لەلایە ترەوە سەر هەڵئەدا بە ڕونترو بەهێزتر:

خوای مەزن باسی دووڕوەکانی بۆ کۆدین لەو ئایەتانەی پێشودا، لەمەو دووایش باسـی کردەوە خراپی ئەوانمان بۆ ئەکا بە درێژی ترو ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾

﴿ إنَّ الْمُنافِقِينَ يُخادِعُونَ اللهَ ﴾ بەڕاستی دووڕوەکان وایان بردووەتە دڵی خۆیـان فێـڵ لە خوا بکەن بە ئاشکراکردنی باوەڕهێنانیان بە پێغەمەر﴿ ﷺ﴾ بە ڕوواڵەت و لـەژێرەوەبێ باوەڕن، فێل کردن لە پێغەمەر فێڵ کردنە لە خوا.

﴿ وَهُوَ خادِعُـهُمْ ﴾ وە خـوا سـزای ئـەو دوورِوانـە ئەداتـەوە لەسـەر فێـڵ كـردن و دوورِوویان ئابرِویان ئەبا بە ئاشكراكردنی فێڵەكانیان لەم رِۆژەداو بە سزادانیان لــە رِۆژی دواییدا، رِوناكی برِوای باوەرِداران پەرە ئەسێنێ و تاریكی بێ بـاوەرِی زۆرتـر ئـەبێ، ئـەو رِوناكیە كەمەیان ئەكوژێتەوە بە سزای گرانی ئەمرِۆ.

﴿ وَإذا قامُوا إلى الصَّـلاةِ قـامُوا كُسـالى ﴾ وەهـەر كاتـێ دوورِوان هەڵسـانایە بـۆلای نوێژكردن هەڵئەسان بە تەمەڵی و بە لەشی قورسـەوە، وەك كەسـێ بچـێ بـۆلای شتێ و كەچی لای ناخۆشە. بێگومان مرۆڤی دوورِوو بە گورجی هەڵناسێ بۆ نوێژكـردن چونكـە برِوای بە نوێژ نیە هـەركاتێ هاورِێكـانی پێغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ ئاگاداربونایـە نوێژیـان ئـەكرد، ئەگینا نوێژیان نەئەكرد.

پرسیار / هەركاتێ كەسێ نوێـژی ئـەكرد بـە نیـازی نزیكبوونـەوە لـە خـوا، لەگـەڵ ئەوەیشدا پێی خۆشبوو كە دانیشتوان چاویان لەو نوێژەی ئەوبێ هەتا گومانی پیاو چـاكی بن بۆی یا بۆ ئەوە لەسەر خۆی لابا سستی كردن لە ئاییندا، ئایا ئـەو كـارە بـە دوورِوی دائەنرێ؟

وەڵام / ئەو كارە بە دوورِوی دانانرێ بە مەرجێ یەكەمین هۆی ئەو كارە بەجێی هێنانی پەرستنی خواو رەزایێتی خوابێ و نیازەكانی تری پاشكۆی ئەو پەرسـتنەو پـێ ناخۆشـبوونی رِووت زییان نادا لە باوەرِی ئەو كەسە، چ كەسێكە ئـەو جـۆرە نیازانـەی تێـدا نـەبێ بـە گوێرەی سروشت؟ ئەو كەسە بە گوێرەی نییازی خۆی بەر پرسیارە.

﴿ يُراؤُنَ النّاسَ وَلا يَذْكُرُنَ اللهَ إلاّ قَلِيلاً ﴾ وە ئـەو دوورِوانـە خۆیـان ئـەنوێننو خۆیـان نیشان ئەدەن بە ئادەمیزاد بە نوێژ كردنیان هەتا پێیان ببێژرێ: بـاوەرِدارن، چونكـە ئـەوان نوێژ بۆ خوا ناكەن. بەڵكو بۆ نێچیر گرتن و قازانج و سـوودی جیـهانی نوێـژ ئەكـەن و، ناوی خوا نابەن و یادی خوا ناكەن و نوێژ ناكەن مەگەر كەمجار لەو كاتانەدا ببینرێن. بەڵام لە پاش ملەناویی خوا نابەن و نوێژ ناكەن.

پرسیار / ئایا هیچ كەسێ هەیە رِاستی دەرونی خۆی دەرنجا لەبەردەم ئادەمیزاداو بەوانی بڵێ: شتێ برِوای پێی هەیە، چ كەسێكە بە هەموو كەسـێ بڵـێ: شـتێ ئـەیزانێ. بێگومـان ئەگەر ئەو كەسە ئەو شتانە بەوان بڵێ بەشێت ئـەژمێردرێ، چ كەسـێكە نـەیكاو بـەكاری

نەبەری جگەی شتێ لای چاکەو مەبەستییەتی چەند کات، پاش ئەو شتانە چۆن ئەگونجێ بۆ مرۆڤ لەدەست دام و دەزگای کۆمەڵ دەربچێ و ڕابکا؟

ئایا تۆ ئەتوانی کاتێ گەیشتی بە کەسێ خۆشت ناوێ و یەکەم جار ئەو کەسە بڵێ بەتۆ: من ئارەزۆمەندی تۆم، لە وولامدا تۆ ئەتوانی بلێی: من پێم ناخۆشە تۆ ببینم، ئایا ئەگەر بەو جۆرە وەلامی بدرێتەوە تۆ چاکت کردووە لەلای خۆت و لای ئادەمیزاد. ئایا هەموو ئادەمیزاد ڕیابازن و لایانداوە لە ڕاستی، چونکە بڕوایان بە هەموو شتێ نیە کە ئەیکەن نەی لێێن؟

وەلام / دووڕووی و خۆسازاندن جیاوازن لە یەکتری، دووڕی ئەمەیە مرۆڤ خۆی دەربخا بە پیاو چاکی و بە دوو ڕووی و بە بوختان بۆ ئەوە بوەستێ لەگەڵ پیاو چاکان و لەوانیش نەبێ، خۆسازاندن ئەمەیە: تۆ نەرم و نیانبێ لە مامەڵە کردنتا لەگەڵ ئادەمیزاداو بە هیچ مەبەسێ نەبێ مەگەر بە خۆشی و بە ڕێك و پێکی بژیت لەگەڵیان.

زۆر ئاشکرایە کە تۆ زۆر جاران لەبەر دوواکەوتنی لاسایی کردنەوەی کۆمەلایەتی لە شایی و شیوەنی کەسێکا ئەبێ بەرە مێدەبێ ئەکەنی و ڕێزی ئەگیریی و بڕوایشی بەوانەی خۆی نیە، بێ گومان ئەو کارەی تۆ زۆر چاکەو بێ گەردەو بەڕیا دانانرێ بە مەرجێ ڕێکبێ لەگەڵ نەریتی کۆمەلایەتی. پێویست نیە لەسەر تۆ هەرکاتێ خراپەت کرد بلاوی بکەیتەوە بەسەر ئادەمیزاد.

زۆر ڕاستە کەتۆ درۆئەکەی بەرانبەر کەسێ خۆشت ناوێ ئەڵێ: من ئارەزۆمەندی تۆم. بەلام ئەو درۆیەت چاکەو شیرینی ڕەوشتی تێدایە و زۆر پەسەندە.

بۆ پەسەندی ئەو درۆیە تەمشای ئایەتی (٨٣) ئەلبەقەرە بکە لەگەڵ ئایەتی (٢٤)ی سورەتی ئیبراهیم و ئایەتی (٤٤) سورەتی تاهادا. پێغەمەر فەرموی: (گفتوگۆی پاك چاکەیە کە پاداشتی ئەدرێتەوە بە وێنەی پاداشتی چاکەکانی تر).

بە کورتی دووڕووی خۆ نواندن بریتین لەوەخۆت نیشانی دانیشتوان بدەی بە درۆو بوختان بەشتێ تێتانەبێ. هەتا بە پیاو چاکت دابنێن و پلەو پایەی چاکت بۆ دابنێن، لە

ناوەڕۆکدا هەمانەی خاڵی و ماری ژێری کاو خوێن مژو دەست بڕیێ، ئەو جۆرە کارانە قەدەغە کراون لەلایەن خوای کەورەوە.

﴿ مُذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَلِكَ لا إِلَى هَؤُلاءِ وَلا إِلَى هَؤُلاءِ ﴾ سەرگەردان و حۆل و گێجن لەناو باوەڕو بێ باوەڕایدا، نەخۆیان ئەبەستن بە باوەڕدارانەوە و نە نەبێ باوەڕانەوە جارێ خۆیان دەرئەخەن لەناو موسڵمانانادا، جارێ لەگەڵ بێ باوەڕانن، لەگەڵ هیچیان نین.

بەڵکو لەگەڵ سودی تایبەتی خۆیانن و، نەلەم لان و نەلەولان هەتا ڕێگەی ئەوان بگرن، هەر دەستێ ڕاکشێ بۆلایان ئەی گرن، ئیتر پیس بێ یا پاك.

﴿ وَمَنْ يُضْلِلِ اللهُ فَلَنْ تَجِدَلَهُ سَبِيلاً ﴾ وە هەر کەسێ خوا ڕێگەی لێ وون بکاو واز لە ڕێگەی ڕاست بهێنێ، دوایی تۆ دەستت ناکەوێ بۆ ئەو کەسە ڕێگەیە بیانبا بۆلای ڕاستی و ڕاغویی و خوا پەرستی. بەڕاستی ئەوە کەسە خوا بە چاویی میهرەبانی تەمەشای ناکاو کارو فرمانی داوەتە دەست خۆی، چونکە ئەو کەسە یاخی بوە لە خواو هەگیز ناگەڕێتەوە بۆلای شارەزایی، چوەتە قوڵایی بێ باوەڕی. بەڵام میهرەبانی جۆرێکە لەگەڵ بەندەکانی خۆی وازیان لێ ناهێنێ هەتا ئەوان واز لە خوا نەهێنن، ئەو کاتە دەینێ خۆیان بە ملی خۆیانە. بۆ نمونە دایکی مناڵ میهرەبان ترین کەسانە لەسەر زەویی بۆ مناڵی خۆی، ئەگەر ئەو منداڵە دەستی کرد بە ئازاردانی دایکی، ئەو دایکە یەخەی لێ دادەدڕێ ، مەگەر ئەو بەندانە پەشیمان ببنەوە بە پوختەیی لەگوناهی خۆیان، ئەو کاتە خوای مەزن پەشیمان بونەوەیان لێ وەرئەگیری، لە باسی مانای ئایەتی (٨٨)ی ئەم سورەتە ئەو باسە بە درێژی نوسراوە.

لەو ئایەتە پیرۆزەدا خوای مەزن باسی دووڕووان و سەرگەردانەکانی ئەم ڕۆژەی جیهانی بۆ کردین کە ئایینی پاکی ئیسلام بە چاکی نەچەسپاوە لە دلیانا بە جۆرێ شایستەبێ و بیکەن بە یاسا بۆخۆیان لە هەموو کارێکی ڕۆژانەیاندا، ئەو کەسانەلەبەر ئەوەی بیر لە پاشە ڕۆژی بەختیاری خۆیان ناکەنەوە بۆ بچوکترین و بێ نرخترین ئاواتی کاتی هەر جارێ پەلاماری لایە ئەدەن بێ ئەوەی بیر لە چاکەو لە خراپە بکەنەوە، جا بۆیە

ئەو جۆرە کەسانە بەڕاڕاو سەرگەردان و گێل و گەوج دانەنرێن لای زانایان و خواپەرستان، چونکە بۆ بەدەست هێنانی ئاواتی پڕوپوچی خۆیان بە سەرگەردانیو گێلی جارێ پەلاماری جادوگەران و دەست بڕان و خوا نەناسانن ئەدەن جارێ تر پاش ماوەیە پەلاماری کەسانی تر ئەدەن کە دژی بیروباوەڕە پێشوەکەیەتی هەر بۆ ئەوە ئاواتە خراپەکەی خۆیان بێتەدیی یانەیەتەدیی، ئەو جۆرە کەسانە لەم سەردەمەی ئێمەدا یەکجار زۆرن، بەگێل و بێ ئەقڵی خۆیان سەر لێی شێوانەی خۆیان تووشی دەیان دەردی سەری ئەبن و ئەمانەی خوارەوە هەندێ نمونەیانن:

پێشەکی وەك ئەزانرێ لە هەموو کۆمەڵ و تاقمێکی ئادەمیزادا زوربەی زۆریان گێل و ڕاڕاو نەفامن هەرچەندە لەم کاتەدا ئەژین بە ڕووالەت پێش کەوتن پەرەی سەندوە لە چەند ڕوێکەوە، سەرگەردان و گێل و نەفامن هەرچەندە جیاوازن لە ڕوی پەروەردەو ڕۆشن بیری و ئامادەبونیان بە گوێرەی سروشت بۆ وەرگرتنی زانیاری کەچی ئەو گێلی و سەرگەردانیە وای لێ کردوون گاڵتەبەژییان و ئەقڵی ئەندامانی گەلانی ئەم سەردەمە ئەکەن، تەوەرێکی یەکجار نارەئەبینن، تەماشا بکەن بۆ تەمێ وەرگرتن چۆن ڕاڕای و گێلی سوار سەرشانی لاوان بووە بەدەیان پەخشان و هۆنراوەی زۆر بە بالای ژنێکا هەڵئەدەن و باسی لەنجەو لاری و شۆخ و شەنگی ئەکەن بە ڕاست و بەدرۆ. خۆیانی بۆ ئەسوەتێنن و خۆیانی بۆ لاواز ئەکەن، بەجۆرێ هەر شتێ لەو ڕێگەوە تووشی ببێ بە چاکی ئەزانێ ژنانی بێ ئەقڵ و گێلیان بۆ ئەخەڵەتێ. بەهەر کولە مەرگێیە ببێ ئەبنە هاوسەری یەکتری، زۆری پێ ناچێ ئەبنە مارو دووپشك بۆ یەکتری.

هەروەها ژنی واهەیە خۆی شێت ئەکا بۆ کوڕە لاوێ، لەبەر خۆشەویستی ئەو لاوە واز لە باوك و دایك و خزم و کەس و کاری دڵسۆزانی خۆی ئەهێنێ، وایش ئەبێ ڕادوی ئەکەوێ و بڕوایشی وایە لەوانەیە بکوژرێ.، لەگەڵ ئەو هەموو مەترسیانەدا ئەبێتە هاوڕێی ئەو لاوە کەچی زۆری پێ ناچێ ئەبنە دۆزەخ و کورەی ئاگر بۆ یەکتری و لەیەك جوێ ئەبنەوە، بەو جۆرە باسکرا ژنی نەفام ئەکەوێتە داوی پیاوێ بێ بەڵێن، پیاویش

ئەکەوێتە داوی ژنی گێل و نەفامەوە، ئەو هەمووە کەندو کۆسپە توشیان ئەبێ بــەو بۆنــەوە بیر لە نەفامی پاشەڕۆژی خۆیان ناکۆڵنەوە بە جۆرێ یاسای پاکی ئیسلام فەرمانی پێــداون، لە ئەنجامدا توشی ئەو ڕاڕای و سەرگەردانیە ئەبن و نــاموس و ئــایینی خۆیــان لــە دەســت ئەدەن.

لەلایــەترەوە زۆر کــەس هــەن بــەهۆی مامەڵــەو کڕیــن و فرۆشــتن و بــەکرێی دانــــی خانووبەرەوە خۆیان گیرۆدەی ڕاڕای و سەرگەردانی ئەکەن، بەجۆرێ خۆیان لاتوو دامــاو ئەکەن بگرە خۆیشیان ئەدەن بە کوشت، بەدەیان پیاوانی فێڵ زان ئەکەن بە کار بەدەســت بۆ خۆیان و ئەبنە ساماندار لەسەر گێلی و نــەفامی ئەوانــەوە. ئەمانــەی خــوارەوە هــەندێ نمونەی ترن بۆ گێلی و ڕاڕای و سەر لێ شێوانی هەندێ نەفام:

لە هەمویان نارەواترو پەرەسەندتر بڵاوبوونەوەی ئەفســانەی پڕوپــوچ و نــاوبۆش: وەك نامەگرتنەوەی پڕ لە درۆو. ناو لــەپ خوێندنەوە. بڕوا بــوون بــە شــتی پڕوپــوچ. پیــاوێکی هەژاری گێل و نەفامی برسی و قوڵ بڕاو منداڵێکی زۆری ڕوتاڵی هەیــە بەهــەر کلۆڵیــەبێ هەندێپارەو پول پەیدا ئەکا کەچی لە بریتی ئەوە بیدا بە پێویستی خۆی و منداڵــەکانی ئــەیبا بۆسەر گۆڕی مردووان ئەی بەخشێتەوە، یا ئەیبا بۆ کەسێکی بەناو پــیرێکی ملقــەوێ. بــە ئەقڵی ناتەواوی خۆی خاوەن گۆڕەکە یا پیرەکەی لای خوا بۆی ئەپاڕێنەوە کــەچی کــاکی پیری و پارەبرانی سەر گۆڕ بەکاری ئەهێنن بۆ دروســت کردنــی کۆشــك و ماشــێن و بــۆ زێڕی ژنانیان و بۆ خواردنەوەی مەیی و قومــارکردنی کوڕەکانیــان، هــەندێ جــاریش بــۆ گەشــت و گــوزارو ســەیران و داوێــن پیســی ئــەو پیروپــارە خۆرانــە ئەگــەر پاڕانــەوەیان وەرئەگیرێ با بۆخۆیان بپاڕێنەوە سامانیان زۆربێ، پــارەی ئــەو هــەژارە دامــاوە نــەخۆن و ڕووڕەشی لای خوا نەبن.

نەخۆشێکی تری زۆرناڵــەبار ســواری ئــەقڵی کۆمــەڵێ تــری ســەر لێ شــێواوو ڕاڕای تربوون، ئەچنە لای جادوگەرو دەست بڕان پارەو پولی زۆریان بــۆ ئەبــەن بــۆ کردنــەوەی گرێی کۆیرەی دڵیان کە ناو لــەپیان بخوێننەوە یا نامەیان بۆ بگرنەوە. نوشتەیان بــۆ بنوســن.

تەماشای جم و جوڵی ئەستێرەکانیان بۆ بکەن، پرسێ بە جنۆکەکان بکەن. گیانی پیاوێ ئامادە بکەن، فنجانیان بۆ سورِ بدەن. دانەیان بۆ بگرنەوە. ئەو جادوگەرە دەست برِانە بە بۆنەی ئەو کارە پرِوپووچانەوە بە بوختان و بە درۆشتێ بەو گێل و گەوجانە ئەڵێن، ئەو سەر لێ شێواوە بەچاوی راستی وەری ئەگرن و بە داماویی ئەژین و جادوگەرانیش سامانی زۆر کۆ ئەکەنەوە.

ئەو هەزارە داماوە سەر لێ شێواوانە لەوەرِگای زۆر بە پیتن بۆ پیاوانی بەناو ئایینی و دەست برِان و کار بەدەستە فێڵ بازەکان، ئەو کەسانە بۆ موسڵمانان و دانیشتوان سەری زمانیان هەنگوینە و ژێری زمانیان ژەهرە، بەهۆی روی خۆشی ژەهراویان لەژێرەوە خوێنیان ئەمژن و لەدەرەوە بەوان پێ ئەکەنن وێنەی مارگران گاڵتە بە سەیران کەران ئەکەن.

هەر نەتەوەیە نەخوێنەوارو نەفام و لە ئایین دەرچوانیان زۆربێ، پیرانی بە ناو ئایین پەروەرو کاربەدەستانی ستەمکارو سەرۆك پارتەکان بە ناویی ئایین و کاربەدەستی و نیشتمان پەروەری سوواری ملیان ئەبن و ئەیان چەوسێتەوە، هەرچەندە ئەو گێل و گەوجانە تۆڵەی حۆیان وەرئەگرن لە پاشە رِۆژدا لەبەردەم خوای مەزندا. بەڵام لەوان گێل ترو خوانەناسترِ ئەو کەسانەن بە ناوی ئایین و نیشتمانەوە بۆ سوودی خۆیان ئەبن بە بازرگانی جەنگ، گەلانی خۆیان رِائەکێشن بۆلای جەنگی نارِەوا کە بەو جەنگە گەلانی خۆیان ئاوارەو دەربەدەر ئەکەن بە بیانوی درۆینەوە دانیشتوان ئەکوژن و بەندیان ئەکەن و داراییان تالآن ئەکن و خانوەکانیان ئەرِوخێنن و لە نیشتمانی خۆیان دەریان ئەکەن، ئەوانە هەموویان بە بۆنەی ناکۆکی پەیداکردنی نێوان دانیشتوانەوە سەرهەڵئەدەن، ئەوانە هەموویان بەرپا ئەبن بە ناوی ئایین و نیشتمان پەروەریەوە، هەر تاقمێ لە خوێن مژان برِۆن تاقمێ تری خراپترِ جێگەیان ئەگرنەوە، ئەو کەسانەی لە دەستی پێشوەکان رِزگاریان بووە ئەمانیش ئەمان لەناو ئەبەن.

ئەبێ بزانین ئەو هەموو دەردی سەرییەو ڕاڕایی و ستەمەی بەسەر دانیشتوانا دێت هۆی لادانیانە لە یاسای بەرزی پاکی ئیسلام، هەتا نەگەڕێنەوە بۆلای دابەزاندنی دەستوری قورئان ڕزگاری و سەربەستی و ژیری بە خۆیانەوە نابینن، ئەوەی بەسەریانا دێت لەم ڕۆژەدا زۆر کەمترە لە سزای پاشە ڕۆژ کە توشیان ئەبێ بە هۆی لادانیان لە پەرستنی خوای مەزن.

خوای گەورە باسی خراپی دووڕوانی بۆ کردین کە جارێ ڕووئەکەن بەلای موسڵمانانەوە جارێ تر ڕوو ئەکەن بۆلای بێ باوەڕان، ئۆقرە ناگرن لەسەر شتێ بە تەنها، ئێستایش قەدەغە ئەکا لە موسڵمانان کە ئەمانیش وێنەی ئەوان نەبن و ئەفەرموێ:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾

﴿ يا أَيُّها الذيْنَ آمَنُوا لا تَتَخِذُوُ الْكافِرِينَ أوْلِياءَ مِنْ دُونِ الْمُؤمِنِينْ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە وەرمەگرن و مەیکەن بە دۆستی خۆتان بێ باوەڕان لە جگەی باوەڕداران، دوای ئەو جولەکانە مەکەون و دوژمنی ئیسلامن.

﴿ أتُرِيدُونَ أنْ تَجْعَلُوا للهِ عَلَيْكُمْ سُلْطاناً مُبيناً ﴾ ئایا ئێوە کە بێ باوەڕان ئەکەن بە دۆستی خۆتان ئەتانەوێ کە بگێڕن بۆ خوا بەسەر خۆتانەوە بەڵگەیەێکی ڕون و ئاشکرا بۆ سزادانتان، چونکە دۆستایێتی بێ باوەڕان ڕاستەوخۆ بەڵگەیە لەسەر دووڕویتان، هەر کەسێ لەسەر بەڵگەی ئاشکر انەبێ بۆ پاکی ئایینی خۆی، یا لە ڕێگەی ڕانموییی لابدا دوای ڕون بونەوەی ڕاستی بەڵگەی ڕاستی لە خۆیەوە داناوە لەسەر زێیان و سزای خۆی.

﴿ إنّ الْمُنافِقِيْنَ فِي الدَرْكِ الأسْفَلِ مَنَ النّار وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيراً ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی دووڕون لەنێو بەشی قوڵایی دۆزەخدان لەلای خوارەوە، لەبەر ئەوەی خرابترین بێ باوەڕن خرابترین جێگەی دۆزەخ بەشیانە و سزایش بە گوێرەی تاوانە، بێگومان دووڕوویی و بێ باوەڕی لەیەك کاتدا لەواندا کۆبوەتەوەو، تۆ دەستت ناکەوێ بۆ ئەو دووڕوانە یارمەتێ دەرێ بەرهەڵستی بکا لە سزای ئەوان، ئەو کەسانە درۆزن و بێ باوەڕن و ئەو دووشتانە دایکی هەموو خراپەیەکن.

پاش ئەوەی خوای مەزن هەڕەشەی کرد لە دووڕووان و ترساندنی بەهۆی خراپترین تۆڵەو سزا، ڕانموێیان ئەکا بۆلای ڕێگەی پەشیمان بونەوەیان کە تاقە ڕێگەیە کە بۆ ڕزگاریان، هەر پەشیمان بونەوەیە بە تەنها یاریدەریانبێ لەلای خوای مەزن، ئەو ڕێگەیەش لە دەستی توانای خۆیانایە هەرکەسێ لە کیسی خۆی بدا لۆمەی لەسەر خوێتی، بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ إلاّ الذينَ تابوُا وَأصْلَحُوا ﴾ مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ لەو دوڕوانە پەشیمان، ببنەوە لە دوو ڕوویی خۆیان و، ئەو خراپانەی کردویانە بەسەریان بگرنەوەو کردەوەکانیان چاك بکەنەوە نیازی خۆیان بگۆڕن بەرەو چاکە و بەردەوامیشبن لە سەر کردەوەی چاك دوای پەشیمانی.

﴿ وأعْتَصِموا باللهِ وَأخلَصُوا دِيْنَهُمْ ﴾ وەبڕوایان بە خوا بەتینبێ و دەست بگرن بە ئاینی خۆیان بە نیازی پاکەوە، وە لە پەرستنی خۆیانا هەر خوایان مەبەستبێ و بە تـەمای بـەزەیی خوابن.

﴿ فَأوْلئِكَ مَعَ المُؤْمِنِينَ ﴾ دوایی ئەو کەسانە پەشـیمان بوونەتـەوە بـە نیـازی پاکـەوەو، دەستیان گرتوە بە نامەی خواوە، ئاینی خۆیانیان بە پاکی گرتوە لەگـەڵ باوەڕدارانـان لـە ئەمڕۆو لە پاشە ڕۆژدا بۆ هەموو پاداشتێ.

﴿ وَسَوْفَ يُؤْتِ اللهُ الْمُؤْمنينَ أجْراً عَظِيماً ﴾ وەلە دوایداو بەم نزیکانە خوا ئەبەخشێ بە باوەڕداران پاداشتێکی گەورەو زۆر بە جۆرێ نایەنە ژمارە. کەواتە ئەو کەسانەیش ئەبن بـە هاوبەشی باوەڕداران خاوەنی ئەو بەشە گەورەیەن و بەشی خۆیانیان ئەدرێتێ.

خوای مەزن لەو ئایەتەدا بۆمانی ڕون کردۆتەوە ئەو بەخششە گەورەیە خـوا ئـەیدا بـە باوەڕداران بە هۆی ترسیانەوەیە لە خـوا، دوای ئـەوە بـا ئێمـە بزانـین ئەگـەر ترسـان لـە دەروونی ئادەمیزادا چ پلەو پایەکی بۆ دانراوە لەلایەن ئایینەوە، خوای مەزن لەو ئایەتەداو لە زۆر جێگەی تری قورئان فەرمانی داوە بە ترسان بە گشتی و بە تایبەتی لە خوای مەزن، چونکە ترس گەورەترین چاکەو میهرەبانی و بەخشندەیی خوایە بەخشیوێتی بـە ئـادەمیزادو بونەوەرانی تری زینـدوو گیـان لەبـەر، هـەر یەکـەیان بـە گوێـرەی ئـەو هەسـتەی پێیـان بەخشراوە، هەموو شتێ کە خوا دروستی کردووە جێگەی شیاویی خۆی وەرگرتووە لـەو ترسەو بەشی خۆی پێداوە، خـوای مـەزن بـۆ سـوودی گیـانَ لەبـەران لەگـەڵ دروسـت کردنیاندا ترسی خستوەتە دڵیان. کەواتە ترس بەبێ سوود دروست نەکراوە، ترس بە هـەر چۆنێ بێ و بەهەر هۆیێ پەیدا ببێ ئەبێتە سەرچاوەی هەموو چاکەیە، ئەگـەر تـرس نەبوایـە ئادەمیزاد هیچ چاکەیەکی نەئەکردو لە هیچ خراپەیە خۆی نەئەگێڕایەوە، گییـان لەبـەرانی تریش خۆیانیان لەگیروگرفت نەئەگێڕایەوەو خۆیانیان بۆ نەئەپارێزرا.

ئەگەر لەبەر ترسی برسێتی نەبوایە هەوڵی سامان و پـەیداکردنی خواردەمـەنی نەئـەداو جێگەی حەسانەوەی بۆخۆی نەئەسازاند هەتا بەرگری. لە گەرماو لە سەرما بکەن. ئەگـەر

لەبەر ترسی نەخۆشی نەبوایە پەیڕەوی پایەی تەندروستی نەئەکرا، ئەگەر لە ترسی مردن نەبوایە هیچ کەسێ نەئەچوە لای پزیشك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی. ئەگەر لەبەر ترسی خواو سزای پاشە ڕۆژ نەبوایە هیچ کەسێ خوا پەرستی نەئەکرد، ئەگەر ترسی کوشتن نەبوایە هیچ کەسێ خۆی لە دەست درێژی دانیشتوان نەئەگێڕایەوە وزەوی پڕ ئەکرد لە خوێن، ئەگەر ترسی دەربەدەری نەبوایەی هیچ کەسێ بەرگری لە دوژمن نەئەکرد بۆ وولاّت و نیشتمانی خۆی و دەربەدەرئەبوو.

هەروەها گیاندارانی تر ئەگەر ترس نەبوایە خۆیان خۆینیان ئەخواردەوە، ئەگەر ترس نەبوایە دڕوندە نەئەسەڵمینەوە لە دوڕندەی تر، ئەگەر ترس نەبوا لە دەست دڕوندە ڕامان نەئەکرد.

هیچ کەسێ توشی خراپە نابێ ئەگەر بە ڕاستی ترسیان هەبێ، هیچ خراپەیە توشی من و تۆ نابێ ئەگەر بترسین، هەر لەبەر ترسە بیم لەگرانی و جەنگ ئەکەین. کەواتە ترس دۆستی من و تۆو هەموو گیاندارانە لە ترسی مامۆستاو ڕانوێی کەرو کەوتن لە وانەکانا کۆشش ئەکەین، ترسە خزمەت گوزاری نێوان من و تۆ، ترسە گەورە و سامناکی من و تۆ کە ئەمانپارێزێ لە خراپە، ترسە سوود ڕەسێن و خاوەنی دڵسۆزمان، ترسە خوامان پێ بناسێنێ، بەختیاری و پاشە ڕۆژی چاك بۆ ئەو کەسانەیە لە خوا ئەترسن. بەڵام ئەگەر لەبەر ترسی ستەمکاران گوناهوێ فەرمانی خوا بکەین بە تەنها هەر ئەوەشیان زیان بەخشن و خراپە ئەگینا هەموو شتێ چاکە.

خوای مەزن کە سزای دووڕوان و بێ باوەڕان ئەدا لەبەر ئەمە نیە ڕقی خۆی نەیەڵێ بە تۆڵە سەندنەوە لەوان وەك کۆنە دوژمنێ، یا خۆی لە زمانی ئەوان دورئەخاتەوە، یا بە تەمای سودی ئەوانبێ. بەڵکو خوای مەزن بۆ هەموو کەسێ خاوەن میهرەبانەو نیازی بە هیچ کەسێ و ڕقی لە هیچ کەس نیە، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو باسە خوا فەرموێ:

﴿ ما يَفْعَلُ اللهُ بَعْذابِكُمْ إنْ شَكَرْتُمْ ﴾ خوا چ شتێ ئەکا بە هۆی سزادانی ئێوە، پێویستی بە سزای ئێوە نیە ئەگەر ئێوە سوپاسی خوا بکەن و فەرموودەکانی بەجێ بهێنن لەبەر خواو ئەو چاکەی خوایە بەسەرتانەوەیە، سوپاسی خوا ئەبێتە هۆی باوەڕهێنانی ئێوە، بۆیە دوای سوپاس کردن ئەفەرموێ:

﴿ وآمنتم وَكانَ اللهُ شاكراً عَليماً ﴾ وەئێوە باوەڕتان هێنابێ بە خواو بە هەموو ئەو شتانەی خوا ڕەوانەی کردووە بۆ سەر پێغەمەر (د.خ) و خوا پاداشتی سوپاس گوزاران ئەداتەوە لەبەر سوپاس کردنیان، زانایە بە باوەڕهێنانتان و سوپاس کردنتان، خوا میهرەبانەو ناگونجێ پاداشتی ئێوە نەداتەوە.

خوای مەزن کە سزای بێ باوەڕان ئەدا لەبەر ئەوەیە بێ باوەڕی نەخۆشی خستوون و دەرونیانی پیس کردوە، خوا ڕانموییان ئەکا کە دەرمانی ئەو نەخۆشیە تیمارکردنە بە سوپاس کردن و باوەڕهێنانە هەتا ڕزگاریان ببێ لە سزای دۆزەخ، هەرکاتێ تیماری نەخۆشی خۆیان نەکەن خۆیان تاوانبارن و پێویستە تۆڵەی خۆیان وەرگرن بە ئاگری دۆزەخ بە بەردەوامی، ئەو کەسەی ئەیەوێ پاداشتی خۆی وەرگرێ و چاکەی لەگەڵ بکرێ پێویستە مل کەچی فەرمودی خوابێ.

**سوپاس بۆخوا مانای جزمی پێنچەم کۆتایی پێ هات**

**لە ٢١ مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی ساڵی ١٤١٩ی کۆچی بەرانبەر بە ١٩٩٩/١/٨ی زایینی**

**خوایە من بەندەی گوناهبارم، بێ نرخ و بێ هێزو پیرو کەنەفتەم**

**لەبەر گەورەی خۆت لێم ببورەو بەو پاڕانەوەیەی پێغەمەرم**

**بخە. خێزانەکانم یاریدە بفەرموو پاشە ڕۆژیان بەچاک بگێرە بۆ پەرستنی خۆت**

تەفسیری زمناکۆیی

# پێرست

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت:

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ | هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نیشتمان | نیشتمان و | ٣ | ١١ | لە ڕەگەزی | فروستادە بە لە ڕەگەزو | ٣٩ | ٧ |
| ئامێز | ئامێر | ٣ | ١٢ | خوا پیدان | خراپێدان | ٤١ | ٩ |
| سودو | سود | ٣ | ١٢ | زیندو یەبتان بەرزەجنە | زیندویەتیان بەرزەجنە | ٤٨ | ١٠ |
| سوزایش | سزایش | ٦ | ٩ | جهانیە | جیهان نیە | ٤٨ | ١٧ |
| ئەوە | نابێ بنوسرێ | ٧ | ١٥ | جیگە | بۆ جێگە | ٤٨ | ١٨ |
| شەهیدی | ئێمەیش | ٨ | ٧ | بۆ چاکەیان | چاکەیان | ٥٢ | ١ |
| و کاتی | وکاین | ١٦ | ٢١ | هەرووە | هەردوکمان | ٥٣ | ١ |
| ڕێزداران | ڕێزدارن | ١٧ | ٧ | شتێکە | چ شتێکە | ٥٥ | ١٩ |
| خاوەن | خاوەن و | ١٩ | ١ | غلی | نملی | ٥٦ | ١٠ |
| یاریدەر | یاریدەری | ١٩ | ١ | فعقلت | فصلت | ٥٧ | ١١ |
| الرغب | الرعب | ١٩ | ٨ | لە | لەبەر | ٥٨ | ٥ |
| بووبوە | بو بو | ٢٣ | ١١ | ئكرى | ئەگیرێ | ٥٨ | ٦ |
| الفم | الفم | ٢٤ | ٣ | مەزنن بنە | مەزن بە | ٥٨ | ١٠ |
| وئە | ئەو | ٢٤ | ١٦ | یاکەو | پاکەو | ٥٩ | ٦ |
| مصناجعهم | مضاجعهم | ٢٥ | ١٢ | دەرە وەریان | دەریان | ٦٠ | ٢ |
| ئەوانەن | ئەوانە نەئەمردن | ٢٨ | ٩ | لەسەتانە | لەسەرتانە | ٦٠ | ١٤ |
| ئەگەر خراپێ | ئەگەر خراپ بێ | ٢٩ | ١٢ | بككگا | بكا | ٦٠ | ٥ |
| خوا خراپە | خراپە بە پاداشتی | ٢٩ | ١٢ | أو تتبعوا | أو تتقوا | ٦١ | ٧ |
| لأن الله | إن الله | ٣١ | ١٤ | بما آتاهم | بماء آتاهم الله | ٦٢ | ٣ |
| خەسیرە | حەسیرە | ٣٣ | ١٨ | ئەگەری | ئەکرێ | ٦٢ | ٧ |
| بینە | پینە | ٣٣ | ١٩ | أخرج | زحزح | ٦٩ | ٥ |
| وینەی | وێنەی | ٣٤ | ١٧ | ئەمیشی | ئەمیش ببیسێ | ٧٠ | ٣ |
| داریەکەی | داراییەکەی | ٣٥ | ٦ | لتبنە | لتتبنە | ٧٠ | ١٩ |
| أن یفل | أن یفلّ | ٣٧ | ٦ | خربی | جگەی خۆی | ٧٣ | ٦ |
| نەبێتەوە | ببێتەوە | ٧٣ | ١٩ | با بوکی | باوکی | ١٣٦ | ٧ |
| واالله | والله | ٧٤ | ١٠ | کردنی ۆ | کردنی | ١٣٧ | ٤ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| سەقاما | سەڤان | ٧٥ | ٢ |
| یذکوون | یذکرون | ٧٨ | ٥ |
| ئاماژە | ئاماژەیە | ٧٨ | ١٠ |
| ڕاکێشێ | ڕاکشێ | ٧٨ | ١٣ |
| بدنەوە | مانایە بکەن | ٧٨ | ٢١ |
| فتی | فتنا | ٧٩ | ١ |
| هوکاری | هۆکانی | ٧٩ | ٩ |
| دەستیان | دەستیان | ٧٩ | ٢١ |
| أتنا | انتا | ٨٠ | ١ |
| بەندیەتی | بەندایەتی | ٨٠ | ٦ |
| وقلتوا | وقاتلوا | ٨١ | ١٤ |
| بەستن | پەرستن | ٨١ | ٢٢ |
| کەسانمە | کەسانە | ٨٦ | ٥ |
| ألئك | أولئك | ٨٧ | ١٥ |
| ئێمە | ئێوە | ٨٨ | ٤ |
| لەلە | لە | ٩٤ | ١١ |
| دانانرێن | دائەنرێن | ٩٤ | ٢١ |
| پەروەردە | پەردە | ٩٧ | ٨ |
| پوبەی | پۆپەی | ١٠١ | ٢١ |
| دوایش | وایش | ١٠٥ | ٢١ |
| خواستی | خواستنی | ١٠٧ | ١٦ |
| یەر | بەر | ١٠٩ | ١٧ |
| ممە | مە | ١١٣ | ١٨ |
| کراوە | نەکراوە | ١٠٣ | ٢٢ |
| قەرز | فەرز | ١٣١ | ٢ |
| دەچونی | دەرچوونی | ١٣٤ | ٢١ |
| جولەکان و | جولەکان | ٢٠٦ | ١٠ |
| شتانەبێ | شتانە نەبێ | ٢٠٨ | ١٢ |
| بەوناو | بەو ناوەوە | ٢٠٨ | ١٧ |
| لەنێو | لەنێو ئەو | ٢٠٩ | ٥ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| وەك | وەك یەك | ١٤٢ | ٤ |
| بفاحشءةِ | بفاحشە مبیغة | ١٤٨ | ١٢ |
| لەگەڵبان | لەگەڵیان | ١٤٩ | ٢ |
| وسا | وساء | ١٥٢ | ٧ |
| خاوەنی | بە خاوەنی | ١٥٧ | ١ |
| الشفاو | الشغار | ١٥٨ | ٩ |
| ماە | ماڵە | ١٥٩ | ١٣ |
| مفینە | مغنیە | ١٦١ | ٢٠ |
| بە گۆبەی | بە گوێرەی | ١٦٩ | ٦ |
| دوا ڕۆژ | دواڕۆژدا | ١٧٣ | ٣ |
| مانگەی | ماناکەی | ١٧٤ | ١٣ |
| ئەو | ئەوە | ١٨٠ | ١٩ |
| یایاکێ | یابەکێ | ١٩١ | ١ |
| ڕێز | ریز | ١٩٣ | ٤ |
| پێغەمەرو | پێغەمەر | ١٩٦ | ٦ |
| ویقلون | ویقولون | ١٩٦ | ١٧ |
| لە پەرستی | لە پەرستندا | ٢٠٠ | ٤ |
| فتز | فقد | ٢٠٠ | ١٣ |
| ئاسمان | ئاسمان و | ٢٠٠ | ١٦ |
| توانای | بێ توانا | ٢٠١ | ٣ |
| فیها | فیهما | ٢٠١ | ٥ |
| با | یا | ٢٠١ | |
| گانا | گاکانا | ٢٠١ | ١٤ |
| ئەومان | ئەوە | ٢٠١ | ١٥ |
| بوحتان | بوختان | ٢٠٤ | ٢٢ |
| إلا | لا | ٢٠٥ | ١٣ |
| گەواتە | کەواتە | ٢٣٨ | ١٨ |
| بعەمەرەو | پێغەمەرە | ٢٣٨ | ١٩ |
| بورو | بورد | ٢٤٦ | ١٣ |
| لەپەزادو | لەپەزارەو | ٢٤٦ | ١٧ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| ضليلا | ظليلا | ٢٠٩ | ١٠ |
| باخانەكانی | باخەكانی | ٢٠٩ | ١١ |
| يعضكم | يعظكم | ٢١٢ | ٨ |
| ڕولێكەو | ڕويەكەوە | ٢١٣ | ٢ |
| كەسی | كەسێ | ٢١٥ | ٧ |
| معيه | مصيبه | ٢٠٨ | ١٤ |
| الحكموك | يحكموك | ٢٢٢ | ١٢ |
| اردنا | آنّا | ٢٢٣ | ٩ |
| خۆمان | خۆتان | ٢٢٣ | ١٠ |
| أو أخروا | أو أخرجوا | ٢٢٣ | ١٢ |
| لەخشان | لە لەخشان | ٢٢٣ | ٢٢ |
| إلا | لأ | ٢٢٤ | ١ |
| پله | لە پلەو | ٢٢٤ | ١٤ |
| بەخيباری | بەختياری | ٢٢٥ | ١٠ |
| دەبڕی | دەربڕی | ٢٢٩ | ١ |
| شورەيك | شورەبك | ٢٣٢ | ٥ |
| پاڕانه | پاڕانەوە | ٢٣٢ | ١٣ |
| وابت | وبت ...... | ٢٣٥ | ١٢ |
| بوور | بون | ٢٣٥ | ٢٠ |
| قتيلا | فتيلا | ٢٣٦ | ٣ |
| تعبهم | تصبهم | ٢٣٧ | ٩ |
| بەلانەو | بەلايانەوە | ٢٣٧ | ١٥ |
| يانێ | يانبێ | ٢٣٧ | ١٦ |
| ڕداوی | ڕوداوی | ٢٣٨ | ١٧ |
| كاروانی | كاروانی و | ٢٨٤ | ٨ |
| خراپە | خراپەو | ٢٩٠ | ٩ |
| ئەدرد | ئەدا | ٢٩١ | ١٧ |
| ويتفر | ويغفر | ٢٩٩ | ١٤ |
| واگومان | گومان | ٣٠١ | ٢ |
| بە | بەو | ٣٠٢ | ٥ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێڕ |
|---|---|---|---|
| خوايە | خراپەيە | ٢٤٧ | ٢ |
| ئازابی | ئازاری | ٢٤٧ | ١٩ |
| تكن | يكن | ٢٤٨ | ١٥ |
| بەو | بە | ٢٤٩ | ١٧ |
| احمة الله | رحمة الله | ٢٥٠ | ٢ |
| حسيا | هيبا | ٢٥١ | ٩ |
| ڕوداوانەی | دووڕوانەی | ٢٥٤ | ٨ |
| دەست بدانە | دەست بدانە | ٢٥٥ | ٥ |
| كرچبان | كۆچيان | ٢٥٥ | ١٤ |
| تێنەڕيوە | تێپەڕيوە | ٢٦١ | ١٩ |
| خوێندن | خوێن | ٢٦٢ | ٤ |
| ڕۆژ | ڕۆژو | ٢٦٤ | ١٥ |
| نەبورن | نەبوردن | ٢٦٥ | ١٩ |
| پێچ | پێنج | ٢٦٦ | ١٨ |
| عضيما | عظيما | ٢٧٢ | ١٧ |
| فيما | فيم | ٢٧٤ | ١٠ |
| بكێچش | بكێشی | ٢٧٧ | ٤ |
| ئورو | ئوورو | ٢٨٠ | ٧ |
| ئەنتصرو | تقصروا | ٢٨٢ | ١ |
| يفقنكم | يفتنكم | ٢٨٢ | ٥ |
| طائفة منهم | فلتعم طائفة | ٢٨٢ | ١٤ |
| تفقلون | تفضلون | ٢٣٨ | ٣ |
| والذين | ود الذين | ٢٨٣ | ٣ |
| پشتوتاندا | ئشوتاندا | ٢٨٣ | ٢١ |
| ڕژوی | ڕژدی | ٣١٤ | ١٥ |
| پياو ژن | پياوو ژن | ٣١٥ | ١ |
| كالمتلغة | كالمفلقة | ٣١٥ | ١٩ |
| كروتانە | كردوتانە | ٣١٦ | ٦ |
| ما يفن الله | يفن الله | ٣١٩ | ١ |
| بەركاری | بەكاری | ٣٢٣ | ١٤ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێر |
| --- | --- | --- | --- |
| ناخوێنلرێ | ناخوێنرێ | ٣٠٤ | ٢ |
| ئەمەن | تەمەن | ٣٠٤ | ١١ |
| فليفرين | فليفيرن | ٣٠٤ | ٢٢ |
| سورى | سودى | ٣٠٥ | ١٨ |
| ئەشيتان | شەيتان | ٣٠٦ | ١٣ |
| نەمە | نامە | ٣٠٧ | ١٥ |
| نبە | نيە | ٣٠٨ | ٨ |
| وأنثي | أو أنثي | ٣٠٨ | ١٧ |
| پێغەمەرو | پێغەمەر | ٣١٠ | ١٤ |
| لەمارەى | لەمارەى و | ٣١٢ | ١٢ |
| دائينان | دايان | ٣١٢ | ١٣ |
| هەمو | هەموە | ٣٤٠ | ١ |

| هەڵە | ڕاست | لا | دێر |
| --- | --- | --- | --- |
| خۆيان | خۆيان | ٣٣٩ | ١٤ |
| بۆ فيداكاريەوە | بەفيداكارێوە | ٣٣٤ | ١٨ |
| بكەوێ | بكا | ٣٢٨ | ٥ |
| انجد ضدا | يخوضوا | ٣٣٠ | ١٣ |
| نەبووون | نەبون | ٣٣١ | ٢٠ |
| نەبەرێ | نەبەرى | ٣٣٥ | ١ |
| بەرەمێدا | بەرەمێوە | ٣٣٥ | ١٣ |
| نەمستاى | تەماشاى | ٣٣٥ | ١٩ |
| ئەود | ئەو | ٣٣٦ | ١٠ |
| نارە | نارەوا | ٣٣٧ | ٣ |
| خۆيان | خۆيان | ٣٣٩ | ١٤ |
|  |  |  |  |